


رێڤەبەرێ گشتی و
سەرنڤیسەر

**مؤيد طيب**



کوردستانا عێراقێ - دهۆك
تاخێ مازی - جادا ئاشتی
ئاڤاهیێ سپیرێز

www.spirez.org
www.spirezpage.net

- **ژمارا وەشانێ: (٣٥٣)**
- **ناڤێ پەرتووکێ:** دیوانا مەلایێ جزیری
- **بەرهەڤکرنا:** تەحسین ئیبراهیم دۆسکی
- **دەرهینانا ناڤەرۆکی:** تەحسین ئیبراهیم دۆسکی
- **بەرگ:** نەجمەدین بیری
- **سەرپەرشتکارێ چاپێ:** شێروان ئەحمەد تەیب
- **چاپا:** دوێ
- **تیراژ: (١٠٠٠) دانە**
- **ژمارا سپاردنێ: ل پەرتوکخانەیا بەدرخانیان ل دهوك (٢٧١٦) ل سالا ٢٠١١**
- **چاپخانەیا: خانی / دهۆك**

SPIREZ PRESS & PUBLISHER
DUHOK

دار سبيريز للطباعة والنشر
دهوك

# دیوانا
# مەلایێ جزیری

بەرهەڤکرن و ڤەوژارتنا
تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

ئیسماعیل تاها شاهین
لێزڤڕییە و فەرهەنگۆك بۆ دانایيە

چاپا دوێ
یا ڤەوژارتی و زێدەکری

سپیرێز ٢٠١١



# بۆ
# مەلایێ جزیرێ

کاتب د ئەزەل دا ل قەلەم دا وە نڤیسی
ناڤێ تە نشانی ب نشانی بئەییسی
جاما مەیێ باقی ب تە ساقی بدەتن
دا هەر دەم و ئانی تو ب جانی ڤە بنیسی

بازی تو ل عەسمانێ حەقیقی و مەجازی
دورئینێ ئەڤینی ب شرینی تو چ ڕازی
گەهـ پەردەهلینی گەهێ سررێ د ڤەشێری
گاهەک چ طلسمی گەهەکێ چەنگی وسازی

ماهی تو ل سەر تەختێ ئەڤیندارییێ شاهی
دلبەندێ طەریقی ب حەقیقی ڕێ و ڕاهی
(وەک با د لەزینی تو کومەیدی د بەزینی)
عارف وە دبێن: ڕۆژی ل عەسمانەکێ ساهی

کەیخوسرەوێ شعری تو شەهنشاهێ کەلامی
ئەسکەندەرێ نەظما مەیی جەمشیدی ب جامی
میری ب ئەسیری د گری سەعدی و رۆمی
بەندن تە د فتراکێ دو شیرازی و جامی

**تەحسین دۆسکی**

# پێشگۆتنا چاپا سێیێ

ئەڤە چاپا (سێیێ)یە یا دیوانا مەلایێ جزیری ل درێژییا دەهـ سالان ئەم دەردئێخین، چاپا ئێکێ ل سالا ٢٠٠٠ بوو ژ لایێ وەزارەتا رەوشەنبیری یا حوکمەتا هەرێما کوردستانێ ب هلکەفتنا بەستنا مهرەجانا مەلایێ جزیری ل باژێرێ دهۆکێ، وچاپا دووێ ل سالا ٢٠٠٥ بوو ژ لایێ دەزگەها سپیرێز ڤە.. وئەڤە چاپا سێیێ یا ڤەوژارتی و زێدەرکرییە یە دکەفتە بەر دەستێ هەوە پشتی بۆرینا دەهـ سالان د سەر بۆرینا چاپا ئێکێ ڕا، و د ڤان دەهـ سالان دا وپشتی دەرکەفتنا چاپا ئێکێ هژمارەکا دی یا دەسنڤیسێن دیوانا مەلایێ جزیری ب دەست مە کەفتینە، ومە مفایەکێ باش ژێ وەرگرتییە بۆ ڤەوژارتن وزێدەکرنا دەقێ دیوانێ، و د گەل هندێ ژی ئەز دێ گۆتنا سەیدا ئیسماعیل طاها شاهینی دوبارە کەم یا وی ل پێشییا چاپا ئێکێ گۆتی کو هێشتا گەلەک بۆ (دیوانێ) مایییە حەتا ب دورستی ببتە ئەو یا مەلایێ جزیری ب خوە نڤیسی، وهێشتا گەلەک بۆ مایییە کو ژ وان دەستێڤەدانان بێتە پاقژکرن یێن ژ لایێ نڤیسەرێن (دەسخەتێن دیوانێ) هاتینەکرین.. وئەڤە ڕاستییەکە ئەم ب سنگەکێ بەرفرەهـ ڤە دبێژین.

ومەسەلەکا دی هەیە من دڤێت ل ڤێرێ بەحس ژێ بکەم، ئەو ژی ئەڤەیە: هەر چەندە نێزیکی دەهـ دانەیێن دەسنڤیس ویێن چاپکری ژی مە بۆ بەرهەڤکرنا ڤێ دانەیێ ب کارئینایینە بەلێ مە چو ژ وان نەکرینە دانەیا بنگەهی، ڕاستە ژ بناخەیێن (تەحقیقا دەسنڤیسان) ئەوە مرۆڤ دانەیەکێ بکەتە بنگەهـ ودانەیێن دی هەڤبەری وێ دانەیێ بکەت، بەلێ هێشتا دانەیەکا (موتەمەییز) ژ دیوانا مەلایێ جزیری ب دەست مە نەکەفتییە کو ب کێر ڤێ چەندێ بێت، وئەو هەمی دانەیێن مە دیتین د ڤالا نینن ژ کێماسییان، هندەک جاران یێن مەزن، لەو بۆ ڤێ قووناغێ من باشتر دیت ئەم دانەیەکا (تێکەل) ژ گەلەک دانەیان بەرهەڤ بکەین،

و د تەرجیحا دەقێ هلبژارتی دا پال بدەینە سەر لایێ کێشێ ئێکەمین جار، پاشی لایێ دورستییا مەعنایێ وزمانی، پاشی پترییا دانەیان، ب وێ هیڤییێ کو ل پاشەرۆژێ هندەک دانەیێن کەڤنتر و(ئەصلیتر) ب دەست مە بکەڤن، وئەم مفایی بۆ بەرهەڤکرنا دەقێ دورستتر یێ دیوانێ ژێ وەربگرین.

و ل ڤێرێ مـن دڤێت وان دەسنڤیس وژێدەران ب رێز بکەم یێن د هەر سێ چاپێن دیـوانێ دا مـە مفـا ژێ وەرگرتـی، و ب رێزکرنـا وان دێ ل دویڤ دیرۆکـا وان بـت، ئـەو ژی ئەڤەنە:

١- دەسنڤیسا شاعرێ بادینی، میرێ ئامێدییێ (محەمەد طـەیارێ کورێ ئیسماعیل پاشـایی)، ئـەوا ل سـالا (١٢٣١) مـشەختـی (١٨١٥) زایینـی هاتییـە نڤیـسین. وئـەڤـە کەڤنترین دەستنڤیسا دیوانا مەلایێ جزیرییە حەتا نوکە گەهشتییە مە، ودانەیا وێ یا ئەصلی د کتێبخانەیا رەحمەتی سەیدا مەلا طاهایێ مایی دایە، و د فەرۆز ودەهمەنان دا مـە نیـشانا (پاشا) بۆ دانایە.

٢- دانـەیـا میـرێ ئامێدییێ یـێ دویمـاهییێ (ئیـسماعیلێ کـورێ محـەمـەد طـەیـار پاشایی) کو ل سالا (١٢٦٠) مشەختی (١٨٤٤) زایینی هاتییـە نڤیـسین، وئـەڤ دانـەیـە گەلەک یا جودا نینە ژ دانەیا بۆری، ودبت ئەو هەر ل بەر یا دی هاتبتـە نڤیـسین، ودانـەیـا ئەصلی د ئەرشیفێ کۆڤارا (دۆز) دایە ئەوا ل سویدێ بەلاڤ دبت، ود دەهمەنـان دا مـە نـاڤێ (ئیسماعیل) بۆ ڤێ دانەیێ دانایە.

٣- دەسنڤیـسا شـێخ محـەمـەدێ کـورێ عـەبدلعـەزیـزێ شۆشـی ئـەوا ل سـالا ١٢٦٠ مشەختی (١٨٤٤ ز) هاتییە نڤیسین، بەلـێ ئـەڤ دانـەیە یا تمام نینە، و ژ قافییا (ر) دەست پێ دکەت، و ب شعرا (د دەست دا یـەنگییـەک) ژ قافییا (و) ب دویماهی دئێت، ودانـەیـا وێ یـا ئـەصلـی د پەرتووکخانەیا بەغدا یا دەسنڤیسان دایە، ومە نـاڤێ (شۆشی) ل سەر دانایە.

٤- دەسنڤیسەکا دی یا دیوانێ دانەیەکا کۆپیکری ژێ ل بـاژێرێ ئامـەدێ (دیاربـەکرێ) ب دەست مە کەفتییە، ناڤێ نڤیسەری وجهێ نڤیسینێ ل سەر نینـە، ب تنێ ل دویماهییێ

هاتییە: (تمت والحمد لله رب العالمين سنة ٨٦ رومي كانون ثاني) وهزرا مە پتر بۆ هندێ دچت کو ئەڤە سالا هە سالا (١٢٨٦) رۆمییە کو دبتە سالا (١٢٨٩) مشەختی (١٨٧٢) زایینی. وناڤێ (ئامەد) بۆ ڤێ دانەیێ مە دانایە.

٥- دەسنڤیسا سەیدا مەلا (عەبدررەحیمێ کورێ عەبدررەحمانێ وەسطانی) کو ئێک ژ زانایێن دەڤەرا بۆتانە، وخودانێ شەرحەکێیە ل سەر دیوانا جزیری، کو مخابن حەتا نوکە نەهاتییە چاپکرن، ئەڤ دەسنڤیسە ل سالا (١٣٤٩) مشەختی بەرانبەر (١٩٣٠) زایینی هاتییە نڤیسین، ومە نیشانا (وەستانی) بۆ دانایە.

٦- دەسنڤیسا مەلا مصطەفایێ یووسفی، ئەوا ل سالا (١٣٥٧)ی مشەختی بەرانبەر (١٩٣٧)ی ز هاتییە نڤیسین، ودانەیا ئەصلی د کتێبخانەیا سەیدا مەلا مەحموودێ یووسفی دایە، ونیشانا (یووسفی) مە د دەهمەنان دا بۆ دانایە.

٧- دەستنڤیسەکا دی یا دیوانێ ل سالا (١٣٥٧)ی مشەختی (١٩٣٧)ی ز هاتییە نڤیسین, ناڤێ کاتبی ل سەر نینە, ل پێشییێ نڤیسییە: (صاحبه ومالكه عمر بن أسعد) ئەڤە ژی د کتێبخانەیا سەیدا د. محسن ئیبراهیم دۆسکی دایە, ومە نیشانا (عەمەر) بۆ دانایە.

٨- دەسنڤیسا سەیدایێ مە مەلا طاهایێ کۆڤلی ئەوا ل سالا (١٣٦٩)ی مشەختی (١٩٤٩)ی زایینی ل بەر دانەیا شاعرێ ناڤدار شێخ طاهرێ شۆشی هاتییە نڤیسی, ودانەیا وێ یا ئەصلی د کتێبخانەیا سەیدا محسن دۆسکی دایە, ونیشانا (کۆڤلی) مە بۆ دانایە.

٩- دانەیا سەیدا مەلا (عەبدسسەلام ناجی جزیری) ئەوا د گەل شەرحا وی هەی ل سەر دیوانا جزیری، ودیرۆکا نڤیسینێ ل سەر نینە بەلێ ئاشکەرایە کو ئەو ل سالێن چل وپێنجییان دا بوو ژ سەدسالا بیستێ زایینی، ومە ناڤێ (عبدالسلام) بۆ دانایە.

ئەڤە دانەیێن دەسنڤیس، ودانەیێن چاپکری یێن مە مفا ژێ دیتی بۆ هەڤبەرکرنێ:

١- چاپا حەلەبێ، و ب هزرا من ئەو ل سالێن چلان ژ سەدسالا بیستێ هاتییە بەلاڤکرن، وناڤێ (حەلەب) مە بۆ دانایە.

٢- چاپا (العقد الجوهري) یا مەلا ئەحمەدێ زڤنگی ئەوا ل سالا ١٩٥٨ و ١٩٥٩ زایینی قامشلی چاپ بوویی، وناڤێ (زڤنگی) مە بۆ دانایە.

٣- چاپا سەیدا صادق بهاء الدین ئامێدی ئەوا ل سالا ١٩٧٩ ل بەغدا هاتییە چاپکرن، ومە ناڤێ (ئامێدی) بۆ دانیە.

و ژ بلی دەسنڤیس ودانەیێن دیوانا مەلایێ جزیری، هژمارەکا دەسنڤیسێن دی ژی هەبووینە کۆمەکا جودا جودا ییێن شعرێن مەلایێ جزیری تێدا هەنە، مە مفا ژێ دیتییە بۆ بەرهەڤکرنا دانەیا خۆ ژ دیوانێ، و ل ڤێرێ ئەز دێ ئیشارەتێ دەمە هندەک ژ وان دەسنڤیسان:

١- کەشکۆلەکا شعرێن کرمانجی هەیە (١٧) شعرێن جزیری تێدا هەنە، وچار دیرۆک ل سەر هەنە: سالا ١١٨١ مشەختی (١٧٦٧ ز) وسالا ١٢٧٢ مشەختی (١٨٥٥ ز) وسالا ١٢٧٧ مشەختی (١٨٦٠ ز) و سالا ١٢٨٢ مشەختی (١٨٦٥ ز)، و ل بەر دیرۆکا ئێکێ ناڤێ (محمد بن مسیحا) هەیە، و ل بەر دیرۆکا دویماهییێ ناڤێ (عبد اللطیف) هەیە[١]، ودانەیا ئەصلی یا ڤێ دەسنڤیسێ نوکە د پەرتووکخانەیا نشتیمانی ل بەغدا دایە، وکۆپییەکا وێ ل نک مە هەیە (بەلێ وەسا دیارە کو مخابن نە یا تمامە)، مە د فەرۆزان دا نیشانا (بەغدا) بۆ دانایە، وهژمارەکا شعرێن جزیری وهندەک شاعرێن دی ژی وەکی: باتەیی ومەلا مەنصووری ومینا وصادق وهتد.. تێدا هەنە.

٢- دەسنڤیسا شاعرێ بادینی سەیفی یێ شۆشی، شێخ (عبد اللطیف) کورێ (یونس)ێ شۆشی، ئەوا ل سالا ١١٩٥ مشەختی (١٧٨٩ ز) هاتییە نڤیسین.

٣- دەسنڤیسا دیوانا جامع ئەوا ب دەستێ رەحمەتی مەلا ئەحمەد حلمی یێ قۆغی یێ دیاربەکری هاتییە نڤیسین، وسێ شعر تێدا هەنە، وئێک ژ وان نەهاتییە بەلاڤکرن، ومە نیشانا (قۆغی) بۆ دانایە.

(١) وئەڤ دەستنڤیسە ئەوە یا بۆ سەیدا (عبد الرقیب یوسف) بوویە ژێدەرێ سەرەکی د کتێبا وی دا (دیوانا کرمانجی).

هێڤیدارین ئەڤ کارێ خزمەتەکا کێم بت بۆ دیوانا شێخێ شاعرێن کورد مەلایێ جزیری وئەو پێگاڤەکا د جهێ خۆ دا بت بت بەرهەڤکرنا دانەیا دورستتر یا وێ دیوانێ ئەوا هەمی شاعر وعاشقێن کورد ب خۆ ڤە گرێداین.. و ل دووماهییا ڤێ پێشگۆتنێ من دڤێت جارەکا دی سوپاسییەکا گەرم ئاراستەی سەیدا ئیسماعیل تاها شاهین بکەم ئەوێ رەنج وزەحمەتەکا زێدە بۆ چاپا ئێکێ د گەل مە کێشایی حەتا ئەڤ کارێ مە ب ڤی رەنگی هاتییە پێش، وخودێ هاریکارێ مە هەمییان بت.

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

دهۆک ٢٠١٠/١٢/٤

# پێشگۆتنا

## سەیدا ئیسماعیل تاها شاهین

بێ گۆتنە شعرا شاعرێن مە یێن کەڤن و جزیری ل سەرێ هەمییان ژ دەستخەتێن وان ب خوە نەگەهشتییە مە، لەو ژ هنگاڤتنا دەست و تلێن دەستکاری و دەستتێڤەدانێ نە دوورە. ڕاستە دەستێن خزمەتکار ل چار کنارێن کوردستانێ ب دلبێشی (إخلاص) و مەردەمێری پەردەیا تارییێ ژ سەر سێ بارێن شعرا ژێگۆتی ڤەداییىنە، خوە ل ڤەوەژارتن و پاقژکرن و سەرڕاستکرنا وێ پالەکرینە.. بەلێ د گەل ڤێ هەمییێ ژی هێژ دەلیڤەیا زەند و باسک هلکرنێ ژ بۆ ڤاڤێرەکا باشتر و چێتر بکەڤتێ ڤەکرییە، هێژ گەلەک بارێ هەوجەیی ب خزمەتێ مایییە نەڕاکری، ل هیڤییا پتر خزمەتێیە.

برایێ مە تەحسین دۆسکی ژی پشتی چەند دەستنڤیسەکێن هێژا ب دەست خوە ئێخستین، ب چاڤێ ڕاکرنا تڤاڤەکا بارێ ژێگۆتی، سەر ژ نوو خوە ب ڤەوەژارتنا دیوانا مەلایێ جزیری کرییە، ڕێکا دیوانێ ل سەر گێبارەکا دی یا دەستتێڤەدانێ گوهازتییە. ب هندێ ڕوویەکی ب خەمل و خێزتر و ڤەوەژارتیتر دایییە دیوانێ.

کاک تەحسین هەر ژ ڕێڤە و بەری داکەڤتە مەیدانا ڤی کارێ پیرۆز، ژ جوامێرییا خوە باوەرییەکا زێدە دا من و داخواز ژ من کر، کو ئەز بارێ لێزڤڕینێ، ب ستویێ خوەڤە بگرم. خودێ ل سەر شاهدە، من خوە ژ بەر نەئاڤێت و من بارسڤکاتییەکا باش بۆ کارێ پیرۆزێ ئاخڤتن ل سەر کر.

د لێزڤڕینا خوەدە من گەلەک خەلەتییێن ژ بەردەست دەرکەڤتی ڕاستکرن، من وە نەکر دەورێ من د خەلەکا لێزڤڕینێ ب تەنێدە بمینت، هندی د هنبانکا خوەدە من لێ مەزاخت. دیوان ژ سەری هەتا دوماهییێ سێ جاران من خواند، و د بەر خواندنێرە من دەقێ ڤەوەژارتی یێ کاک تەحسین ڕووباری (مقابلی) دەقێ شەرحکری یێ زڤنگی و یێ هەژار دکر

و هزرا خوە ل سەر هەرسێکان ددا، ئەڤە بەس بۆ هەڤبەرکرنێ.. بۆ ڕاستکرنا خەلەتییان ژی (چ یێن چاپێ، چ ژی یێن برایێ ڤەوەژێر) من دوجا ئەگەر نە پتر، دەقێ چاپکری ژی خواند. د گەل ڤێ هەمی خواندنێ ژی، ئەز خوە د سەر خەلەتییانڕە نابینم و خوە بەرووبژارتی ناکم. د گەل زەحمەتا من و کاک تەحسین ب مەردینی داییبە بەر خوە، ئەز هێژ ل وێ باوەرێمە کو دیوانا جزیری یا کاک تەحسین ژی ڤەوەژارتی، هێژ گەلەک بۆ مایییە ب دورستی ببتە ئەو، یا جزیری ب خوە نڤیسی. گەلەک بۆ مایییە ب دورستی ژ شووندەستێن دەستتێڤەدانێ بێتە شووشتن.. ئەڤە ڕاستییەکە پشت تێ نائێتە کرن.

د ڕاست شعرا جزیریدە، هندی خزمەت بێتە کرن هەر کێمە، هندی بێتە گۆتن هەر پچەکە. ب هزرا من، ژ کوردان ژ بەرێ و پاشییێدە، چو شاعران نێزیکی ژی ل جزیری نەکرییە، جزیری شاعرێ یەکێیە، یەکرێز شعر ڤەهوونایی. شاعرێ یەکێیە، مۆسیقا و سەلیقەت و سەروا و پەیڤ ل سەر یەک ڕەنگی دارێتین.

سەلیقەتخوەشی، سەروا، لێنان و لێکدانا پەیڤان یا نەعەدەتی، داڤێن تێکهلکێشایی یێن کرارێ (نسیج) شعرا جزیرینە. سەرپشکاتییا شعرا جزیری و سەرهۆستاییا جزیری ب خوە، یا ڤێ چەندێیە. ئەڤەیە جزیری ب سەر هەمی شاعرێن کوردان ئێخستی و کرییە سەرهۆستایێ وان. مۆسیقا و سەلیقەتا پەیڤ و بێژەیان، کاکلکا هەمی شعرێن جزیرییە، بنسترا جوداکرنا شعرا وییە ژ یا غەیری وی.. چو نیشانێن ئاخڤتنا کۆتی و ڤەرۆتی و ڤەجوویی، د ناڤ شعرا ویدە نینن، ئەڤە ژی نیشانا هندێیە، کو خەمل و خێزا زمانێ وی یێ شعرێ خەلاتەک بوو خودێ پێ سپارتبوو نە پیشەبوو.

ڕاستە بارەکا مەزن ژ ناڤەرۆکا شعرا جزیری ناڤەرۆکا وەختێ خوەیە، نە یا ئەڤرۆیە، لێ زمانێ ئەو ناڤەرۆکە پێ هاتییە دارێتن، هەتا ئەڤرۆ ژی، نە ئەو زمانە یێ تەڤنپیرکێ لێ دایی و ئەم بشێن پشتا خوە بدنێ و لێ نەزڤرن. زمانێ جزیری بۆ هەمی دەمان فەرە، کەڤناتی چوجا لێ دەست نادت، و پیراتی لێ کار ناکت. زمانێ جزیری زمانەکی زێدە زێدە داتراشی و بژوونە ژ ئالییێ لێنانا خوەڤە، ژ ئالییێ سەلیقەت و لێکدانا پەیڤ و بێژەیێن خوەڤە، ژ ئالییێ ڕامانا خوەڤە؛ ئەو ڕامانا گەلەک تا ژێ دچن، و بارا پتر ژێ نەپەنی وڤەشارتی ل بەر مەعنەنەناس و نەمەلەڤانێن وەکی مە.. گەلەک دەرگەهێن ناڤەرۆکا شعرا

جزیری، ل بەر نەشارەزاییێن وەکی مە گرتینە، د گەل هندێ ژی، شعرا وی ب سەلیقەتا نازکا خوە، ب بازا بلندا شێوازێ خوە یێ ئێکانە، یێ کرارێ وی هەمی زمانزانی و شارەزایی و ڕەوانبێژی، مە ب سانەهی دکێشتە خواندنا خوە و هەمی دەمارێن لەشێ مە دهەژینت.

ئەو زمانێ جزیری، شاعرییا خوە یا بێ بەڤل د دەریایا ئەڤینا خوە یا ڕاستانیدە، پێ دەرەهیکری، زمانەکی ژ هندێ ماسترە، نەمەلەڤان خوە تێدە نقۆنی بکن. ب نیشانان جزیری چو زمانێن ژ ڤی هێژاتر بۆ دەرەهیکرنا ئەڤینا خوە یا خودایی نەدیتینە، هێژاتییا زمانێ جزیری ل باز و پێکا ئەڤینا وییە، ل پەییسکا پاقژی و بلندییا خودانێ خوەیە. زمانێ بابەتی (لایقی) ئەشق و ئەڤینا جزیری هەر ئەڤەیە..

ژ کنارێ زمانیڤە، گەلەک خەسلەتێن گرنگێن ب بها، د زمانێ جزیریدە هەنە، مفایەکی زێدە د وارێ زمانزانییێدە دێ ژێ ئێتە وەرگرتن، ژ وان:

١- جزیری ئاخڤتن ب ئاوایەکی وەسا کورتکرییە وگڤاشتییە، کرییە پشکەک ژ سەلیقەتا شعرێ ب خوە. چ پەیڤ و ئاخڤتنا ژ هەمییان سڤکتر ل سەر زمانی و بۆ گوهی، ئەو هلبژارتییە. هەمی دەرگەهـ ل سەر پەیڤ و بێژەیێن سست و پست و ڤەهەرفتی و کۆلانی گرتینە، وە نەکرییە چو ژ ڤان، ڕێکا خوە ب شعرا وی بێخن. بێژەیێن وەکی (( بنێ = بنێرە، ئەر = ئەگەر، نەبهی = نەبهیسی، بێوری = بئێوری)) د ناڤ تەڤنێ شعرا جزیریدە، تام و سەلیقەتەکا نەعەدەتی ددن. ژ بلی ڤان بێژەیان، گەلەجا هێزا لێنان و لێکدانا ئاخڤتنێ ل دەڤ جزیری، ب سەر هێزا سەروایێ ب خوە ژی دکەڤت. سادەیی و دوبارەکرن ژی ل دەڤ جزیری هونەر و شارەزاییە:

ڕەف ڕەف نەهەشتن زاغ زاغ
دانین ل دل مەن داغ داغ
دێ کی بمینت ساغ ساغ
وەستانە لەشکەر صەف ب صەف

یان:

ل تەختێ دلبەرێ ڕوونی ب شاهی
ل تە شاهی موبارەک بت موبارەک
ژ دیـدارا مـورادا مـن ببـەخـشی
مـورادا مـن ژ تـە دیـدارە جـارەک

٢- زمانێ نڤیسینا مە یێ ئەڤرۆ ئیدغام و ئیقلاب وەکی تەوشەکێ ب ناڤ کەڤتینە، و درووشمێ ئاخڤتنا کۆلانێ لێ کرینە. ئیدغام و ئیقلاب، ئەگەر بۆ ئاخڤتنا کۆلانی، سڤکی و لاوینـی ژی بن، بۆ زمانێ نڤیـسینێ، بێ شـک هـەردو کرێتـی و بـێ سـەروبـەرینـە.. زمـانێ جزیری ژ ڤێ تەوشێ پارستی و شووشتییە.

مـن بـاوەرە، ئیـدغام ل دەڤ جزیـری، ئـەگـەر جارنـا هـەبت ژی، نـەچارییـە نـە لاوینـی. ئیدغاما نەچارییێ ژی مەگەر ب قەتلازی ل دەڤ بێتە دیتن. نەموونە د ڤی واریـدە ژ هندێ پترن بێنە هەژمارتن و بەرچاڤکرن.. بێژەیێن وەکی: ((مـەیخانـەیـێ، شـەهکاسـەیـا، ئاییـنـەیـا، شەهزادەیێ، سەمایا، پەردەیا، گەزمەیێن، پەنجەرەیان، مەعنەیا، پەنجەیان، نامەیا، بووییـنە، داییـنە، عەنبەر، چەنبەر، تەنبوور)) بێ کار (بێ حسێب) د دیوانا جزیریدە هەنە.

٣- گەلەک پەیڤ و بێژەیێن کەڤن د دیوانا جزیریدە بەرچاڤن، د وارێ زمانزانیییێدە دێ گەلەک ڕێکێن دوور پێ ئێنە کورتکرن، و گەلەک ڕاستی دێ پێ ئاشـکەرابـن. دیوانـا جزیـری ئاییـنەیەکە، نە بەس سیتاڤکا زمانێ سەردەمێ جزیری ددت، بەلکو کێش و بازا پێشکەڤتن و وەرارا زمانێ ئاخڤتنا مە یا ئەڤرۆ ژی ددت.

پەیڤ و بێژەیێن وەکی: ((ئێدەک = یەدەک، زەنگ = زنج، بیڤێر = نەساخ، ئاییـنە = عەینە یان نەینک، بکرم = بکەم، نەکری = نـەکـی، نـەهـن = نیـنن، جارنـان = جارنـا یـان جانا، مووسایم = مووسامە، بدرت = بدت، پەرگەندەئەم = پەرگەنـدەمـە، دخـورم = دخـوم، داییـنە = داینە، نەبوویینە = نەبووینە، بخوون = بخوونە ، هلین = هلینە)) کو ئەڤە هـەمـی مستەکن ژ خرارەکی تەژی، ئەگەر ب هۆستایی و شارەزایی، هزر تێدە بێتە کرن، دێ گەلـەک ئارمانج و نیشانێن نەهنگاڤتی ئێنە دیتن.

کورت کرمانجی، زمانێ جزیری ژ ڕەنگ و ڕووبار و ناڤەرۆکا خوەڤە، هێژ ب دورستی نەگەهشتییە هەقێ خوە، ب وژدان نەکەڤتییە بەر چاڤ و دەڤان. مەیدانا ڤەدان و ڤەکۆلانا ڤی واری، ئەگەر ل بەر زێدەشارەزایی و دەولەمەندییا زمانێ جزیری و کووراتییا ڕامانا شعرا وی بێتە کێشان، هێژ ڤالایە ژ فێرس و سواران. جزیری نە بەس شعر ب هۆستایی ڤەهوونایییە، بەلکو سەلیقەتخوەشی و شارەزایی ژی، سەرباری ڕوحا سەردەمێ تێدە ژیایی، ب هۆستایییەکا بێ بەڤل داڕێتییە قالبێ شعرا خوە.

کولۆڤانکا زێدەشارەزایی و بلیمەتییا جزیری د دەراڤێ ڤەهوونانا شعرێدە، د هندێڕەیە، جزیری ب شاعرییا خوە یا بێ هەڤڕک، ب سەلیقەتا خوە یا ئێکانە، تەمژینا (غموض) ڕامانا شعرا خوە ژی، ب سانەهی د گەورییا خواندەوارێ خوەدە دبت. ب لێنان و داڕێتنا خوە یا تێرسەلیقە و مۆسیقا و سڤک، ناهێلت تەمژینا ڕامانێ، ببتە ئاستەنگ و گرفتاری د ڕێکا خواندنێدە.

کەسێ وەکی جزیری ب خوە، جهێ خوە د پاناڤا لێنان و لێکئینان و ڤەهوونانا شعرێدە دەستنیشان نەکرییە، میراتییا جزیری د مالکەکا شعرا خوەدە، داییە خوە، ب سەرڤەیە و ژێ نە زێدەیە.. جزیری د مەیدانا قەسەزانی و لێکئینانێدە میرە، د ڤەهوونانا شعرێدە جەهانگیرە؛ دەریایا پەژن و ڕامانانە، جزیری ئەڤەیە ئەگەر زێدەتر نەبت:

د عشقێ شەیخێ ثانیمە، ب دل بەحرێ مەعانیمە
(لـذي حجـر و ذي قلـب شـفاء فـي إشـاراتي)
د ئقلیمێ سوخەن میرم، د شعرێ دە جەهانگیرم
(ویعلـو موکـب العـشاق أعلامـي و رایـاتي)

١٩٩٩ / ٦ / ٢٠

# مەلایێ جزیرێ
# و پێناسەیەکا کورت

**مەلایێ جزیری کییە؟**

مەلایێ جزیری ناڤدارترین شاعرێ کوردە د دیرۆکێ دا، ومن نە باوەرە شاعرەکێ دی یێ کورد ل پێکا وی هەبت چ ژ لایێ بەلاڤبوونا ناڤ ودەنگان بت، یان ژی ژ لایێ زیرەکی و بلندییا ئاستێ شعری بت.. لەو مرۆڤ مەندەهۆش دمینت شاعرەکێ وەکی جزیری هەتا ئەڤرۆ ژین و سەرهاتییا وی ب رەنگەکێ هەژی و دورست نەهاتبتە زانین، و ب ڕاستی ئەڤ چەندە نیشانا خەمسارییا مە کوردانە د دەرحەقا نڤیسینا ژینەنیگارا ناڤداران دا.. وتشتێ ژ جزیری هاتییە زانین ب تنێ ئەوە: ناڤێ وی ئەحمەدە و خەلکێ جزیرا بۆتانە!

یا ناڤی تشتەکێ ئاشکەرایە کو ناڤێ وی (**ئەحمەد**)ە چونکی ئەو ب خۆ و د پتر ژ جهەکی دا ژ دیوانا خۆ ناڤێ خۆیێ دورست دئینت، وەکی:

**ئەحمەدم** سینە سپەر پێشبەری تیرا فەلەکێ
دەعوەدارێ تەمە ئیرۆ تو ژ دەحلی وەرە دەر

یان:

ئەر ب کوشتن وەر ب هشتن ئەمر وفەرمانا تەبت
(**أحمد** عبد رقيق واقف بين العبيد)

وکو ئەو خەلکێ بۆتانە، ئەڤە ژی نە جهێ گومانێیە، چونکی ئەو ب خۆ د شعرەکا خۆ دا د بێژت:

گولێ باغێ ئرەمێ بوهتانم شەبچراغێ شەبێ کوردستانم

وناڤێ بابێ وی یێ دورست کو محەمەدە ب تنێ د ژێدەرکی دا هاتییە ئەو ژی دەستنڤیسا دیوانا جزیرییە ئەوا ل سالا (١٢٣٨)ی مشەختی ب دەستێ عەبدلقادرێ ئامێدی هاتییە نڤیسین، وەکی سەیدا عەلائەددین سجادی ژێ ڤەدگوهێزت[١].

وتشتەکێ زێدە بەلاڤە د ناڤ گەلەک مەلایێن کوردان دا کو جزیری ژ ئویجاخا بوهتییانە، و د دەستنڤیسا (عەمەر) و (وستانی) ژی دا هاتییە کو مەلا ژ بنەمالا (ئەنصارییانە) کو حەتا نوکە ژی ئێک ژ بنەمالێن ناڤدارێن جزیرا بۆتانە.

**جزیری کەنگی ب سەردنیایێ کەفتییە؟**

دەسنیشانکرنا دەمێ جزیری تێدا ژیایی هەتا دەمەکێ نێزیک ژی تشتەکێ ب ساناهی نەبوو.. و بۆچوونا ژ هەمییان نێزیکتر بۆ ڕاستییێ بۆچوونا سەیدا مەلا ئەحمەدێ زڤنگی بوو ئەوێ پشتی خواندنەکا هویر بۆ دیوانا جزیری گەهشتییە وێ باوەرێ کو مەلایێ جزیری ل نیڤا دووێ ژ سەدسالا دەهێ یا مشەختی و نیڤا ئێکێ ژ سەدسالا یازدێ ژیایە[٢].

وپشتی خواندنەکا هویر د دیوانا جزیری دا بۆ مە سالا بوونا وی ب خۆ ژی دیار دبت کو سالا (٩٧٥)ی مشەختی بەرانبەری (١٥٦٧ ١٥٦٨) ی زایینییە، جزیری ب خۆ ئەڤ چەندە ب حسێبا ئەبجەدی د دیوانا خۆ دا گۆتییە[٣]، وئەڤە تشتەکێ بەلاڤە د ناڤ وان مەلایێن کورد دا یێن شارەزا د دیوانێ دا.

جزیری دیرۆکا بوونا خۆ د چارینەیا شەشێ دا ژ ئێکەمین شعرا دیوانا خۆ ئاشکەرا دکەت دەمێ د بێژت:

ژ حەرفا ماهـ و سالێ ما نەهات دەر شەکلێ فالێ ما

---

(١) علاءالدين سجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی، چاپا دووێ، سالا ١٩٧١ ز, بپ ١٨٦.

(٢) أحمد بن الملا محمد الزڤنگي : العقد الجوهري في شرح ديوان الجزري, چاپا دووێ, سالا ١٩٨٧ز, بپ (ل).

(٣) تحسين ابراهيم الدوسكي: مراجعة تأريخية في ديوان الجزيري, کۆڤارا (مەتین) هەژمارا (٤١)ێ, خزیرانا ١٩٩٥ی ز.

ودەمێ مرۆڤ ب هەژمارا ئەبجەدی حسێبا ڤان پەیڤان کۆم دکەت، و ب ڤی رەنگی: (حەرفا = ٢٨٩، ماه = ٤٦، وسال = ٩٧، شکل = ٣٥٠، ما = ٤١، ما = ٤١، فال = ١١١) هەژمارا (٩٧٥) دەردکەڤت، وئەڤە ئەو هەژمارە یا جزیری د ناڤ شەکلێ فالا خۆ دا دیتی، دبێژت: من فالا خۆ ڤەکر دا تالع وئێغبالا خۆ بزان، بەلێ ژ ناڤ حەرفێن مەهـ وسالێن من شەکلێ فالا من دەرنەکەفت، یەعنی: وەسا دەرنەکەفت وەکی من دڤیت، ل شوینا ئەو مزگینییا رزگاربوونێ بدەنە من وان دیرۆکا تێچوونا من راگەهاند.

ودیارە جزیری د ڤێ شعرا خۆ دا وەکی شاعرێ عەرەبان یێ ناڤدار (أبو العلاء المعری) یێ رەشبین بوویە ژ هاتنا خۆ بۆ سەر دنیایێ، ووی دیرۆکا بوونا خۆ حسێب دکر دیرۆکا تێچوونا خۆ! [(١)]

و ژ ڤێ حسێبێ بۆ مە دیار دبت کو مەلایێ جزیری ل سالا (٩٧٥) ی مشەختی (بەرانبەر ١٥٦٧ ١٥٦٨ز) هاتییە سەر دنیایێ.

**ژین وسەرهاتییا جزیری:**

چو تشتێ وەسا ژ ژین و سەرهاتییا مەلایێ جزیری مە نەزانییە؛ چونکی ل دویڤ زانینێ مە حەتا نوکە چو ژێدەر نە ل سەر دەمێ وی، و نە پشتی وی ژی، ل دۆر ژینەنیگارا وی نەهاتینە نڤیسین، وئەگەر تشتەک هاتبتە گۆتن ژی هەر گۆتنا دەڤییە !

سەیدا عەلائەددین سجادی هندەک پێزانینان ل دۆر ژینا مەلایێ جزیری ڤەدگوهێزت وددەتە دیارکرن کو ئەڤ پێزانینە ئەون یێن محمەد عەلی عەونی د کاغەزەکێ دا بۆ وی هنارتین، و وەسا دیارە کو عەونی ئەڤ پێزانینە ژ هندەک مەلایێن کورد بهیستینە.. ژ وان پێزانینان:

جزیری دەمێ هێشتا زارۆ قەستا مزگەفتێ کرییە و ل نک بابێ خۆ شێخ محەمەد فێری خواندنێ ونڤیسینێ وقورئانێ بوویە، پاشی ل گەلەک دەڤەرێن کوردستانێ گەریایە وەک فەقی ژ بۆ وەرگرتنا زانینێ، قەستا ئامێدییێ وجۆلەمێرگێ وئامەدێ (دیاربەکرێ) کرییە، ودەمێ

---

(١) بۆ پتر پێزانینان ل گۆتارا مە یا بەری نوکە بەحس ژێ هاتییە کرن بزڤرە.

ژییێ وی سیه ودو سال ل گوندێ ستریاسێ ل نێزیکێ ئامەدێ و ژ مەلایەکێ دبێژنێ: مەلا طاها ئیجازا مەلاتییێ وەرگرت وبوو مەلایەکێ دووازده علم.

پشتی وەرگرتنا ئیجازێ بوو مەلایێ گوندێ سربا ل دەڤەرا دیاربەکرێ پاشی چوو حەسەنکێفێ و ل وێرێ بوو مەلا ودەرس ددانە فەقییان وئیجازێن مەلاتییێ ژی ددان.

پشتی هەیامەکی ژ حەسەنکێفێ زڤڕی وهاتە بازێرێ خۆ (جزیرا بۆتان) وهەتا مرنا خۆ ل ژییێ حەفتێ وپێنج سالییێ لێ ئاکنجی بوو[١].

بەلێ وەکی ئاشکەرا ئەڤ پێزانینە د چو ژێدەرێن نڤیسی دا نەهاتینە.

و ژ تشتێن ناڤدارە کو مەلایێ جزیری سەیدا بوو ل مەدرەسا سۆر ئەوا ل جزیرێ.



مەدرەسا سۆر ل جزیرا بۆتان

(١) علاءالدین سجادی: ژێدەرێ بەرێ, بپ ١٨٦-١٨٧.

**جزیرییێ شاعر:**

ڤـەکۆلـەرێـن دیرۆکـا ئـەدەبییـاتێن کـوردی هـەمـی ل وێ بـاوەرێنـە کـو مـەلایـێ جزیـری سەردەفتەرێ هەمی شاعر وئەدیبێن کوردە، و دیوانا وی ئەوا گەهشتییە مە باشترین نیشان و گرۆڤەیە ل سەر ڤێ چەندێ..

جزیری ب شاعرییێ هاتییە ناسین بەلـێ کـانێ چاوا ئـەم چو ژ سـەرهاتییا ژینا وی نزانین وەسا ئەم چو ژ سەرهاتییا وی یا شعری ژی نزانین، کانێ کەنگی دەست ب ڤـەهانـدنا شعرێ کرییە؟ و چ بەرهەم ژبلی دیوانێ هەنە؟ ب تنێ مە ئەو هەلبەستێن وی دیتینە ئەوێـن د دیوانێ دا پاراستی مایین ئەوێن هندێ دگەهینن کو جزیری شاعرەکێ پایە بلند وبێ هەڤتـا بوو!

د خواندنەکێ دا بۆ دیوانا جزیری ل سێ جهان دیرۆکا ڤەهاندنێ بۆ مە دیار دبت:

**جهێ یەکێ:** د قافییا ( سین )ێ دا ، دەمێ د بێژت:

تورکێ خوونریز وخوماری مە ب یـەک غـەمـزەیـەکـێ
زوهدێ چل سالە ل من زیر و زەبەرکر ژ ئـەساس!

ژ ڤێ د ئێتە زانین کو جزیری ئەڤ هەلبەستە ل چل سالییێ ڤەهاندییە، ئانکۆ ل سالا (١٠١٥)ی مش (١٦٠٦)ی ز.

**جهێ دووێ:** د قافییا (نوون)ێ دا دەمێ دبێژت:

سیهـ سالە ژ دەرد و ژ بەلایێ تە هلاکـین
حەتتا ب فەلـەک هەر درەتن ئاهـ و ئەهێ مـن!

ژ ڤێ ژی د ئێتە زانین کو وی ئەڤ شعرە ل سیهـ سالییێ ڤەهاندییـە، ئـانکۆ ل سالا (١٠٠٥)ی مشەختی.

**جهێ سێیێ:** دهەلبەستا دویماهییێ دا ژ بناخەیێ دیوانێ جزیری دبێژت:

دەمــەکــی دا بــسـەیــرین ســەد ســالان
لەو ئەلیف تێن مە دحەرفێن فالان
کـو ل شـەکلێ رەقـەمـێ سـەرسـالان
تـوی مـرادا مـە ژ عـەرعـەر بـالان

ودیارە کو مەبەستا جزیری ب دو ئەلیفان دو هەژمارێن ئێکن، ئانکۆ ئێکی هەیڤا ئێک کو سەرسالە، وهژمارا سالێ ژی ب ڤی رەنگی دەردکەڤت:

شکل = ٣٥٠        رقم = ٣٤٠        سرسال = ٣٥١

وکۆما هژمارێ دبتە (١٠٤١)، ئانکۆ ل رۆژا سێ شەنبێ (١٠٤١/١/١)ی مشەختی بەرانبەر (١٦٣١/٧/٢٩)ی زایینی جزیری دیوانا خۆ ب دویماهی ئینایە، وهنگی ژییێ مەلایێ جزیری (٦٦) سال بوو.

وتشتێ پتر ڤێ بۆچوونێ بنەجهـ دکەت ئەوە جزیری د شعرەکا خۆ یا دی دا دبێژت:

ئـەللاهــ ل مــن حـەیاتـە چ شـەککـەر ونـەباتـە
ژ نوو ڤە دێ جوان بم گەر بهن بکم گولا گەش

وهژمارا ئەبجەدی یا پەیڤا (الله) دبتە (٦٦) وەکی مە ل جهێ وێ د دیوانێ دا ئیشارەت دایێ.

**جزیرییێ عاشق:**

جزیرییێ شاعر د دیوانا خۆ یا مەزن دا گەلەک بابەتێن جودا جودا ڤەگرتینە وبەحس ژێ کرییە، لێ بابەتێ ژ هەمییان پتر ل دۆر زڤرِی عشق و ئەڤیندارییە.. وئەڤینداریا وی نە وەکی هەر ئەڤینداریەکا دییە، ئەڤینەکا تێکەلە د گەل فەلسەفێ وصۆفیاتییێ و ل گەلەک جهان زەحمەتەکا زێدە ب خواندەڤانی دکەڤت حەتا بشێت ڤان بابەتان ژێک ڤاڤێرت.

گەلەک گۆتن د دەرحەقا ئەڤینداریا جزیری دا هاتینەکرن، لێ ئەڤ گۆتنە هەمی دبێ بنیاتن وچو نیشانێن ئاشکەرا وبنبڕ ل سەر نینن، وئێکێ وەکی جزیری سەرهاتییا ژینا وی

هێشتا د تارییێ دا مایی، یا غەریب نینە کو سەرهاتییا عشقا وی ژی یا روهن وئاشکەرا نە بت. وهەر چەندە جزیری د شعرێن خۆ دا هەژمارەکا ناڤێن کچان ئینایینە لێ ئەڤە نابتە دەلیل کو ئێک ژ ڤان ناڤان ناڤێ دلبەرا وییە، نەخاسمە ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو ئەڤ ناڤە د شعرێن بارا پتر ژ شاعران دا دوبارە بوویینە .

## مەلا.. یان نیشانی؟

ئەڤە ئەو هەردو ناسناڤن یێن کو جزیری د شعرێن خۆ دا بۆ خۆ داناین و پتر ژ جارەکێ دوبارە کرین.. مەلا؛ چونکی وی دەستویرنامەیا مەلاتییێ وەرگرتبوو و د ژینا خۆ دا مەلاتی دکر، هەر وەسا دەرس ژی ددانە فەقییان وئیجازە ددان، ووەکی دئێتە زانین ئەو ئێک ژ سەیدایێن مەدرەسا (سۆر) بوو ئەوا ل جزیرێ ناڤدار.

و ل دۆر هلبژارتنا وی بۆ ناسناڤێ نیشانی، سەیدا مەلا ئەحمەدێ زڤنگی دبێژت: دبت نیشانی پالدان بت بۆ نیشانێ کو ب رامانا ئارمانجێ دئێت ئانکۆ ئەو یێ بوویە ئارمانجا تیرێن ئەڤینێ، یان ژی ئارمانجا نەخۆشی وگرفتارییان ژ بەر ئەڤینا خۆ، ودبت ئەو پالدان بت بۆ وێ نیشانا ل سەر روی هەی، هەر وەکی وی دڤێت خۆ بۆ نیشانێ پال بدەت ژ بەر وان مەدحێن وی بۆ کرین[1] .

## ژییێ جزیری ومرنا وی:

وەکی مە ڤەگێرایی جزیری ل سالا (٩٧٥)ی مشەختی بەرانبەری (١٥٦٧-١٥٦٨)ی ز هاتبوو سەر دنیایێ، ووی ل سالا (١٠٤١)ی مش (١٦٣١)ی ز دیوانا خۆ ب دویماهی ئینابوو.. ژ ڤێ دئێتە زانین کو ژییێ جزیری هەر چاوا بت ژ شێست وحەفت سالان کێمتر نابت.

و د وێ شعرێ دا ئەوا مەلایێ جزیری وفەقییێ تەیران هاڤێتییە بەر ئێک، تەیران سۆر ب سۆر ئاشکەرا دکەت کو وی وجزیری ئەڤ شعرە ل سالا (١٠٣١)ی مشەختی (١٦٢١)ی ز ل جزیرێ ڤەهاندییە، تەیران دبێژت:

---

(١) أحمد الزڤنگي: ژێدەرێ بەرێ, بپ (و).

بریندارێ عشقێمە | دوورم ژ سها بهان
دزانن مەدداحێ کێمە | د هەزار و یەک وسهان
ثەناخوانێ (مەلێ) مە | ل هەموو عەرد و جهان

وپێگۆتنا ( ئیرۆ وەرن .. ) ئەوا دبێژن فەقییێ تەیران ب مرنا جزیری ڤەهاندییە ودەقا وێ ل دووماهییا ڤێ دیوانێ مە ئینایە، فەقی ل سالا (١٠٥٠)ی مشەختی ڤەهاندییە، وەکی ژ حسێبا ئەبجەدی دیار دبت، ب ڤی ڕەنگی، فەقی دبێژت:

حەفت عەین کو لام ژێ بوو جودا | شین و گری دیسا تە دا

وحسێب هۆسا دەردکەڤت: حسێبا عەینێ (٧٠)یە، وئەگەر ئەم وێ لێکدانی (٧) بکەین دێ بتە (٤٩٠) وئەگەر ئەم (لامێ) ژێ جودا بکەین کو حسێبا وێ (٣٠)ە، دێ بتە: (٤٦٠) وحسێبا (شین = ٣٦٠) و (گری = ٢٣٠) لێ زێدە بکەین، ئەنجام دێ بتە (١٠٥٠) کو سالا مرنا جزیرییە، وسەیدا عەلائەددین سجادی ژ دەستنڤیسا عەبدلقادرێ ئامێدی ڤەدگوهێزت کو جزیری ل ژییێ (حەفتێ وپێنج) سالییێ مربوو[1].



دەرگەهێ وێ سەرداڤێ ئەوا گۆڕا جزیری لێ

(١) علاءالدین سجادی: مێژووی ئەدەبی کوردی, بپ ١٨٧.

وئەگەر ئەم ل بيرا خۆ بينين كو مەلا ل سالا **٩٧٥** هاتبوو سەر دنيايێ، دڤێت بێژين: ئەو ل سالا (١٠٥٠)ى مشەختى (بەرانبەرى ١٦٤٠ى ز) چووبوو بەر دلۆڤانييا خودێ، دەمێ ژيێ وى (٧٥) سال.. وئەڤە وێ گۆتنا بۆرى ب هێز دئێخت ئەوا دبێژت: فەقى ل سالا (١٠٥٠)ى مشەختى هەلبەستا (ئيرۆ وەرن..) ب مرنا جزيرى ڤەهاندييە.

## گۆڕا جزيرى:

مەلايێ جزيرى بێ دووندەھ مربوو؛ ژ بەر كو وى ژن نەئينا بوو وەكى دبێژن! ووى ل درێژييا دژييێ خۆ ئەوێ ل جزيرێ بۆراندى دەرس ل مەدرەسا سۆر ددانە فەقييان، ووەسا دئێتە زانين كو مرنا وى ل جزيرێ بوويە، وگۆڕا وى حەتا نوكە يا ئاشكەرايە، دكەفتە د سەرداڤەكێ دا ل ئاڤاهييێ مەدرەسا (سۆر) ل جزيرێ ودەمەكێ درێژ خەلكێ دەڤەرێ ب چاڤێ پيرۆزييێ بەرێ خۆ ددايێ!



گۆڕا مەلايێ جزيرى

# قافیا ( أ )

## نەوایا موطرب و چەنگێ

(چارخشتەکرنا شعرەکا
حافظێ شیرازییە)

نەوایا موطرب و چەنگێ فەغان ئاڤێتە خەرچەنگێ
وەرە ساقی حەتا کەنگێ نە شوٚیین دل ژ ڤێ ژەنگێ
حەیاتا دل مەیا باقی بنووشین دا ب موشتاقی
(ألا یا أیها الساقي أدر کأساً وناولها)
کو کاتب دێمی جەدوەل کت شکەستە خەط موسەلسەل کت
ژ یەک حەرفان موفەصصەل کت کیە ڤێ موشکلێ حەل کت
دزانی روودێ عوود[1] ئەووەل چ داڤێتن سروود ئەووەل
(کە عشق آسان نمود أول ولی أفتاد موشکلها)
ژ مهرا وێ شەفەق سەعدێ شرین لەعلێ شەکەر وەعدێ
دنالم شوبهەتی رەعدێ عەجیبم لێ ژ ڤێ جەعدێ
(کە دل راتاب هر چینش بکفری[2] میبرد دینش)
( ز تاب جعد مشکینش چە خون أفتاد در دلها)

---

(١) روود و عوود (یووسفی،زڤنگی، ئامێدی، ئامەد).
(٢) ب فکری (پاشا).

دڤـێ طـاقێ[١] دڤـێ خانێ مـه عـەيـش و ئێمنـى كـانێ؟
كـەسـێ دەسـت دت ژ دەورانـێ نهالـەک ڤـێ گولـستانێ
(در آغوشـش چـه مـى آرد كـه أز دل جـانش بـسپارد)
(جـرس فريـاد مـى دارد كـه بربنديـد محملهـا)
ب قورئـانێ ب ئايـاتێ ئـەگـەر پيـرێ خـەرابـاتێ
ببێـژت: سـەجـده بـن لاتـێ موريـدێ وى دبـن قـاتێ
(مريـد أر بـى بـصر نبـود ز فرمـانش بـدر نبـود)
(كـه سـالک بـى خبـر نبـود ز راه و رسـم منزلهـا)
ژ ڤێ[٢] ظـولمات و دەريايێ[٣] ژ مەوجان قەط خەبەر نايێ
شـكەسـتى كـەشـتييا بـايێ عـەجـاجێ وێ شـەڤـێ[٤] دايـێ
ژ حەرفا[٥] ماه و سالێ ما نەهات دەر شەكلێ فـالێ مـا[٦]
(كجـا داننـد حـال مـا سـبک بـاران سـاحلها)[٧]

---

(١) تاڤێ (كۆڤلى، يووسفى، عبدالسلام).
(٢) شەڤێ (يووسفى، زڤنگى، ئامێدى) ژ وێ (كۆڤلى).
(٣) ظـولماتێ دەريايێ (ئامەد).
(٤) شەفەق (كۆڤلى، يووسفى، زڤنگى، ئامێدى) و ب من وەرە شەفەق دورستترە!
(٥) حەرفان (يووسفى، زڤنگى، ئامێدى، ئامەد).
(٦) فكر و فالێ ما (ئيسماعيل).
(٧) د ڤێ چارينەيێ دا مەلايێ جزيرى كەڤالەكێ هۆنەرى يێ زێدە جوان نـەخشاندييە، وپـشكەک ژ ديتنا خۆ يا فەلسەفى ژى بۆ ژينێ بۆ مە ئاشكەرا كرييـە، وديرۆكـا بوونـا خۆ ژى ب رێكا حسێبا ئـەبجەدى ديـار كرييـە، دبێژت: ل شەڤەكا تارى زولمات، يان ل دەمەكێ تارى من هند خۆ ديت ئەزێ د نـاڤ تارييـا دەريايـەكا مـەزن دا، يـا خودان پێلێن دژوار (ومـەبـەست پـێ دەريايـا ژينێيـە كـو دنيايـە) ژ بـەر دەنگـێ پـێلان دەنگـەكـێ دى نەدهاتە من، وئەو كەشتييا ئـەز ل سـەر پشتێ ژ بـەر بايێ دژوار شـكەست، وتـۆزێ شـەفـەق ددا وێ شـەڤـى! هنگى من فالا خۆ ڤەكر، بەلێ حەرفا ماه وسالێن من (كو ٩٧٥ بـوو، سـالا بوونـا مـن) ل دويـڤ دلـێ مـن نەهات، چونكى وێ فالا تێچوونا من ڕاگەهاند!!

مە ڕا ژ ئەووەل چ بر[1] خامی کشاند ئاخر ب بەدنامی
ژ ڕەنگێ سەعدی و جامی ژ شوهرەت پێ حەسین عامی
ب دەنگ و بانگ و ئاوازێ دبێژت نەغمەیا سازێ
(نهان کی ماند آن رازی کز و سازند محفلها)
ژ حافظ قوطبێ شیرازێ مەلا فەهم ئەر بکی رازێ
ب ئاوازێ نەی و سازێ ببی بەر چەرخێ پەروازێ[2]
(تزد من حبه[3] الصفوی به[4] أهل الهوی نشوی[5])
(متی ما تلق من تهوی دع الدنیا و أهملها)[6]

(١) پر (پاشا، ئیسماعیل، عبدالسلام ، وەستانی ).
(٢) ئاوازێ (ئامەد).
(٣) حبها (ئامەد).
(٤) بها (ئامەد).
(٥) تشوی (ئامەد).
(٦) وامهلها (پاشا، کۆڤلی، عبدالسلام، وەستانی).

# ئسمێ تەیە مەکتووب

ئـسمێ تـەیـە مـەکتـووب د دیـوانێ قـدەم دا
حـەرفـەک قـەلـەمـێ علمـی ب تـەقـویمێ ڕەقـەم دا
ئەشکال و خەطێن دائرەیێ نوقطـەیێ علمـن[(١)]
ئـەڤ نـەقـش و مثـالـن[(٢)] د خـەیـالاتێ عـەدەم دا
میم مەطلەعێ شەمسا ئەحەد ئایینە صفەت کر
لامـع ژ عـەرەب بـەرقـێ ل فـەخخـارێ عـەجـەم دا
دا شاهدێ ئەسما ب هەمی وەجهی بناسین[(٣)]
یەک مەستی صەمەد کر ب یەکێ نەقشێ صەنەم دا
یـەک گرتییـە زولفـێ ویـەکـی خـال نومـایی
ئایینــە ب ئــەســکەنــدەری و جــام ب جــەم دا
ئەرواحێ موقـەددەس شـەبێ قـەدران تـە دخـوازن
نــوورا تــەیــە مــصباحێ د قــەنــدیلێ حــەرەم دا
دا وەقتـێ لقـایێ ب تـە حـەی بـین د بـەقـایێ
مـن نـەقـدێ دل و جـان د فـەنـایێ ب سـەلـەم دا
یـاقووت فرۆشـان د کـەف ئـەلماسـی شـکەسـتن
ئەڤ صەفحەیێ ئـەلماسێ کـو نـەققاشی قـەلـەم دا

---

(١) عشقن (وەستانی، ئامەد).
(٢) نەقش و مثالن (بەغدا).
(٣) بناسن (ئامەد).

یا رەب ژ چ ڕوو لەب ب ثـەنایا تـە گوشـایم[1]

( سـبحانک لـن أحـصي فـي شـأنک حمـدا )

مننـەت ژ خودایی کـو ب عـەبدێ خوە مـەلایـی

ئکـسیرێ غـەمـێ عـشقێ نـە دینـار و دەرەم دا

(١) ب چ ڕوو .. گوشایین (ئامەد).

# مەششاطەيێ حوسنا ئەزەل

مــەشــشاطـەيــێ حوســنا ئــەزەل		چـــەنگـــالێ زولفـــان تـــاب دا
دا عـــشق هـــل بـــت پێـــل پێـــل		قــەلبــێ مــەلــێ[1] جــەلـــلاب دا

حوســنا حــەبيــب ولــوطفێ يــار		ئاڤێتـــــە دل عــــشقا غــــەدار
لــەو ســەلــب[2] كــر ژێ ئختيــار		وێ حوســـنێ ئـــەڤ ئيجـــاب دا

مــن دی ســەحــەر زولفـێن دمـەست		هــاتن ســەمــا ئحــرام بــەســت[3]
چوون سەجدەيا خالێ ب قـەست[4]		لــــەو حاجبــــان محــــراب دا

ڕووح و ڕەوانـــێ مـــن حـــەبيـــب		ديـــسا ب تـــەلبيـــسا رەقيـــب
رەنجيـــدە كـــر مـــسكين غـــەريـــب		تـــەركـــا دلـــێ ئـــەحبـــاب دا

مــەحبــووب ب جامــا پــوڕ گــولاڤ		كــەركــر ل مـــن جــەرگ وهنــاڤ
زەهـــرا هـــەلاهـــل بـــوو د نـــاڤ		لــەو ســاقی ئـــەو جـــوللاب دا

وان دەســـت و زەنـــد و ســـاعدان		مـــەی دانـــە شـــەيـــخ و زاهـــدان
مــەســتی ب چــەشـمێ[5] شـاهدان		ئـــــەو نێرگـــــزا ســــيراب دا

---

(١) مە بێ (زڤنگی، ئامێدی) مە پێ كوللاب (ئامەد).
(٢) صەعب (ئيسماعيل).
(٣) ئحرام مە بەست (ئامەد).
(٤) چووم سەجدەيا طـاقان ب قەست (ئامەد).
(٥) د چەشمێ (ئامەد).

مـــسكێ(١) ڕەشـــاندی ئـــەز دبـــێم وان نوقطـــەیـان هـــن بوونــه كـێم(٢)
لـــێ خــەططـــێ رەیحـــانی ل دێـــم كاتـــــب ژ نـــــوو ئعــــــراب دا

نـــازک قــــەدا نـــوورین بـــەشـــەر ئـەو بـــوو ل مـــن نـەقـشێ بـەصـەر
ئینـــا(٣) خـــەیـــالێ هـــەر ســـەحـــەر نـــاڤ دیـــدەیـــێ بـــێ خـــواب دا

ئـــەو تللییـــێن نـــازک رەقیـــق پـــوڕ دا مـــه فنجانـــا عـــەقیـــق
ئـــەو بـــادەیـــا نـــوورین رەحیـــق مننـــــەت ب مـــــن وەهـهــــاب دا

دا خـەف نـه بـین(٤) بـەژنـا فـەرێ مـــەی هاتـــه شـــەهكاســـا ســـوڕێ
مننـــەت كـــو ئیـــرۆ دێـــم دوڕێ دیـــسا شــــەرابــــا نــــاب دا(٥)

مـــەی هاتـــه فنجانـــا صـــەدەف كـــی دێ ڤـەخـوت ئیـرۆ ب خـەف
ســاقی ب چــەنــگ و نـــای و دەف فـــەرفووریيـــا(٦) مـــەهتــــاب دا

عیـــده وحـــەبیبـــێ نـــەذره لـــێ یـــان دێ ب قوربـــان بـــی(٧) مـەلـێ
یـــا رەب ببیـــنم ڕۆژ هـــەلـــێ(٨) ســـككین د دەســـت قـــەصـــاب دا

---

(١) مسكه (عبدالسلام، ئامەد) مشكێ ( وەستانی).
(٢) وان نوقطـەئێ عەنبەر د نێم (ئامەد).
(٣) دینا (ئیسماعیل، كۆڤلی، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی) تێته (ئامەد).
(٤) نەبت (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) د دانەیا (ئامەد) دا ئەڤ چارینه ب ڤی ڕەنگییه:
(گاڤا) كو من دی ئەو ل ڕێ مـەی ڕێهـته شەهكاسا سوڕێ
مـنـنـەت كو دیسا دێم دوڕێ بـۆ مـن شـەرابـا نـاب دا
(٦) شەهبادەیەک (ئامەد).
(٧) قوربان كت (ئامەد).
(٨) د هندەک ژێدەران دا ( وەكی: پاشا، یووسفی،عەمەر) ڕێزكا دووێ وسییێ ژ ڤێ چارینەیێ پێک دگوهۆڕن.

# موغبەچەيێن مەێ فرۆش

موغبـەچـەيـێن مـەى فـرۆش		هـەر سـەحـەرێ تـێن سـەمـا
بـادە خـوەران[1] نـۆش نـۆش		مانـــە ل دۆرێ جـــەمـــا

هــن گــولێ بــوو عــەنبــەرن		هــن د شــرين ئــەســمــەرن
هـــن گوهـــەرى دانـــەيـــن		مثلى سوهەيلێ سەمـا[2]

هـــن زەرينـــە پـــوڕ ســـوڕن		سەر ب پەڕ و[3] دێم دوڕن
مــن كــو د چــەرخــێ وە دى		صـەبـر و قـەرارم نـە مـا[4]

صـــەبـــر و قـــەرارم كـــو بـــر		جـەرگ وجـەگـەر هـوور دكـر
ظـولمى وە ڕەنـگ كـێ دكـر		جــان دبــر و دل تـــەبــا

جـــان و دلـــێ مـــن ئـــەوە		حـــووروەشـــێ مـــن ئـــەوە
پادشـــەهـــێ مـــن ئـــەوە		ئـــەم ل دەرێ وێ گـــەدا[5]

يـــارێ كـــو دى ئـــەم گـــەدا		دەســـت ب دەســـتێ مـــە دا
ئـــەم ب ســـەمـــايێ بـــرين		ڕەقـص وسـەمـا ژى وە مـا

---

(١) بادەخورێن (ئامەد).
(٢) ئەڤ چارينە د دانەيا (ئامەد) دا ب ڤى ڕەنگييە:
هن گول و هن عەنبەرن		هـن شـرين و ئەسمەرن
هـن دانـەئـێ گەوهەرن		مثلێ سـوهەيلێ سەما
(٣) سوڕ پەرينە (كۆڤلى) سەر ب پەڕن دێم دوڕن (ئامەد).
(٤) من گۆ وە چەرخێ د دەم   مثل سهيل السما   (كۆڤلى).
(٥) ئەڤ مالكە ويا بەرى وێ ل نك (پاشا، وكۆڤلى، وعبدالسلام) نينە.

گۆتــه مــه دوڕدانــەیــی
ئـەم ژ تـه و تـو ژ مـەیـی
لـەو ب حـەقیقـەت یـەکـین
مـەسـئەلـه بـێ شـوبهه مـا

دامــه ب دەســتێ ســوڕێ
جامـــا ژ ڕەنگـــێ دوڕێ
جــەذبــه گهـا جــان و دل
پـوڕ شـەووشـاندن هـەما[1]

بــاده م نووشــی ژ دەســت
چوومه ژ خوه مامه مەست
قــەطــره ب بــەحــرێ گهـا
بـەحر ب عـەینی خـوه مـا

گووشــی ب عــامێ مــه ده
تــەرکــێ مــودامێ مــه ده
(أکثـــرهم فـــي غمـــا
أغلـــبهم فـــي عمـــا)

حـەرف ژ یـەک بوونـه فـەصـل
گـەر ببـری وان ب ئـەصـل
حـەرف دبـت یـەک خـەطـەک
خـەط کـو نـەما نوقطـه مـا

وەحــدەتــێ موطلــەق مــەلا
نــووره د قــەلبــان جــەلا
زۆر د ڤــێ مــەســئەلــێ
ئــەهلــێ دلان شــوبهه مــا

(١) ئەڤ مالکه ژی ل نک (پاشا، کۆڤلی، وەستانی) نینه.

# چين چين كرن

چـين چـين كـرن زولفـێن سـيا		كـەسـك ئـەطلـەسا ديبا قـەبا
ئێـــدى نـــشان نـــابن خويـــا		تێكــــل كـــرن لازم صــــەبــــا

مـــن دى صـــەبـا بـايێ سـەحـەر		مـــادارێ بـــەدرێ كـــر دوكـــەر
قـــەوس و قـــوزەح ژێ هاتـــە دەر		ديــسا ب زولفـــان ڕا تـــەبـــا

ئيـرۆ ژ مـە ل بـەدرا تـەمـام[(١)]		عـەنبـەرفـەشان بـن سـەد سـەلام
ئـەى هودهـودێ شـيرين كـەلام		(أهـــلاً و ســـهلاً مرحبـــا)

مـــن دلبــەرەک وەک دوڕ هــەيــە		مـەحبـووب و شيرين سوڕ هـەيە
حوسـن و جـەمالـەک پوڕ هـەيـە		بەلقيس صفەت مەسكەن سەبا

مــــە دڤـــێ پـــەرييـــا دلبــــەرێ		لـــێ هـــێ ل ئوسـلووبا بـەرێ[(٢)]
لـێ كفـش ببـى تـو ژ پـەنجـەرێ		تـــێ و دچـــى تـــەشـــبيهى بـــا[(٣)]

شـۆخ و شـەپالا مـەى پـەرەست		ئـەو ظـالمـا هشيار و مـەسـت
ڤێ نامەيێ خەف دى ڤ دەست[(٤)]		( فـــي طيهـــا نـــشر النبـــا )

---

(١) ئيرۆ مە دى بەدرا تەمام (كۆڤلى) ئيرۆ ل مە بەدرا تەمام (ئامەد).
(٢) ئەڤ چارينە د دانەيا (ئامەد) ب ڤى ڕەنگييە:
مـە دڤـێ كـو ئيـرۆ دلبـەرێ		لێ هـەر ل ئـسلـووبـا بەرێ
كەشف بت ل طاقا پەنجەرێ		بـێ و بـچـى تـەشبيـهى با
(٣) لێ كفش ببێتە ژ پەنجەرێ  بێ وبچت تەشبيهى با (زڤنگى، ئامێدى).
(٤) خەف دە ب دەست (زڤنگى، ئامێدى).

بێــژ ئــەو شــیرینا ســورِ پــەری | دورِدانــەیــا ئــەز موشــتـەری:
کـان عـەهـد وپـەیمانـا بـەری؟ | بێ فایدە چوون شوبهی هەبا[(١)]

نەی شەککەرا سپی دەست وزەند | زانـم مـەجـالێ نامـە خـوەنـد
لێڤـان تـەبـەسسوم کـر ژ قـەنـد | (ماســت کبــان فــي ربــا)

دلبــەر مــەجــالێ نامــە دی | ناســی کــو نیــشانا مــە دی
نوونـەک موخـالف تـێ نـە دی | (هـل قلبهـا نحـوي صـبا)[(٢)]

قاصد ب مـەقـصوودا مـە هات | بـا مـوژدە ئـو ئـەمـر و بـەرات
نیــشان هنــارن هــەم خــەلات | شـەهـزادەیـا گولگـوون قـەبـا[(٣)]

ئیرۆ مەجال لێ هات و وەخت | دیـسا جـوان بـوو مـن درەخـت
ئــەو لامعـا دایـی ژ تـەخـت | (مــا کــان برقــاً خلبــا)

ســەلــوا رەوان زەرریــن وەرەق | چیچەک مەلێ دین ئەو نەسەق
(یاقوتهــا یحکــي الــشفق | یحکــي عقــوداً کوکبــا)[(٤)]

---

(١) تەشبیهی با (پاشا، عەمەر، کۆڤلی، یووسفی ) مثلی هەبا (ئامەد).

(٢) هل قلبها نحو الصبا (پاشا، کۆڤلی).

(٣) گول گول (کۆڤلی).

(٤) یحوی عقوداً کوکبا (ئامەد).. ب ڕێزکرنا مالکێن ڤێ هەلبەستێ د هەمی ژێدەران دا وەکی ئێک نینە، مە وەکی دەستنڤیسا (پاشا)ی نڤیسییە.

# دلبەر شكێنا شەككەرەك

دلبـــەر شــكێنا شــەككــەرەك (فقلــت: يــا روحــي متــى؟)
گۆ مـن: حـەتا خاطر هەبت[(١)] مـن گـۆ: چ كـم ئـەز بـا هـەتا ؟

زولفان تو بەس چين چين بكە بــسكێن موقابــل ديــن بكــە
پێشكێشى يـەک زولفـەک تـەبن مـولكێ خوتـەن تـەختـێ خـەتا

دل بــەنــدێ داڤــا زولفــەكــێ كـەفتـى كـەمـەنـدا ئولفـەكێ[(٢)]
(هـل فـي يـد المفتـون شـيء؟ أو كيـف أصـنع[(٣)] يـا فتـى؟)

زولفـێن بـوت وشـيرين لـەبـان ژەهرينـە شـوبـهەت عـەقـرەبـان
لــێ مــن ژ بــسكا پـورێ گـرێ ئيــرۆ تنــێ گــرتن دو تــا[(٤)]

نــسبەت پــەرى زيبايــە ئــەو وەک نێرگــزا يــەكتايــە ئــەو
( يــا مــن رأى خلــي فهــل يــشبي بــشيء قامتــا ؟)[(٥)]

مــە ژ بوغچــەيا يــار زەيينــى بێ پورس يەک[(٦)] سێڤەک چنى
(فبمــا جنيــت جنيتــي ألقــت علــيّ جنايتــا )

---

(١) گۆ من هەتا بێ خاطرەک (ئامەد).

(٢) ئلفەكێ (عبدالسلام).

(٣) يصنع (ئامەد).

(٤) تير تێنە دل وەک كەوكەبان گرتم د وان زولفێ دو تا (ئامەد).

(٥) ئەڤ چارينە ل نک (وەستانى) نينە، و د دانەيا (ئامەد) دا ب ڤى رەنگييە:
نسبەت پەرى زيبايى تو وەک نێرگزا يـەكتايى تو
(يا مـن يرى خلي فهو يشبـه بشـيء قـامتـا )

(٦) مەلا (عبدالسلام، وەستانى، حەلەب) مەلێ (ئامەد).

## بـ نارێ فورقەتێ سوهتم

ب نـارێ فورقـەتـێ سـوهتم ژ فـەرقـێ سـەر حـەتـا پێـدا
خـەدەنگـا غـەفلـەتـێ نـوهتم ژ بـەرقـا لامعـا تێـدا
خـەدەنگـا فورقـەتـێ رەعـدە دلـێ ئـەو غـەفلـەتـێ لـێ دت
دبێـژم: وەر جـەبـەل بـت ئـەو بکـەربـت وێ د گـاڤێ دا[١]
هـەچـی فورقـەت نـەدی هجـران نـەبـێ مـن داغ وکـەی لێنـە
ژ بـل[٢] دەربـێ د هجرانـێ فراقـێ رووح و جـان کـێ دا
ژ هـەر بـێ داغ و بـێ دەردی مـە پورسـن محنـەتـا عـشقێ
چ زانـن بـێ خـەبـەر ژانـا دلـێ داغ و کـەسـەر تێـدا
کەسێ محنـەت دی و فورقـەت ڤـەخواری جورعـەیا هـەجرێ
گـری وان تـێ ب حـالـێ مـن دڤـێ هجـران و زەجـرێ دا
ب داما[٣] موجبەتێ بەندم خـەدەنگـا فورقـەتـێ دل نوهت[٤]
ب شوبهی مورغێ نیم بسمل دهـەڤ وەرتێم د خوونێ دا
برووسـکا بـاطـنی دا دل د پێتـێ سـینە وێ وەر بـوو
کـو دێ بێـتن تـەبێتـا دل[٥] د نـاڤ وێ نـار و پێتـێ دا؟!
ژ ئـولفێ شـوبهـەتـی زولفـێ مـەدام لـەو بـێ قـەرارم ئـەز
کـو جـانێ مـن عـەزیـز ئیـرۆ چـوو و دل وێ د ئـولفێ دا

(١) ئەڤ مالکە د دەستنڤیسا (پاشا)ی دا نە هاتییە.
(٢) ژ بەر (ئامەد).
(٣) ب بەندا (پاشا).
(٤) د قەیدا محنەت و دەردم (ئامەد).
(٥) ب تاب و لەرز و جانێ من (ئامەد).

ژ مـەحبـووب دووركـرم چـەرخـێ فـەلـەک وێ پـورِ هلاڤێـتم
نـزانم دێ ل كـوو دت مـن د ڤـێ دەوران و چـەرخـێ دا
حـەبيبـێ بـێ خـەطـا كوشـتم ب دەربـا فورقـەتـێ ئـاخر
ژ وێ رۆژێ دزانى مـن[1] كـو يـار ئـەو تيـر ل جـەرگـێ دا
گـەلـۆ ديـسا ببيـنم ئـەز چرايـێ وەصـلەتـێ هـل بـت
بسۆژم شـوبهى پـەروانـێ ل بـەر وێ نـوور و شـەوقـێ دا
ب دەربـێ كـەوكـەبـا صـوبحێ ل مـەشرق زوهـرە طـالع بـت
زوحەل دوور بت ب شەش بورجان و وندا بت د غەربێ دا
ژ قوندوس زوهرە پەيدا بت ژ هندس[2] موشـتەرى بێت دەر
سـپێدێ دت ڤـورەييـايێ شـەفـەق دت قامـەتـێ پێـدا
ژ شـەوقـێ ئـەبـرووان بنمێـت هـلال ديـسا د قـەوسـەينـان
ژ خاوەر بێتـە دەر خورشـيد[3] ظـەلام وەربـێ د نـوورێ دا
ب وەردان زەيينـين گولـشەن چـەمـەن[4] و لالـە بـشكفتن
بنەفش و چيچەكان ڤێكرا[5] شەفەق دا يەک د رەوضێ دا
سـەحـەرگـەهـ عـەندەليـب مـەستن ژ بهنـا وەرد و بـشكۆژان
شـبى تووتـاک وگۆيينـان دنـالين ئـەم د فـەرقـێ دا[6]

(١) ژ وێ رۆژێ بريندارم (ئامەد).
(٢) ژ سندێ زوهرە پەيدا بت ژ هندێ .. (حەلەب، وەستانى).
(٣) بێتە خورشيدى ( زڤنگى، عبدالسلام، حەلەب، وەستانى).
(٤) د چيمەن لالە (كۆڤلى) چمەن دا لالە (يووسفى) د باغا لالە بشكفتن (ئامەد).
(٥) بنەفش و چيچک و رەيحان (ئامەد).
(٦) وەكى بولبول دنالن ئەم د دەرد و هەجر وفەرقێ دا (ئامەد).

ل کـەلبـێ ئاسـتانێ خوە نـە پورسـی قـەط حـەبیـب جارەک
گـەلـۆ نائێنـە بیـرێ ئـەم دڤـێ نێچیـر و ڕاڤـێ[(١)] دا
دزانـم شـەهـسوارێ مـن غـەزالـەک وێ د فتراکـێ[(٢)]
ب[(٣)] جایی صەیدێ ئەز بووما د وێ فتراک و بەندێ دا
چ حـەد صـەیـدێ هـەزار جـانن د فتراکـا حـەبیبـێ مـن[(٤)]
کو سەد جەمشید و کەیخوسرەو غولامن سەر دەڤێ ڕێ دا
د مقـدارەک نـەظـەر مـن کـر ژ طـالع مـە نـەدی جارەک
ل من دلبەر خویا بت هەر نـەبوو جارەک د سالێ دا[(٥)]
د دەهـ سـالان مـولازم مـام ویـارێ ڕوو نـەدا جـارەک
وەگەر نە یار ئەگەر ڕوو دت هەیە جارەک د سالێ دا[(٦)]
دلـۆ مزگینـە مـن[(٧)] شـابە کـو سـولتانێ مـە دێ بێـتن
ژ مـن بـاوەر کـە پـەیغـامێ سـەحـەر مـزگین ب مـن پێـدا
شـوکور بیناهییـا مـن هـات و یـەعقـووب دیدە ڕەوشـەن بـوو
ب بوویـا یووسـفێ مـصری ل کـەنعـانێ بـەصـەر پـێ دا
نـەسـیمێ سـونبول و سێڤان سـەحـەر دا حـەبس و زنـدانێ
ڤـەبـوو قـوفلا مـە بـێ مفتـە زڕنگێنـی ژ قـوفلێ دا

(١) نەخچیر (پاشا) نێژیر و صەیدێ دا (ئامەد).
(٢) د فتراکە (ئامەد).
(٣) د (ئامەد).
(٤) چ حەددێ سەد هەزار جانان د فتراکا حەبیبا من (ئامەد).
(٥) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) دا ب تنێ هاتییە.
(٦) بەسە جارەک د حەیاتێ دا (ئامەد) ئەگەر یەک جار ڕوو دت یار بەسە ئەو جار د سالێ دا (حەلەب).
(٧) دلۆ مزگین ل تە (ئامەد).

فراقــێ شــەڤ ب ئــاخر چــوو سـپێدە کفـش بـوو دیـسا[1]

مـەریخـا نـەحـس ئاڤـابوو خویـا بـوو ڕۆژ د شـەرقـێ دا

د چەرخێ وەک نوجووم دێم دۆڕ[2] سەما هاتن قرانا یەک

هەییڤا بـەدر بـوو ئـەو سوڕپەری مـن دی د رەقـصێ دا[3]

ژ وادی ئـەیمـەنـێ دلبـەر نـزام ئـەنگوشـتەک ئظهـار کـر

کو خوەش ئەنوار و بەرقن ئەو تەجەللی بوون د طـووری دا

قرانـا زوهـرەیـێ مـن دی د بـەر عقـدا ثـورەییـایێ

ژ پـەروینـان دبێـژم عـەکـسە هێـژ کـەفتـی د جـامێ دا

حەبیبێ عـەزمـێ صوحبەت کر د جامـان لـەو شـەراب ئـانی

دلـێ مـن دی دو صـەییـادان ژ بوریـان ڕا بـەری وێ دا

ژ شـەکلـێ ئـەبـروویێن ساقی وە بـەدرەک مـن موقابـل دی

هلاتـن سـەد هـلال ئیـرۆ[4] ئـشارەت مـن ژ عـەکسێ دا

ب تـوولێن ئاسـتانێ ڕا ڤــەخـوەنـدم میــر ب دەرگــاهی

ب ڤی چاڤی حەبیب دیتم[5] شوکور ئەڤ شەفقە مـەولـێ دا

ب زەهرێ خوەی شەریف[6] خوەندم گۆ: خدمەتکارێ دێرینی

تە پوڕ جەور وجەفا دینە د سلووک وسـەعـی وجـەهدێ دا

---

(١) فراقێ شەڤ ب ئاخر چوو ل من هاتی وصال دیسا (ئامەد).
(٢) نوجووم دلبەر (ئامەد).
(٣) هەییڤا بەدرێ طالع بوو سوهەیل من دی د رەقصێ دا (ئامەد).
(٤) هلال ئەبروو (کۆڤلی).
(٥) حەبیب من دی (ئامەد).
(٦) شرین (حەلەب).

بچین[1] وەردان ژ گولزاران کو ئەغیاران ب دەست خارن
ژ مەخصووصان د دەرگاهی دوعا من ئەو د هەجرێ دا[2]
ب تەشریفا خوە ئەز خوەندم ژ لوطفێ بەندە نیشان کر
خەلات و شەفقە و دل دان شوکورخوازین کو باخوێ دا
مە هادر سەجدەیا شوکرێ ل وی عەردێ موقەددەس کر
ب موژگانێن خوە دورِ سوفتن ئەنی مالی ل عەردێ دا
هەیا بیناهییا چەهڤان بوت و عوززا و لاتێ من
تویی پێشبەر سوجوودا من سەحەرگاهان د خەلوێ دا
ل بال علمێ تە مەعلوومە ژ ژینێ من تو مەقصوودی
فدایێ جان مە دێ جان بت د قەستا وەصل ودینێ دا[3]
ب حوسنا خوەی ئلاهی کی[4] ب سەهم و هەیبەتێ دینێ
نوجووم وکەوکەب ولامع[5] ژ بالا تێن ب بەژنێ دا
ب خالێن وەرد و نەسرینان ژ قودرەت خەط کشاندی لێ[6]
ب تەرحا نێرگزا عێلی[7] سەحەرگاهان نەسیم لێدا
کو توولێ ئاستانێ دوور نەکی ئێدی ژ دەرگاهی
ژ باخوێ ڤێ رجوو ناکین د بابێ لوطف و رەحمێ دا

(١) بچین ئانەکو: بچینە، و ل نک (کۆڤلی) بچن، هاتییە، ئانکو بچنە. د گولزاران (ئامەد).
(٢) ژ مەخصووصانێ دەرگاهی دوعا من تو د هەجرێ دا (ئامەد).
(٣) فدائێ چەشمێ تە جان بت د سەعیا قورب و وەصلێ دا (ئامەد).
(٤) ب حوسنا خوە تو ئاگاهی (حەلەب).
(٥) کەوکەبێ لامع (زڤنگی، حەلەب).
(٦) ژ قودرەت نوقطە دا نینە (ئامەد).
(٧) نێرگزا شەهلا (ئامەد).

تـو بـارێ فورقـەتـێ زانـی دکـارم[1] ئـەز تـەحـەممـول کـم

ب نـارێ کـووهێ قـەنـديلم بـلا فـيلم[2] د عـشقێ دا[3]

زهـی دەردێ مـەزن فورقـەت جـەگـەر سـۆت ئاتـەشـی دا دل

جهێ صەبرێ نەما چەندان فـەرەج مـن دی د صـەبرێ دا

مـەلا بێ قامـەتا يـەکتـا قيامـەت[4] مـن ب چـەڤان دی

فراقـێ ڕووسـيا بـن تـە[5] ژ مـن جـانێ شـرين جـێ دا

(١) نکارم (ئامەد).

(٢) ب ناری گوهێ قەنديله (ئامەد) دياری کووهێ قەنديلم مەگەر (زڤنگی، ئامێدی) بلا قيلم (عبدالسلام، حەلەب).

(٣) ئەڤ مالکە ل نک وەستانی نينە.

(٤) قەبا يا (پاشا).

(٥) فراقا ڕووسيا ئيرۆ (ئامەد).

# سەرێ زولفا تە

سـەرێ زولفـا تـە ب کـوللابێ دوعـا
هاتـە دەستێ مـە ب جـەللابـێ دوعـا
صووفییێ خەلوە نشین بێن[1] د سوجوود[2]
هـەردو بـورهێن تـەنـە محرابـێ دوعـا
عـەرضـی کـێ[3] دێ بکـرم صـوورەتـێ حـال
کـو تـویی[4] قبلـەیـێ ئـەربـابێ دوعـا
ژ دوعـایێ قـەدەحـەک دەر دەسـتە[5]
هەر سەحەر سوننەتـێ مـەی نـابێ دوعـا[6]
گـولێ ئقبـالێ ژ گـولزارێ قـەبـوول
مە چنی بوو د شەکەر خوابێ[7] دوعـا
بـەر دو[8] بـورهێن تـە ژ ئخـلاص ویـەقـین
مـە د وێ سـەجـدەیـە ئـادابێ دوعـا[9]

(١) بیتە (عبدالسلام) نینە (ژڤنگی).
(٢) د سجوودێ (ئیسماعیل).
(٣) عەرضەکی (عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٤) عەرضێ حالێ خوە ب کێ عەرض بکم هەر تویی.. (ئامەد).
(٥) ب دوعا من قەدەحەک ئانی ڤەخوار (ئامەد).
(٦) مەستێ مەیێ (کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی، ئامەد) ناب ودوعا (وەستانی، حەلەب).
(٧) شوکر خوازێ (یووسفی).
(٨) هەردو (ئیسماعیل).
(٩) کو د وێ سەجدەیە ئەربابێ دوعا (وەستانی، حەلەب) مە دبر سەجدە ب ئادابێ دوعا (زڤنگی، ئامەد) مە وە دی سەجدە ب ئادابێ دوعا (ئیسماعیل).

ژ دلــەک صــافی تــو محرابــێ ببــین[1]

سـەجـدەیـەک لازمـە دەر بـابێ دوعـا

مـە ب دل (عـروە وثقـی) تـە د دەسـت[2]

ژ ثـەنایـا تـە سـەرئـەلقـابێ دوعـا

ژ ئــەزەل یــەک جهــەتــی دایــە مــەلــێ

هـەر مـە ئخلاصـە ژ ئـەسبابێ دوعـا

(١) ب دلەک صافی تو سەحەر بێی ببین (ئامەد).

(٢) م د دل عوروەتێ ووثقایە ب دەست (زڤنگی، ئامەد).

## ئیرۆ ژ دەربا خەنجەرێ

ئیـــرۆ ژ دەربـــا خـــەنجـــەرێ  لازم ب ئێـــــشانی مـــــەلا
تــــەشـــبیهی زولفـــا دلبـــەرێ  زانـــم پـــەریـــشانی مـــەلا

زانـــــم پـــــەریـــــشانی ژ دل  بـــێ حـــەد ب ئێـــشانی ژدل
تـــــەشـــــبیهی بریــــانی ژ دل  (باللـــە) نـــە ئنـــسانی مـــەلا

(باللـە) چ طــەبعــەت ئـادەمـی  یـەک سـەر دبـێم یـەک عالـەمـی
دەریـــایێ قـــاف و قـــولزەمـــی  یـان چـەرخـێ گـەردانـی مـەلا

یـا رەب چ وێ محنـەت کـەشـی  سـەر تـا قـەدەم تێـک ئاتـەشـی
مـەجرووحـێ قـەوسـێ تـۆزرِەشـی  لــەو دل ب پـەیکـانی مـەلا

زانـــــم ژ عـــــشقا دۆژەهـــــی  بـەحـرەک ژ نـارێ ئیلـەهـی[1]
ئیــرۆ ل مـــاهێ خـــەرگـــەهـــی  تــەشــبیهی سـەیـوانی مـەلا

ئـەڤ سـینەیـا وەک نـای ونـەی  پــورِ لــێ کــشاندن داغ وکــەی
هـەر دل ب نائـەهـلان نـە دەی[2]  یـــا رەب چ نـــادانی مــــەلا

دورِدانـــەیـــا دێـــم گـــەوهـــەرە  ئاییـنـــەیـــا ئـــەســـکەنـــدەرە
بـــێ مـــروەتـــان دل کـــر کـــەرە  مـــەجرووحـــێ خـالانی مـەلا[3]

---

(١) ئاسەهێ (یووسفی، عبدالسلام، وەستانی، زڤنگی، ئامەد).
(٢) هێ دل ب نائەهلان ددەی (زڤنگی، ئامێدی) ب نا ئەهلانێ دەی (ئامەد).
(٣) بێ مروەتێ کر سەد کەرە     ئاخر ب جانانی مەلا (ئامەد).

بــێ مــروەتــێ دل هــەررشــاند
تــەشـبيهى شيـشێ لــێ كـشاند
كەركر جەگەر خوێ[1] لـێ ڕەشاند
ئاتــەش ل ســەر دانــى مــەلا

نـــارێ ژ ڕەنگـــێ دۆژەهـــێ
حوســن و جــەمــالا وێ مــەهــێ
مـە د پـەردەيـا ڤـێ خـەرگـەهـێ
خــەف كــر چ عوممــانى مــەلا

ئيـرۆ ل عــومرێ خـوەى تـەلــەف
بــێ شــاهد و جامــا صــەدەف
بێ چـەنـگ و ساز ونـاى و دەف
زانـــم پـــەشـــێمانى مـــەلا

زانـم تــە كــووهێ طــووره دل[2]
لــەو هــەر ب نــار و نــووره دل
شــەهكاســەيــا فــەرفــووره دل
لـەو مـەسـت و سەكرانـى مـەلا

هــەر سـينەيـێ تـابى تـەمــام
ناپوختـە خـام بـێ مهـر و جـام
غــەرقــين د خوونــا دل مــەدام
لـــەعـــلا بــەدەخــشانى مـــەلا

پوڕ لـەعل و دوڕ تە ژ كلكێ عشق
ئانينـە نـەظـمـا سـلكێ عـشق
دەر بەرر و بـەحر و مـولكێ عشق
مـــەعلومـــە خاقـــانى مـــەلا

بێ حـەد ل قـەلبـێ شوبهى نـەى
جــەورا تــە دانــين داغ و كــەى
لەو بێ مەحەل[3] خوەش نينە مەى
ئـــەممـــا ب شـــێرانى مـــەلا

مننـەت ژ طـالع هـەر ژ بـەخـت
ئاصف ب تەخت و بەخت و ڕەخت
بەلقيس ئـەوى ئانى ب تـەخت[4]
ئيـــرۆ ســـولەيمـــانى مـــەلا

(١) خوون (پاشا).
(٢) زانم تە كو هەر گووره دل (پاشا، حەلەب).
(٣) حەمەل (يووسفى، زڤنگى، ئامێدى، عبدالسلام) يێ مەحەل (ئامەد).
(٤) ب وەخت (زڤنگى، ئامێدى).

ئـەو هـەردو لـەعـل وهـەردو وەشـم	گـەه گـەه ب نـاز وگـەه ب خـەشـم
ئـەو بـەژن و بـالا هاتـە چـەشـم	مـە د سـەیرێ ڕووحـانی مـەلا[1]

(١) د دانەیا (ئامەد) دا ئەڤ چارینە ب ڤی ڕەنگییە:
ئـەو هـەردو لـەعلێن موحتەشم	گەه گەه ب ناز و گەه ب خەشم
دیـسـا ئـەوی دی ب چـەشم	لـێ د سـەیـرێ رووحانی مەلا

# دل ژ من بر دلبەرەك

دل ژ مـــن بـــر دلبـــەرەک زيبـــا قـــەبـــا
چەهڤ غەزال و پورِ شەپال و مەهـ لقا
نـــازدارە ئـــەو ل تـــەختـــێ دلبـــەری
دلروبايـــە جـــان فـــەزايـــە رووح شـــفا
حـــووری عينـــە ئـــەز نـــزانم يـــا پـــەری
يـــا گولـــەک رِەعنـــا ژ[1] گـــولزارێ وەفـــا
يـا رەب ئـەو گولـدەستەیێ باغێ ئـرەم[2]
دوور نەبت[3] ژێ هەر سەحەر بادێ صەبا
سـۆرگولـەک مـن دی دگـولزارێ ب مـەش
لالـە و رِەيحـان ل سـەر تێنـە[4] سـەمـا
سـونبولێن رِەعنـا ل بـەر طـاقێ هـلال
وێ دکن سەعیێ ل سەر مـەروە و صـەفا
نازکـا مـــن هـــەر دەمـــا بێـــتن خـــرام
سەد هەزار دل وێ ل پەی هەڤ دەر قەفا

---

(١) د (ئامەد).
(٢) د ناڤبەرا بورجا بەلەک ورِوويبارێ دجلە دا باغـەکێ ب خـەمـل هـەبـوو دگـۆتنێ: (بـاغێ ئـرەم) جزيـری گـەلـەک جاران ناڤێ وی ئینایییە.
(٣) دوور نەکی (ئامەد).
(٤) هاتن (ئامەد).

ئـەز چ بێـژم کـو ل مـن لـەعلـێ د تـە
پوڕ کرن بێ حەد گـەلـەک جەور و جەفا
ئـەی مـەلا بـاوەر ب مـەحبووبـان مـەکـە
کارێ وان هەر ئەخذێ جانە بێ خەطـا[1]

(١) ئەڤ هەلبەستە ب تنێ ل نـک (زڤنگی، وئامێدی، وئامـەد) هـەیـە، وهـەژار ل وێ بـاوەرێیـە کـو ئـەو نـە یـا جزیرییە.

# (الله) سەحەر

(اللــە) ســەحــەرگاهــا ئــەزەل
يــەلمــوومێ عــشقێ شــوعله دا
نــوورا جــەمــالا (لــم يــزل)
ذاتــی تــەجــەللايــا خــوە دا[١]

ذاتـــی تــــەجـــەلــــلا دا ل ذات
بـــێ ئـــسم و ئاثـــار و صـــفات
ســــررا حـــورووفێن عاليـــات
خـەف بـوو د ستر[٢] و پـەردە دا

ذاتـەک[٣] موقـەددەس بـوو ووجـوود
جووشـش نـەدابـوو بـەحـرێ جـوود
وەصــــفێ ئــضافات و قويـــوود
يـــەک ژێ تـــەجـــەللايـــی نـــەدا

حوسن و جەمـالێ خوەست ئـەڤـين
ڤێـکـــرا د يـــەک ذاتـــی جڤـــين
نـوورا قـەديم بـوو عشق و ڤـين[٤]
وان پێکڤـــە نـــاز و عــشوە دا

عـــشقا ژ نـــوورا (لا يـــزال)
حوســن و جــەمــالا بــێ مثــال
ئيـساندی يـەلمـووم و شـەمـال[٥]
ديـسا خـوە لـێ پـەروانــە دا

عشق[٦] و مەحەببەت هەر هەبوو
حـەق عاشـقێ ذاتـێ خـوە بـوو
موحتـاجی حوسـنەک دی نـەبـوو
نــەقــل و روايــەت[٧] ژێ وە دا

---

(١) د هندەک ژێدەران دا پارچا دووێ و چارێ ژ ڤێ چارينەيێ پێک دگوهارتينە.
(٢) خەف بوون د سر (ئامەد).
(٣) حوسنەک (ئامەد).
(٤) حوسن و ڤين (ئامەد).
(٥) دانی د موومێ دا شەمال (پاشا، يووسفی، عەمەر، کۆڤلی، ئامەد).
(٦) حوسن (ئامەد).
(٧) نەقلێ روايەت (ئامەد).

بورهانێ عەقل دوورکر[1] قیاس ئیسمێ کەمالاتێ د خاص
ئەووەل ئیلاهی[2] پێ بناس ڤێ نووری ئەو پەرتەو ڤەدا

ئەو نوورە دا بوو شەوق و تاڤ عالەم خویا بوو هەم د ناڤ
بەرقێن خوە ئاڤێتن بەلاڤ ڕەنگ ڕەنگە ئەو نوور بەرقە دا[3]

سوبحان ژ ڕەمزا خالقی نوورا سپێدا صادقی
ئاڤێتە قەلبێ عاشقی لەرزین و تا و جەذبە دا[4]

مەعنایێ عشقێ بێم: چییە؟ لەو من ب چەشمێ دل دییە
عەکسا جەمالەک صافییە ظاهر د مرئاتا مە دا

حوسن و مەحەببەت ذاتەکن مەعشووق و عاشق لاتەکن
ل صوورەت و مرئاتەکن هەر یەک د مەعنایا خوە دا

گەر دلبەر و گەر عاشقن عارف د ڤێدا[5] صادقن
ئایینەیێ نوورا حەقن جی جی د وان دا جەلوە دا

عاشق ئەوە مەعشووق ئەوە ظاهر ئەوە موظهر ئەوە
رووح هەر ئەوە گەوهەر ئەوە د هەر شاهدەک دا شوعلە دا

د هەر شاهدەک دا دێم ژ دوڕ پوڕ نازدار و رەمز و سوڕ
خەططێ غوباری نوقطە پوڕ کاتب ژ بالا نەسخە دا

---

(١) ئەو کر (ئامەد).
(٢) ئەلیفێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) ڕەنگ ڕەنگێ بەرق و لەمعە دا (ئامەد).
(٤) لەرزین و تاب و هەیبە دا (کۆڤلی).
(٥) د قەیدا (ئامەد).

حەرفێن كشاندى كاتبى		نوورا د رووح و قالبى
يەك يەك ب ئسمێ واهبى		ئعراب و جەزم و نوقطە دا

نوورن ژ سەر حەتتا قەدەم		نەققاشێ سەرمەشقێ قدەم
پێ زەيينانە لەوحێ عەدەم		يەك يەك د وان دا چەشنە دا

ئەو شەكل و صوورەت صەوورين		ئەصلن[1] ل بالا زەيينين
نسبەت ب وان ئەم سايەيين[2]		تەرتيبێ خەللاقى وە دا

عالەم ب عالەم ئەو نەسەق		بوو ئايينە[3] ئەسمائێ حەق
نوورا تەجەللايا تەتەق		عەكسێ جەمالەك[4] سادە دا

هەر هەيئەتا رووح لێ و جسم		شەكلێ كو لێ دانى طلسم
هەر يەك ژ يەك را بوو ئسم		لەو حەرف حەرف ئەندازە دا

ئەم تێك هوويياتين يەقين		ئسمين ژ مەصدەر موشتەقين
مەوهووم و لاشەىء موطلەقين		عەكسين د نێڤ ئايينە دا

پەرتەو ژ عەينى نوورەكێ		تێن تێن تەجەللا طوورەكێ
ئەو سەر ددت يەك فوورەكێ		لەو چەندى لەب لەب قەطرە دا[5]

ئەو شاهدێ زەررين ژ عەيب[6]		هەر جەلوەيەك دايى ژ[7] غەيب

---

(١) ئەصلان (كۆڤلى) ئەصلەن (ئامەد).
(٢) سافلين (ئامەد).
(٣) ئايينا (ئامەد).
(٤) خەيالەك (زڤنگى، ئامێدى).
(٥) ئەڤ چارينە ل نك (كۆڤلى) نينە.
(٦) دوورە ژ عەيب (ئامەد).
(٧) د (ئامەد).

ڤـێ عالـەمـێ ئـەو تێتـە جـەیـب دیـــسا ژ وێ ڕەونـــەق ڤـــەدا[1]

ڕەنـگ ڕەنگـێ حوسـنا صـوورەتـان نـــەقـش و نگــارێن دەســخەتــان
بـــالا و بــــەژن و قامــــەتـــان نــازک لـــەبـــان[2] پـــوڕ خـــەنـــدە دا

شـێرین لـەبـێن قـەد نـەی شـەکـەر سـیمین بـەرێـن نـازک بـەشـەر[3]
زولفـــان ســـتار بـــوو ڕۆژ د بـــەر بـــسکان ل مـــسکێ طـــەعنـــە دا

گولـدەســتـەیـێن نـوورین قـــەدەم دەســتان ژ ئـــەنگوشــتان قـــەلـــەم
ئـــەو لالـــــەیــــێ بـــاغێ ئـــرەم مــــاوەر ل زولفـــــان[4] ژالـــــە دا

هــن ئــەســـمەرن هـــن دێـــم زەری مـەهـ پـەیکـەرن سـوڕ موشـتەری
ولـــدان و حـــوور و ئـــەو[5] پـــەری مـــن دی د لبـــسێ جامـــە[6] دا

چـەنـدی کـو خـەمـل و ڕەونـەقـن تـــەزیینـــێ حوســـنا موطلـــەقـــن
تێــک جلــوەیــێ نــوورا حــەقــن عـــشقا ئـــەزەل[7] پـــێ شـــیوە دا

حوســـنا مونـــەززەهـ بـــێ نـــشان وی لـــێ نقیـــسی زەرکـــەشـــان
خـال وخـەطـێن عـەنبـەر فـەشـان هــەر کــەس ب وان دل یــەغمــە دا

داروویــــــێ حوســــــنا دلبــــــەران ب خـــەمـــل و لبـــاس و زیـــوەران
بێتــــە شــــوهوودا بــــەصــــەران بیناهییـــــە د هـــــەر دیـــــدە دا

(١) دیسا ل ها ئەو جلوە دا (ئامەد).
(٢) نازک لەبا (ئامەد).
(٣) نازک قەدێن سیمین بەشەر (ئامەد).
(٤) ل بەلگان (ژڤنگی، ئامێدی، ئامەد).
(٥) ولدان و حوورن ئەو (ئامەد).
(٦) د لبس و جامە (ئامەد).
(٧) حوسنا ئەزەل (ئامەد).

بێـتن د حوسـنێ ڕەنـگ ڕەنـگ
ب ناى و دەف و قانوون و چەنـگ
ئـەو عـشقە ڤـان تينـت ب دەنـگ
لـەورا ب حوسـنێ نـەغمـە دا[1]

سـرا كـەلامـێ ئـەقـدەسـى
دەم دەم د لبـسێ ئـەنفـەسـى
تێـتن تـەنـەززول بـێ حـەسـى[2]
نە ب گوفت و گۆ بـوو قصصە دا

وە دڤـێ كـو عوشـشاقن هـەبـن
دلـدار و موشـتاقن هـەبـن
وێ شـەمـسێ ئافـاقن هـەبـن
دا كفـش ببـت د سـپێدە دا

دا كفـش بـبن كـەوكـەب ژ چـەرخ
ڕابن هـەزار مـەعـرووف ژ كـەرخ[3]
شبلى و سەعدى و ئالى فـەرخ[4]
عـشقێ د وان كـەشـفا خـوە دا

دا حوسـن و حوبـب ومـەظهـەران
كفش كـن[5] ل هـەر عـەرد و دەران
عاشـق بخـوونن دەفتـەران
دلبـەر مـەحـەببـەت نامـە دا

---

(١) يەغمە (كۆڤلى).

(٢) پێ حەسى (كۆڤلى).

(٣) شێخ مەعرووف كوڕێ فەيرۆزێ كەرخييە، ئێك ژ مەزنترين زاهدێن بەغدا بوو، دەيك وبابێن وى فەلە بوون، وئەو ل سەر دەستێ عەلييێ كوڕێ مووسايێ رضا هاتبوو د ئيسلامێ دا، گەلەك زانايێن مەزن ژ وى فێرى زانينێ وزوهدێ بووينە وەكى ئيمام ئەحمەد ويەحيايێ كوڕێ مەعينى.. ل سالا (٢٠١) مشەختى بەغدا مربوو، وگۆڕا وى ل تاخێ (كەرخ) ل بەغدا يا ناڤدارە.

(٤) **شبلى:** ئەبوو بەكرێ شبلييە، ناڤێ وى جەعفەرێ كوڕێ يوونسە، خەلكێ خەراسانێ بوو، بەلێ ل بەغدا هاتييە سەر دنيايێ و ل وێرێ مرييە ل سالا (٣٣٤) مشەختى، ژ هەڤالێن شێخ جونەيدێ بەغدادى بوو، وئێك ژ زاهدێن ناڤدارە. **سەعدى:** سەعدييێ شيرازييە شاعرێ فورسێ يێ ناڤدار، ناڤێ وى (مشرف الدين) كوڕێ (مصلح الدين)ە، خودانێ بوستان وگولستان وكوللياتييە، ل سالا (٦٩١) مشەختى مربوو. **وئالى فەرخ:** مەخسەد پێ شاعرێ مەزن فرخييە، ناڤێ وى يێ دورست عەلييێ كوڕێ جۆلۆغێ سەجستانييە، ئێك ژ مەزنترين شاعرێن فورسێ بوو ل سەر دەمێ غەزنەوييان، ديوانا وى يا شعرێ وكتێبا وى (ترجمان البلاغة) د ناڤدارن، ل سالا (٤٢٩) مشەختى مربوو.

(٥) كفش بن (ئامەد).

حوسـن و جـەمـال و عـشقەیـە		ئـارام دپـەردەی دا نـەیـە
مـەحبـووب لـەو حـەتتـا هـەیـە		نابـت د پـەردە و خلـوە دا[1]

مـەحبـووب و خـووب و دلبـەران		بگـری ل وان هـەفتـێ دەران
دێ خـوە ژ شـوبباک و پـەنجـەران		ظـاهر بکـن د هـەر دیـدە[2] دا

ئـەو لالـەیـێ ژ گـول تـازە تـەر		فـەصـلا بوهـارێ بێتـە سـەر[3]
جـی جـی ب هـەڤـڕا تێنـە دەر		خـوەش خـوەش د عـەردێ خـارە دا

رەمـزەک غـەریبـێ فـاطری[4]		پـەیـدا ببـت نێـڤ خـاطری
قـووەت تـە نیـنن ڕاگـری		خـەف کی د نێڤ قـەلبێ خـوە دا

مـەفهـووم کـو بـوو مـەعلـووم د دل		زیـوەر بـدێ[5] تـێ سـەد عـەمـل
بینـت لباسـەک پـوڕ خـەمـل		هنـدی کـو سـەعـی و جـەهـدە دا

لـەفـظ و عبـارەت جامـەیـە		مـەحبـووب مـەعنـا ب خـوەیـە
لـێ خـەمـل و حوسـنەک زێـدەیـە		لـەورا ب حوسـنێ زیبـە دا[6]

من ئەڤ مثـال لـەو بـۆ تـە بـەست		زۆران[7] ب زولفـان دل ڤـەبـەست

---

(١) ئەڤ چارینە ل نک (کۆڤلی) نینە. و د دانەیا (ئامەد) دا ب ڤی رەنگییە:

حوسن و جەمال و عشقەهە		ئـارام د پـەردێ دا نـەهە
مەحبووبێ لەو حەتتا نەهە		نـاکـن د پەردەو و جلوە دا

(٢) عەردە (زڤنگی، ئامێدی).

(٣) فەصلێ بوهار ئەر بێتە سەر (ئامەد) فەصلێ بوهار کو بێتە دەر (کۆڤلی).

(٤) غەریب و فاطری (زڤنگی، ئامێدی، کۆڤلی).

(٥) زۆرێ بدی (ئامەد).

(٦) لەورا ل حوسنێ زێدە دا (ئامەد).

(٧) زووار (ئامەد).

هـەر چ تـە دى صـوورەت پـەرەست 		دورێ يـــەتـــيم بـــێ فـــەيـــدە دا

پـيس و خـەراب و زشـت و عـار 		مـا ئـەو ب خـەملـێ تێنـە كـار
ئـێ د قـەيـدێ لبسـێ نـەديـە يـار 		حـوبێ ب خـوە داڤـێ نـە دا[1]

چــارێ هلـــين يـــارێ ببـــين 		نـــە پـــەردەيـــا[2] تـــارى ببـــين
ســەد جـارى ئـەو كـارى ببـين 		گـــول وێ دنێڤـــا بوغچـــە دا[3]

ئـــەو بـــوو مـــورادا كردگـــار 		لـــەو كـــر ئـــرادە و ئختيـــار
ڤـێ بوغچـەيـێ هـەر لـێ بوهـار 		گـول گـەش د بـاغێ غونچـەدا[4]

بـــايێ ئـــەڤينـــێ كـــو لڤـــى 		هـــاتن ل ســـەر زولفـــان چڤـــى
هـــەر دەم هـــەزار دل داكـــەڤـــى 		خـــالان د دامـــــێ دانـــــە دا

بـەحـرا ووجـوودێ جـووش[5] هـات 		نـــوورەک تـــەنـــەززول بـــوو ژ ذات
هـاتن تـەعـەيـيون هـەر صـفات[6] 		ئـــەشـــيا ظـوهـــوور علمييـــە دا

ئـەشـيا د علمـى بـوون ظـوهـور 		ئـسمان ژفـەيـضا ئـسمێ نـوور
تـەقـويم بـەسـتن بـێ قوصـوور 		حـــوكمێ صـــفاتێ ســـەبعـــە دا

ڤـێ عالـەمـێ تـەقـويم بـەسـت 		هـەر ئـسمەكى فعلا خوە خوەست
حوكمێ تەصەرروف[7] دا ب دەست 		هـــەر وێ د مـــولكێ قـــەبـــضە دا

---

(١) ئێ قەيدێ لبسێ نەديە نار 	حوبێ ب خوە د ئاڤێ نەدا (ئامەد).
(٢) نە د پەردەيا (زڤنگى).
(٣) ئەڤ هەر پێنج چارينەيێن دويماهييێ ل نک (كۆڤلى) نينن.
(٤) ڤى بەغچەئێ هەر گول هەزار 	گەش بن د پشک و غەنچە دا (ئامەد).
(٥) خۆش (كۆڤلى).
(٦) تێ صفات (ئامەد).
(٧) حوكم و تەصەرروف (كۆڤلى).

ئـەعـراض و عـەیـن و جـەوهـەران واحـد ژ ئـەصـلێ مـەصـدەران[1]
تـەئثیـر بـەخـشێ[2] مـەظـهـەران سـەد ڕەنگـى، حـەرفـان صـیغە دا

فـــەیـــضا حـــورووفێن عالیـــات بـــەحثـــا ســـوطوورێن ســـافلات
ئایـات و وەصـفێن موحکـەمـات تـــەرتیبـــێ عوشـــر و ســـوورە دا

کاتـــب نقیـــسین ئـــەو حـــورووف هـەر طـالبـەک پـێ بـوو ووقـووف
هـاتن ژ دل سـەد ئـاه و ئـووف[3] سـەرخـەط ل لـەوحـێ سـادە دا

ئـەو دەسـخەطـێ کاتـب صـەمـەد واحـد ل سـەر لـەوحـا ئـەحـەد
نـەقـشەک ڕەشـاندى بـێ عـەدەد جـەعـدا جـەمـالێ شـانە دا

ئـــەســـما د کامـــل ڕاس کـــرن جـە جـە قـەوائیـل ڕاس کـرن
بـــالا فـــەواعـــل ڕاس کـــرن ژێ عللـــەتـــەک صـــوورییە دا[4]

ئـــەســـما موقابـــل بوونـــە زەوج لێ جوملە ژێ بوون فەوج فەوج[5]
بـەحـرا ووجـوودێ هاتـە مـەوج مـەوجـان د بـەحـرێ لوججـە دا

جووشـش کـو دا دەریـایێ جـوود د ئایینـــەیـــا ئـــسمێ وەدوود[6]
جـارەک تـەجـەللابـوو ووجـوود نـــوورەک ژ نـــوورێ ژێ ڤـــەدا

---

(١) ئەعراضێ عەینێ جەوهەران    واحد ژ وەصلا مەصدەران (کۆڤلى).
(٢) ب حوسنێ (کۆڤلى).
(٣) هاتن ژ دل ئاهـ سەد ئولووف (ئامەد).
(٤) د دانەیا (زڤنگى) دا ب ڤى ڕەنگییە:
ئەسما تەکامول ڕاست کرن    بالا فـەواعـل ڕاست کرن
جهـ جهـ قەوابل ڕاست کرن    ژێ عللەتەک صوورییە دا
(٥) دا جوملە ژێ بن فەوج فەوج (ئامەد).
(٦) دا ئایەتا ئسمى وروود (کۆڤلى).

فوورەک ژ نوورێ وی[1] ڤەکر　　　گەنجا ظوهوورێ پێ ڤەکر
کەنزا خوە قوفل و مفتە کر　　　هێژ وێ د قوفل و مفتە دا

حوسنەک مونەززەه صەووراند　　　نوورا حەبیب ژێ ئافراند
عالەم د کونهێ حەییراند　　　(روح القدس) جان نەفخە دا[2]

عەرشێ جهات لێ بوو حەیات　　　ئەو شاهدێ قودسی صفات
ژێ بوو تەعەییون نوورێ ذات　　　سەیوانێ شەوقێ هالە دا

عشقا ژ حوسنێ صەووری[3]　　　غارەت کرن حوور و پەری
هەرچی د کونهێ فەککری　　　ئەو ما د عەجز و حیرە دا

ئەو صوورەتێ مرئاتێ حوسن　　　ژێ بوو ظوهوور ئایاتێ حوسن
لێ بوو تەجەللا ذاتێ حوسن　　　ڤێ حوسنێ ئەو سەرچەشمە دا

سەرچەشمەیا حوسنێ ئەوە　　　خورشید و عالەم پەرتەوە
گەهـ بەدرە گەهـ ماهێ نەوە　　　وەر[4] موشتەری یان زوهرە دا

ولدان و حوورن گەر پەری　　　شیرین و مەحبووبێن بەری
جوملە ژ حوسنا خاوەری　　　نوورێ دوان یەک ذەررە دا

نارێ ژ نوورا ئەحمەدی　　　سررا صفاتێ سەرمەدی
د ئایینەیا ذاتێ خوە دی　　　کەشفا کەمالاتێ خوە دا

(١) ژێ (ئامەد) نوورەک ژ نوورێ وێ ڤەکر (کۆڤلی).
(٢) یەغمە دا (ئامەد، کۆڤلی).
(٣) راکری (کۆڤلی).
(٤) لێ (ئامەد).

ئەو بوو قەلەم ئەو بوو عەقل    لەو بێ حەديثێ[1] دا نەقل
دەريايێ علمی كر شوغول    تەفصيلێ علمی جوملە دا

ئەو بوو د جوملە رابطە    ميزان و ئسمێ باسطە
فەيضا حەق ئەو بوو واسطە[2]    چەشمێ ووجوودێ سورمە دا

يەک بوو ئەليف وێ نوقطە كر    چەندی شەكل لێ زێدە كر
هەردەم پەياپەی صفرە كر    بالا ب بالا روتبە دا

واحد ژ نوورا وێ دوڕێ    پەيمانەئێ جاما سوڕێ
مەی خستی ئانی بەر فڕێ    هەم جام و هەم پەيمانە دا

غەيب و مثالن[3] هەر دو سلک    پەيوەستە ئانی ميمێ مولک
ئەو كاتبێ ئەلماسی كلک    ژ وی خامەيی ئەڤ ڕەشحە دا

نوورا تەجەللا هاتە عەرش    ئەسما حەمی لێ[4] بوونە نەقش
شەوقا د وان چوو تا ب فەرش    ئسمان ب ذاتی[5] سەجدە دا

كاتب قەلەم ديسا گەڕاند    ئسمەک ژ ئسمان صەووراند
كورسی ژ نوورێ ئافراند    جەنناتێ خولد و سدرە دا

سەر چەشمەيا ڤێ دۆزەخێ    بەحرا جەمالێ دا ڕەخێ[6]

---

(١) حودووثێ (كۆڤلی).
(٢) فەيضا ژ حەق بوو واسطە (ئامەد).
(٣) غەيبێ مثالن (كۆڤلی).
(٤) ئەسمان حەمی پێ (ئامەد).
(٥) ئەسمان ژ ذات ڕە (ئامەد).
(٦) سەرچەشمەيا ڤێ بەرزەخێ    بەحرا جەمەد دابوو رەخێ (زڤنگی، كۆڤلی).

فــەیــضەک ژ نــوورا بــەرزەخــێ  داگـرت و گـەهـ گـەهـ فـووره دا

ئــەو بــەرزەخــا ڕەنــگ ئایینــە  هنگــی کــو ئــەشــیا داییـنــە
وان تــێ شــەمــال ئیــساییـنه  ژێ صــوورەتــەک عــەکـسیيه دا

وەصــف و کــەمــالاتێن سـوبووح  حـەرفـێن کتابـا عـەقـل و ڕووح
ئـسمەک دڤـێ لـێ بـن ووضـووح  لـەو لـەوح وکلـک وخامـە دا[1]

ئــەو نوســخەیــا عــالی ئــسم  لــەوحــەک دڤــێ ژێــڕا جــسم
دا حــەرف لــێ بــن مورتــەسـم  حــەرفــان شــەکــل نووریيــە دا

لـەفظـێ کـو مـەعنایـەک دڤـێ  تــەرکیبــێ ئملایــەک دڤــێ
صــوورەت هــەیوولایــەک دڤــێ  ڕووحــان دنــەفــسێ جوثــە دا

مــا تێنــە دیـتن حوسـن و سـوڕ  بــێ بــەژن و بــالایێن ژ دوڕ
کاتــب ژ وان حــەرفــێن د پـوڕ  نوونـەک خـەیـالی بـەصـمە دا[2]

دوڕدانــەیــێن خــاوەر مثــال  ئایینــەیــێن تێــدا شــەمــال
نــوورەک مونـەززەهـ ئـەو جـەمـال  مــەی کــر د[3] نێڤـا شووشــە دا

ڕووحــانییێن[4] قودســی مثــال  تێنــە لباســێ خـەطــط و خــال
ســاقی مــەیـا گولگـوون و ئـال  تینــــت د فنجانــــا مــــە دا

مــەی کـو د جـامێ بێتـە نـووش  بێ دەنگ و صەوت هەر تێتە گووش[5]

---

(١) ئەڤ چارینە ل نک (کۆڤلی) نینە.
(٢) تێ نە دا (ئامەد، کۆڤلی).
(٣) مەی بێتە (ئامەد) مەیکوون (کۆڤلی).
(٤) رووحان دبن (کۆڤلی).
(٥) مەی کو ژ جامێ بێتە نووش   دەنگێ کەلام ماتێتە گووش (ئامەد).

ژێ تێتـه دل هـەردەم سـوروش[1] لــەو ئــەڤ شــەراب ئــالـوودە دا

ئـەڤ ڕەنـگ تـەجـەلـلا کـر سوبووح ســاقی ژ شــەهکاســا فوتــووح
مـەی ڕێـتـه جاما عـەقل و ڕووح ڕۆژ بــوو دقــەوســێ قوبـبــه دا

ڕۆژ بــوو د نێڤــا نــەینکــێ کاتــب ژ حــەرفــێ عــەینکــێ
نێــڤ گۆشــەیـا قــەوسـەینکـێ طــوغرا ب ئــسمەک تــازە دا

طـەی کـر دنێـڤ طـوغرایێ ئـسم تـەکثیـر ژ حـەرفـان کـر طلـسم
حوسـنا موقــەددەس بـوو دو قـسم حــوکمێ تــەجــەللایــێ وە[2] دا

یەک عـەقل و ڕووحێ ئـەعظـەمـه مــصباح و نــوورا عالــەمــه
حــەوواء و نــەقــشێ ئــادەمــه بــێ مــوددە هــەم بــێ مــاددە دا

ئــێ دی کــو نــەفــسا کوللییــه حوسـنـەک مونـەززەهـ[3] عالییـه
ئــەوژی ب ڕووح ڕا ئــەصــلییه وان هــەر د هــەڤ دا ســایه دا

ئایینــەیــێ ذاتــێ یــەکــن لــەو دلبــەر و لاتــێ یــەکــن
ڤێکــرا د مرئــاتێ یــەکــن هــەمتــا[4] د نــاز و عــشوە دا

ئەو تێن ب جەمعێ فرع و ئـەصل مائــل دبــن ڤێکــرا ب وەصــل
نــابن ژ یــەک فــەرق و فــەصــل حــوکمێ وصــالێ لــێ[5] وە دا

ڤێکـرا کـو بـوون وەصـل و جـەمع بــارین ژ مابــەینــێ لــەمــع

---

(١) خورۆش (ئامەد).
(٢) ڤە (ئامەد).
(٣) موقەددەس (ئامەد).
(٤) هەمیان (ئامەد).
(٥) تێ (ئامەد).

ئیـــسا ژ ئــەرواحـــان شـــەمـــع    شــەمعـــا نوفووســـان شـــوعله دا

ئیـــسا ژ ئـــەرواحـــان قـــەبـــەس    پـورِ شـوعلەتـێن نـوورین قـەفـەس
نـەفـسان ب عـشقێ دا نـەفـەس    قــەلبــان ب حــوبێ لــەهجـه دا

ئـەو لاتـێ حوسن و عـەینێ نـوور    صوورەت ب صوورەت تێن ظوهوور
ئــنس و پــەری ولــدان و حـــوور    جـــی جـــی د  وان دا جلـــوه دا

هـەر یـەک ژ فـەیچـضا ئـسمەکـێ    تــێن صـــوورەتــا طللــسمەکــێ
لـەو مـەعنـەیـا هـەر جـسمەکـێ    پـــەرتـــەو ژ نـــوورێ لـــێ ڤـــەدا

دا ســـــرِێ تـــــەولیـــــدێ ببـــێم    نــه ژ وەهــم و تــەقلیـدێ ببـێم
مـــەعنـــا ژ تـــەوحیـــدێ ببـــێم    دل ڤـــێ ئـــەدائـــێ شـــەهـــده دا

مـەعـشووق و عاشـق هـەر دو لات    مـەجـذووبێ یـەک دێ بـن صـفات
حینــا کــو بـــوو یــەک ئلتفــات    بــەعــضەک صـفاتان حصـصه دا

(...ضـع) حـەرفـێ بـوو طلـسم    لەو هات تەعەییون شەخصێ ئسم
ســەر وا لباســێ رووح و جـــسم    شــەکلــێ ئــەحــادی صــفره دا[1]

هـــای و هوویـــا ســـوبووحییان    رەقـــص و ســـەمایـــا  قودســـییان
تــەشـــبیهی جووشـــا صـــووفییان    فـــەریـــاد و ذکـــر و لــــەرزه دا

وەستانه شاهد[2] صـەف صـەفـن    بـاطـن د غـەیبـێ خـەف خـەفـن[3]
تـــەشـــبیهی بـــەرقـــا خـــاطفن    لامـــع د چـــەرخـــێ تـــسعه دا

(١) ئەڤ چارینە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هاتییە، وپەیڤا سەری یا هاتییە برِین.
(٢) شاخص (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).
(٣) باطن د عەینێ دا خەفن (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).

ســـــڕڕا د جامـــا بـــادەیـــێ
مـەدهـووش و مـەستێ وێ مـەیـێ

یـــار هاتــە نیڤـا حــەلقــەیـــێ
شووشـــا گـــولاڤ ئاشـــوفتە دا[1]

ڕەمـــزا د جامـــا شـــەربـــەتـــێ
هــەر چــی کــو فنجــانێ دەتـــێ

خــەف تێتــە نێڤـا صـوحبەتـــێ
وی جـان ب نــەذر و صــەدقــە دا

شـەمعـا وصـالێ هـەر گـەشـە
مــەی تێتــە جـامێ بـێ غـەشـە

شــەوقــا شــەمــالێ ئاتــەشــە
سـاقی عـەجـەب ئـەڤ بـادە دا

ساقی عـەجـەب ئـەڤ بـادە ڕێـت
فنجــان ب فنجـــان دا و مێـــت

عاشق ژ مـەعـشووق ئـەڤ دڤێـت
کامـــا دلــــێ بـــێ چـــارە دا

ئــەشـیا ل پــەی هــەڤ وەللــدین
هـەم مـەصـدەریـن هـەم مـەوردیـن

یــەک یــەک ژ وەصـلێ بـەددیـن
ڤــێ قــولزەمــێ ئــەو ڕەشــحە دا

ئــەڤ ڕەشــحە دا وێ قــولزەمــێ
جامـا جـەهـان بـین دا جـەمـێ

مــەی هاتــە طاسـا عالـــەمـــێ
ب ئـــەســـکەنـــدەری ئایینـــە دا

عــەکـسا ژ حوسـنا مـەی فـرۆش
ناگـەهــ د جامـان هاتــە جـووش

ئاڤێتــە فنجــانێن ب پـــووش[2]
فـــــووری د نێڤــــا کـــــووزە دا

ســـــاقی ژ ڕەنگــــێ بولبولــــە
ڕووحـــــــان ل دۆرێ سلـــــــسلە

ئاڤێتـــە چـــەرخـــێ غولغولـــە
گۆڤـەنـد و ڕەقـص و حـەلقـە دا

مـەحبـووب خـوە نیـشاندا صـەفـێ
هـــــاتن ب ئــــاوازێ دەفـــــێ

جــارەک د جامــا قــەرقــەفـــێ
طـەنبـوور و چـەنگـێ نـەغمـە دا

---

(١) شاش و کولاه ئاشوفتەدا (زڤنگی، ئامێدی).
(٢) ئاڤێتە فنجانا ب نووش (ئامەد).

عـەينـى گطـەبيعـەت جوزء و كـول
بــشكفت د وى بــاغـى دو گـــول
عــشقێ گـەڕانـدى جـامێ مـول
حوســـنێ د وان دا پـــەنجـــە دا

بـەرزەخ ب بـەرزەخ بوونـە ڕاسـت
نيـنن د نێـڤ دا كـێم و كاسـت
مـەنـزل ب مـەنـزل هـەر گوهاسـت
دورجـــێ لوئـــالى حوققـــە دا[١]

ئاڤێتـــــە دوڕدانـــــا خـــــوە دوڕ
ئيـساند ژ مـصباحا خـوە سـوڕ[٢]
دۆلابـێ نـەجمـێ نـەحس و كـوڕ
مهـــرا ســـتێرا ســـەعـــدە دا[٣]

چـەوگـانێ بـايێ لامـەكـان[٤]
فولكـا فـەلـەک قـائم سـەكـان
تـەشـبيهى گـۆ دا بـەر شـەكـان
هـەر بـێ سـوكوون و سـەكنـە دا

ئـەو كـاملێ بـێ عـەيـب ونـەقـص
نەهـ چەرخ[٥] ب هەر يەک نەوع وشەخص
وى يـەک ب يـەک ئانينـە ڕەقـص
تـێ[٦] سـەبعـەيـێ سـەييـارە دا

هـەر نـەهـ د ڤـێ چـەرخ و لـەزێ
چـــەرخـــن ل دۆرا مـــەركـــەزێ
بـەحـرا دو عالـەم لـێ كـەزێ[٧]
تـێ ئـەڤ حـەبـاب سـەرگـەشـتە دا

بـــەحـــرا دو عالـــەم لـــێ زەبـــەد
مـەوج و حـەبـابن هـن جـەمـەد
پـەيـوەسـتە تێـتن جـەزر و مـەد
ســەيــوان ل صــەحرايــێ ڤــەدا

---

(١) حەتتا كو دوڕ چوو حوققە دا (زڤنگى، ئامێدى).
(٢) دانى د مصباحا خوە پوڕ (ئامەد).
(٣) مهرێ ستێرێن سەبعە دا (ئامەد).
(٤) چوو بايێ كەون و لا مەكان (ئامەد).
(٥) چەرخێن (زڤنگى، ئامێدى).
(٦) ڤێ (ئامەد).
(٧) دزێ (كۆڤلى).

ئەو خەیڤەتا کەوکەب مثال[1]     گەهـ بەدر ومەهـ لێ گەهـ هلال
سێزدە دوازدە ماه و سال     چەرخن د سەیرا تسعە دا

من دل ژ فەهمێ قاصرە     ژ وێ[2] صوورەتێ چارپا کرە
پێ کر تەمام ئەو دائرە     نەقشەک ژ وێ تەروەندە دا

یەک یەک ژ تەقویما قەدیم     لێ بوو نەسەق حوکمێ حەکیم
ئاڤێتە وی لەوحێ رەقیم     ئەو عالەما سوفلییە دا[3]

هنگی کو خەطط ونوقطەنە     ئەوضاع و ئەشکال تێ هەنە
هەر یەک ب مقدارێ خوەنە     ئەصلا تەصەوور رێ[4] نە دا

مقدار و شەکلێ هەندەسی     کێم زێدە یەک پێ ناحەسی
تەصویر دکر ئەقلیدەسی     حەتتا د سەطحێ سوفلە دا

مەصرەف د ناڤ ڤان مەشعەلان     قەطعا مەسافا مەرحەلان
سررا بورووج و مەنزلان     رەسما سولووکێ جاددە دا[5]

ئەو یەک ب یەک خالی نەهن     بێ حکمەتەک عالی نەهن
گەر ڤان سورەک حالی نەهن     رەقصەک چرا مەستانە دا؟

مەستانە گۆڤەندێ دکن     رەقصێ ل دۆر فەندێ دکن
قەستا شەکەرخەندێ دکن     لەعلان ژ گەوهەر خەندە دا

---

(١) شەمال (ئامەد).
(٢) لێ (ئامەد).
(٣) تێک عالەمێ پێ شوعلە دا (زڤنگی، ئامێدی) تێک عالەمێ شوعلییە دا (ئامەد).
(٤) تێ (ئامەد) ومخابن ل ڤێرێ پەرەک ژ دەسنڤیسا (ئامەد) کەفتییە کو (١٧) چارینە تێدانە.
(٥) ئەڤ چارینە ل نک (کۆڤلی) نینە.

تــێ بــايێ چــەرخ و لــەولــەبــان　　　تــەدويــر و ســەيــرا كــەوكــەبــان
شـــەعثانييـــا ڕووز و شـــەبـــان　　　دۆلابـــێ هـــەر ژێ تـــێ صـــەدا

صوورەت ب صوورەت لێ كشاند　　　لــەوحــێ هــەيــوولا نــەققــشاند
زيرئــاب ژ نــووريّ لــێ ڕەشــاند　　　تــەقــويم و شــەكــل و خانــە دا

كاتــب د چــەرخــێ جــەدوەلــێ　　　خــوەش نــەقــش ئــاڤێتێ وەلــێ
كــر حاشــيبا هــەفت هــەيكــەلــێ　　　نێــڤ كولليــاتێ خــەمـــسە دا

دانـــين د پـــەرگـــاران ئـــەصـــل　　　بــەســتن موقابــل دەهــ فــەصــل
ڤێكـــرِا دەوائـــر بـــوون وەصـــل　　　بــەرزەخ ب بــەرزەخ حصــصە دا[1]

چــار عونــصرن چــار طــەبعــەتــن　　　ڤێكــرِا ب ميــزان ڤێــك كــەتــن
ب هــەڤــرِا موخــالف ســيرەتــن　　　لــێ د صــوورەتــێ شــەخصيیە دا

حــەتتــا ب ميــزان چــار ئــەصــل　　　ب هەڤرِا نەبن جەمع و وەصل
جــسمان ژ هــەڤ نــابن فــەصــل　　　بـــازوو ژ بـــازوو شـــەق نـــەدا[2]

چــار ئوممــەهــاتن ســێ بــەنــات　　　هــەر بــێ قــەرارن بــێ ثــەبــات
پــورِ عــشق و مــەيلــن ئلتفــات　　　د ڤــێ تــازە دەيــرى كوهنــە دا

هـــن ســـوفلەوى بـــازى دكـــن　　　هــن مــەيلــێ ئــەڤــرازى دكــن
خــوەش ڕەقــص و شــەهبــازى دكــن　　　ســەرگــەشــتەنــە د حــالێ خــوە دا

هــەر هــەيئــەت و هــەر جــسمەكــێ　　　هــەر فــەرد و نــەوع و قــسمەكــێ
ڕووح وێ ب دەســـتێ ئـــسمەكـــێ　　　هــەر وێ د قــەبــض و پــەنجــە دا

---

(١) خەسفە دا (زڤنگی، ئامێدی).

(٢) ئەڤ چارینە ل نک (کۆڤلی) نینە.

کوللاب ب دەستێ واهبە — یان ڕاکدە یان جاذبە
یان خافضە یان ناصبە — یان رەفعە و یان جەزمە دا

ئەو جەزمە دایی مەرکەزان — ئێ دل ژ بەر شەوقێ لەزان
حکمەت ب قانوونێ بزان — ئەهلێ دل ئەڤ ژێ گوفتە دا

ڕەمزا د نەجم و هەیئەتێ — عەقلێ موجەررەد نارەتێ
بێ نووری علمێ وەحدەتێ — ئەو ما د شەکک و شوبهە دا

فەییاضێ علمێ (من لدن) — پەی پەی ژ بەحرا کان و کون
گەهـ گەهـ ب ئوستادێ سوخون — وی گەوهەرێ ناسوفتە دا

فەیضا عولوومێ فەلسەفە — هاتی د نێڤ چەنگ و دەفە
من دی د جامێ دا خەفە[1] — فنجان ب جان من[2] جورعە دا

هەر نەهـ فەلەک لێ کاخەکن — دوور و دراز وەک ئاخەکن
تێ دارن ئەو ژی شاخەکن — ڤێ تەرحێ ئنسان میوە دا[3]

ئنسان بەرە عالەم درەخت — سولطان ژ خەلوەت هاتە تەخت
پێ زەیبینین ئقبال و بەخت — دەولەت ژ بالا طالە دا[4]

سولطان ژ بالا هاتە خوار — لاهووت د ناسووتێ ڤەشار

---

(١) من دی دجامەک قەرقەفە (زڤنگی، ئامێدی).
(٢) ب جانی (ئامەد).
(٣) ئەڤ چارینە ل نک ئامەد ب ڤی ڕەنگییە:
هەر نەهـ ژ مولکێ کاخ کون — دو ژ ئاستانێ ئاخ کون
لێ دارێ ئەو ژێ شاخ کون — ڤێ طەرحێ ئنسان میوە دا
(٤) ئەڤ هەردو چارینە ل نک (کۆڤلی) نینن.

پـەيـوەسـتە بـوو نوقطـە و مـەدار		دەورا عـــورووجێ گـــەڕ وە[1] دا

دەورێ گـەهانـدن هـەر طـەرەف		مـەحبـووب  ب فنجانـا صـەدەف
عاشق گەڕاندن[2] صەف ب صەف		دوڕدانــەيــێ سـەيـوان ڤــەدا[3]

سـاقی کـو دا مـن ئـەو سـولاف		فـەيضا مـەيا گولگـوون و صـاف
زائـــل کـــرن شـــوبهە و خـــلاف		علمـەک ژ بـەژنـێ روقعـە[4] دا

علمـەک نـەمـا دل پـێ نـەمـووج		قـەلبـی د عـشقێ کـت عـورووج
دێ طـەی بکـت چـەرخ و بـورووج		شـــــەهپـــــەڕ د دارا ســـــدرە دا

دۆلاب و چـەرخـێ نـەهـ فـەلـەک		پێش دەستی کورسی بوون هەلـەک
سـەرگـەشـتە هـاتن ئـەو گـەلـەک		د وێ نوقطـەيـا مـەوهومـە دا

ئـەحسەن ژ ڤـی نـەظمێ لـەطيـف		چـەنـدی سـڤک[5] هـاتی خـەفيـف
مەحبووب[6] ب دەستێ خوەی شەريف		نـەقـدێ مـە مـوهر و سـککە دا

ئـەحسەن ژ ڤـی وەصـفێ رەفيـع		ئـەشکال و ئـەوضـاعێن بـەديـع[7]
تێـتن ژ نـوورێ وەک رەقيـع[8]		بێ عـەيـب و نـەقـص و ڕەخنـە دا

---

(١) نە (ئامەد، کۆڤلی).
(٢) گرێدان (ئامەد).
(٣) سەبیالە دا(ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).
(٤) رەفعە (ئامەد).
(٥) سوبوک (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) دلبەر (ئامەد).
(٧) ئەڤ چارینە ل نک (کۆڤلی) نینە.
(٨) تیرێژ و نوورین وەک بەقیع (ئامەد).

ئـەحسەن ژ ڤـی نـەظـمێ[1] مـەلا ئـەشـكال و ئـەوصـافێن جـەلا
لـەو دل ب وان بـوو موبتـەلا جـەذبـە و جـەلالـە د سـینە دا[2]

(١) وەصفێ (ئامەد).
(٢) ئەڤ هەلبەستە هەمی ل نک (پاشا ، یووسفی، عەمەر، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب ) نینە.

# قافیا ( بـ )

## دەستێ قودرەت

دەسـتێ قـودرەت کـو هلاڤێـت ژ بـەژنـا تـە نقـاب
ب جەمـالا جەبەرووتـی مـە نـەمـان پـەردە و حجـاب
ل گولێن تەی تەڕ ونـازک کـو سەحەر گرتـی خونـاڤ[1]
د ئـەبـاریق و قنینـان[2] ژ حـەسـەد سـوهتی گـولاب
عەینی کافوورە ب مەشرەب[3] مە ژ حوسنا تەیە صاف
لـەو ژ عـشقا تـە د دل دا مـە ڤـەبـوو علمـێ عوبـاب
مە ژ سەرچەشمەیێ حەیـوان قـەدەحـەک صـافی ڤـەخوار
ناگهن[4] لەذذەت وشەوقا[5] مە ب سەد جلدێ کتـاب
لەو د چەنگێ مـە دخوونی کـو د عـشقا تـە ب سـاز[6]
مـە ب بـەژنـا تـە د خـوونن نـەی و قـانوون و رەبـاب
قـەهـوەیـا تـەلـخ دگـەل زەهـرێ هـەلاهـل بـدەری[7]
مـە ژ دەسـتێ تـە موبـارەک شـەکـەر ئـامیزە گـولاب

---

(١) غونچەئێ گول تەر و نازک د سەحەر گرتی خوناڤ (ئامەد).
(٢) ئەباریقێ رەقیبان (ئامەد، وەستانی، حەلەب).
(٣) عەینێ کافوورییە مەشرەب (ئامەد).
(٤) ناگهی (ئامەد، عبدالسلام، زڤنگی، وەستانی، حەلەب).
(٥) ذەوقا (ئامەد).
(٦) لەو ب چەنگ و دەف و نەی تێم کو د عشقا تە مودام (ئامەد).
(٧) بدری (عبدالسلام).

گەر ژ دەستێ تەی موبارەک زەهرەیێ قاتـل ڤـەخوم ئـەز
ڤێ ل من شەهد وعەسەل بت شەکەرئامیز وخوشاب[1]

قـولزەمـێ عـشقێ ژ بـایێ خـوە موخـالف دەمـەکـێ
تە هوما هاتە[2] عەجاجێ مـە ل سـەر دەستێ غـراب

سـەحـەرێ خـضرێ عنایـەت کـو بـرین چـەشـمەیـێ دل
ب جەهانێ مە نەظـەر دا کـو جـەهـان عـەینی سـەراب

ب حەبابێ مـەبـە مـەغـروور ووهـە[3] سـەرگـەشتە مـەلا
با ڤ بەر کەفتییە وێ بی وە مە[4] سەرگەشتە حـەباب[5]

دێ مـە هودهـود ژ سـەبـا بێـت و نـزانن چیـیـە حـال
کـو ل حالێ مـە غـەریبـان نـە سوئالە و نـە جـەواب

هــەردو بــورهێن تــەنــە محــراب چ ئیمــان چ کــوفر
بوود ونابوود کو یەکن ئـەڤ[6] چ ثـەواب و چ عقـاب

وەرە نیـشانێ نیـشانی دە خـوە بـێ پـەردە سـەحـەر[7]
لـێ ژ خوونێ بکە پەرهیز کو شـەهیـدان چ حساب[8]

(١) ئەڤ مالکە ب تنێ ئامێدی ژ کۆڤارا هاوار ڤەدگوهێزت.

(٢) د هەماماتێ عەجاجێ (یووسفی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، وەستانی) نـەدمـا هاتـە (حـەلـەب) د مـە دا هاتە (ئامەد).

(٣) وەرە (ئامەد).

(٤) بەیهوودە (زڤنگی، ئامێدی).

(٥) د دانەیا (ئامەد) دا ئەڤ مالکە ل دویماهییێ دئێت.

(٦) هەردوکانێ تە دخوازم (ئامەد).

(٧) وەرە بێ پەردە خوە نیشاندە تو جارەک سەحەرێ (وەستانی) وەرە نیشان بـدە نیشانی خوە بێ پـەردە سـەحـەر (حەلەب).

(٨) د دانەیا (ئامەد) دا هندەک پێش وپاشکرن د ڕێزکرنا ڤان سێ چار مالکێن دویماهییێ دا هەنە.

## لله الحمد

(لله الحمد)ی كو دائم مە[1] د دەست جامە لـەبالـەب
ژ لـەبـێ نۆشی پـەياپـەی دلـی[2] ئيلهامـە لـەبالـەب
تەڕيبا[3] وان خەط و خالان كو نە حـەرفـێن قـەلـەمينـە
مە ژ فەيضا تەيە مـەستانە ڕەوان جامـە[4] لـەبالـەب
مەستێ شـەهكاسـێ مـەيا جاذبـەيـێن ڕووحـێ ددين[5]
ڕووح دزانت كو ژ بەر لەذذەتێ عشقێ مە لەبالەب[6]
نێرگـزا مـەسـت ژ بـالا چـەمـەنـا سـونبول و گـول تـێ
قەدەحەک تازە ب دەستێ خوە هشی[7] دامە لەبالـەب
واحدەک صرفە مـە مـەشرەب تـە چ ئكسيرێ ووجـوود
ئەم لەبالەب چ لەبالەب ب خوە هـەم جامـە لـەبالـەب
شـەمع و پـەروانـە ب ذاتـێ خوە ژ حالـێ مـە د دوورن
ئاتـەشـەک صـرفە ژ عـشقاتە ڤـەوەسـتامە لـەبالـەب

---

(١) ژ يارێ مە (يووسفی، زڤنگی، ئامێدی) مە ددەستێ مـەی پوڕ جامـە (كۆڤلی) ژ يـارێ مـە د دەست خامـە لەبالەب (ئامەد).
(٢) ژ لەبێ لەعلێ تە دائم د دل (ئامەد).
(٣) د ڕێ يا (كۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی) نەقشێ خەط و خالان (ئامەد).
(٤) تامە (ئامەد) چا (زڤنگی، ئامێدی) و زڤنگی دبێژت: چا ڕوبيارە .
(٥) ڕووحێ دزانم (ئامەد).
(٦) كو ژ بەر لەذذەتێ عشقێ چ نەسەق چامە لەبالەب (ئامەد).
(٧) مەژی (يووسفی) مەشی (ئامەد، كۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).

قـەدەحـەک تـازە ژ عـشقێ د ئـەزەل دا مـە حـەکیمـی[1]
ژێ دنووشین هەی و هەی هێ ب خـوە جاما مـە لـەبالـەب[2]
تـە دزانـم تـە دبیـنم کـو تـویی نـوورێ ووجـوودێ[3]
(الله، الله) ژ چ نـوورە تـە سـەراپـا[4] مـە لـەبالـەب
ژ عنایەت نەظـەرێ خاصە کو هەر مصرەع و بەیتەک
قـەدەحـێن ئـابێ حـەیاتێنـە د شـعرا مـە لـەبالـەب
جـارەکـێ گۆتـە نیـشانی: نـە مـەلایـی وەرە بـانی؟!
ژ خـوونێ مـن دل وجـان ودەهـەن وکامـە لـەبالـەب[5]

(١) فەقیری (ئامەد).
(٢) وەرە نۆشین ب هەیاهەی سەحەر و شامە لەبالەب (ئامەد).
(٣) تە دبینم تە دزانم تە دخوازم د ووجوودێ (ئامەد).
(٤) سەرایا مە (زڤنگی، ئامێدی) الله الله کو چ نوورە د دل و جا مە لەبالەب (ئامەد).
(٥) ئەڤ د خواست مە ژ دل..(زڤنگی، ئامێدی) وی ژ خواست من دل و .. (وەستانی، حەلەب) ڤێ دخوەست من دل و جانی دەهەن و کامە لەبالەب (ئامەد).

# شاهـ بـ قەصدا کوشتنا من

شاهـ ب قەصدا کوشتنا من ڕم هەژاند و بوو سەبەب[(١)]
دامە چەشمێ قەهر وخەشمێ ڕم ل دل دا کو[(٢)] ئەدەب
کوشـتییێن دیـدار و دینـێ بـێ خـەطـا هـەر دەهـ سـەدن
هەر سەحەر دیسا ژ نوو وێن تێنە کێرێ سەد جەلـەب
دێ ژ چەرخێ بێ خەمین[(٣)] بێتن تەنەززول کت مەریـخ
مثلی شەمسێ گەر کشینیتن ل ئەوان تیپێن[(٤)] غـەضـەب
هەر مەجالێ ئەو د جەنگێ بێت وڕەت هەر جارەکێ
ڕاست وچەپ دێ بێختن سەدسەد ب مزراق وقەصەب
رۆستەم و جەمشید و خالـد حـەمـزە یـان شێرێ عـەلـی
ئافـەریـن یـا شـەهـسوارێ تـورک وڕمبـازێ عـەرەب
لـێ ل تـوولێ ئاسـتانێ چخ[(٥)] ب وان لـەعـلان کـرین
دەرگەهێ فەتحێ ڤەبوو ئیـرۆ ل مـەهجـووران عـەجـەب
بـەنـدەیێ صـادق سـەحـەر ئامـانجێ ڕەشـتۆزێن خوە کـر
من ب قەولێ دژمنان دت بەر خەدەنگان بێ سەبەب[(٦)]

---

(١) ڕم هەژاند من کو سەبەب (ئامەد).
(٢) گۆ (وەستانی، حەلەب).
(٣) پەنجومین (ئامەد، کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).
(٤) مثلێ سەیفی گـەر کشینیتن زەبان بێتن عـەضـەب (ئامـەد) ل وان تیغێن (زڤنگی، ئامێدی) ئـەوان بێـتن (حەلەب).
(٥) خەچ (پاشا، عەمەر) حەج (ئامەد، کۆڤلی).
(٦) وێ ب قەولێ دوشمنان دەست بر خەدەنگا بێ سەبەب (ئامەد).

لەشکەرێ قەهر و غەمـان وێـن چوون حصارا دل بکـن
کەعبە و بەیتولحەرامـە لـێ ب نـوور بێـتن[١] ڕەجەب
سوفتییێن پوڕ لـەعـل و مـەرجانـان ب موژگانـان حەتا
دیدە ڕەوشەن بوون ب دینا دێم دوڕێ سیمین غـەبـەب
ئـێ ب خـضری ڕا دڤێـت ئاڤـا حـەیـاتێ بـت نـەصـیب
دێ ب سـەعـی و جـەهـدێ یـەکسان بـن ل بـال وی رووز وشـەب
خدمەتا پیرێ موغان دێ کت کەسێ مـەقـصوودە مـەی
شیشە و جاما زوجاجێ ئێ دڤێت دێ ڕەت حەلەب[٢]
جەورێ هندێ دێ کشینت هـەر کـەسێ طـاووس دڤێـت
گەوهەر و دوڕڕا یەتیم بێ تەرکێ سەر تێتن طـەلەب؟
غەفلەتێ کو کەششفی شیر دەست ب دەست هاتن جەگەر
گۆ: غەبینەت[٣] یا مـەلێ مسکین مەلا کەرکر کـەزەب[٤]

(١) نەبۆریتن (ئامەد، حەلەب).
(٢) دێ ئێت جەلەب (کۆڤلی).
(٣) غەنیمەت (حەلەب).
(٤) .. مەلا مسکین مەلێ کەرکر کەزەب (زڤنگی، ئامێدی) کەربوو کەزەب (ئامەد).

# من د دل کۆڤان هەزارن

مــن د دل کۆڤــان هــەزارن داغ وکــەی پــڕ بــێ حــساب[(١)]
محنــەتــا وەردێــن ب خــارن وێــن د دل دا ســەد نــشاب
ســـەد نـــشابن مـــن د دل ئیـــرۆ ژ خـــارێن ســـۆرگولان
یەک ب یەک پێکان چەڤی بوون چوونە جەرگی دا کـولاب
پورِ ب وان جەرحان کـو تیـرن[(٢)] لـەو کـو دێ دەرمـان دکـر؟
شـەربـەت و ئابـا حـەیـاتێ شـەککـەر و قـەنـد و گـولاب
گـەر دوسـەد پـەیکـان د نێڤـا دل ب وان دێ خـوەش بـووان
هـەر دەمـێ کـەوکـەب بـدینا نـەجم و پـەروین بـێ حجـاب
زوهـره و عقـدا ثـورەییـا کـەشـشفی بـوون ئـەو د شـەرق[(٣)]
سایەیا بەختـێ مـە دایـێ[(٤)] مـا ل سـەر پـەردە و نقـاب[(٥)]
واژگـوون دەورێ نومـا مـن چـەرخ و بـایێ لـەولـەبـان[(٦)]
کـەوکـەبـان سـەیـرا موخـالف گـرت و تێکـل کـر حـساب

(١) من بێ حساب (ئامەد) کەیبەر (زڤنگی، ئامێدی، وەستانی).
(٢) پڕ ب وان جەرحان خوەش بووم (ئامەد).
(٣) زوهره و عقدا ثورەییائێ ژ مەشرق هاتە دەر (ئامەد).
(٤) دائم (حەلەب).
(٥) لێ ژ بەختێ مەی سیاهـ بوو هات ل سەر پەردە و نقاب (ئامەد).
(٦) واژگوون من دی د چەرخێ و د سەیرا لەولەبان (ئامەد).

ڤێـک کـەتـن شـەمـس و زوحـەل[1] ئیـرۆ د بورجا عـەقـرەبـێ
سەیف چوو دەستێ مەریخێ مولکێ دل لەو کر خەراب[2]
لـەو تـەنـەززول کـر مـەریخـێ نـەوبـە چـوو دۆرا زوحـەل
چوو طـەرەف مـەهـرا[3] سپهرێ نـەززلـی عـەردان عـەزاب
لــەو ل شــەش بورجــان عوطــارد ژ ئافتــابێ دوور بــوو
لـێ زوحـەل بـوو[4] موشـتەری ئاڤێتـە چـەرخـێ ئـنقلاب
شـەووشـی نـەظـما نوجوومـان هـەیئـەتا چەرخـێ بـورووج[5]
لەو ل وەضعەک[6] دەر نەتێتن[7] ماهـ و زوهره و ئافتاب
مونقـەلـب مـن دیـن مـەنـازل[8] ڤـاژی ئـەو سـەیـرێ دکـن
یەک ب یەک خوون ژێ دبارن ئاتـەش و لـەمع و شهاب
زوهرەیێ جەنگ و سەواش ئەڤ دی ژ چەنگ ئاڤێتە چەنـگ
خوەش ل پێ قـانوونێ وێ[9] گوهدە تـو قـانوون و رەبـاب
ئــەز دبــێم[10] ئــاخر زەمانــە و دێ قیامــەت رابــتن
لەو شەڤا تـاری کـشاندی و نـەهشت ئـەسوەد غـوراب[11]

(١) قەمەر (ئامەد).
(٢) مەلكێ دنێ (یووسفی) وی کر خەراب (حەلەب) لەو بوو خەراب (زڤنگی، عبدالسلام، وەستانی).
(٣) هاتە سەر عقدا (ئامەد).
(٤) چوو (ئامەد).
(٥) چەرخ و برووج (ئامەد، زڤنگی، عبدالسلام، ئامێدی، حەلەب، وەستانی).
(٦) وەصفەک (حەلەب).
(٧) لەو ل سەیرێ بوون موخالف (ئامەد).
(٨) کەواکب (ئامەد).
(٩) قانوون و نەی (ئامەد).
(١٠) من دگۆ (ئامەد).
(١١) کو شەڤا تاری ل من ظاهر دکر ئەسوەد غوراب (ئامەد).

خوەش ل من عالـەم سیاهـ ما ستێر و کەوکەب قەط نـەمـان

ئــەز ژ ڤــێ ڕۆژێ وە ترســام ئــاخری زوو کــر شــتاب

ئەڤ نە ئەو ئقلیمە یا شـەمـس و کـەواکب تـێ ب سـەیر[(١)]

ئـەز نـە وی عـەردی دبیـنم یـا کـو لـێ ئـەو ماهتـاب

جننـێ طــەییــارەک مـە دی وەربـوو د مـن ونـدا کـرم[(٢)]

دامــە بــەر پــەنجــە و کولابـان هلفڕانــدم وەک عوقـاب

ســـوفلەوی ئینـــام و ئـــاڤێهتم زەمینـــا ظولمـــەتـــێ

لێ کو هشیارم گەلۆ، یان خەونـە مـن دیتـی ب خواب[(٣)]

دێـوێ مــەلعــوونێ مونــافق ئــێ خــودێ ڕوورەش کــری

مــا ب بــالا هلکــشیتن عاقبــەت جهــ بــت صــەلاب

ئـەهرمـەن تـەعلیم دابـوو ئـەبیـەضی دەست تـێ هـەبـوو[(٤)]

پـوڕ ب ڤـێ تـەعلـیم و ڕایـێ هـاتبوو چووبـوو خطـاب

سـوڕ پـەری عللـەت نـەزانـی سـحرەیـا[(٥)] ئـەبیـەض دکـت

پوڕ غەلـەط[(٦)] ئەرزان مە دی دەرحەق خوە ئەو عالی جەناب

ئاهـ ئـەییـامێن وصـالێ وەهـ چ خـوەش بـۆرین و چـوون!

ئەو شەرابا عەیش و نۆشی مـا ل پێشبەر مـن سەراب[(٧)]

---

(١) .. لێ شەمس و قەمەر سەیرێ دکن (ئامەد).

(٢) جنن وگهییارەک (زڤنگی، ئامێدی، وەستانی، حەلەب).

(٣) د دانەیا (ئامەد) دا بەری ڤێ مالکێ مالکەکا دی ب ڤی ڕەنگی هەیە:

... .. دکن هن عولیەوی سەیرێ دکن ئەز نزانم ڤێ ب هشیاری دبینم یا ب خواب

(٤) ئەهریمەن تەعلیم کو دابوو دەستێ ئەبیەض تێ هەبوو (ئامەد).

(٥) نزانم (ئامەد) سحرەیان (عبدالسلام، وەستانی).

(٦) پوڕ عەجەب (ئامەد).

(٧) چوو ژ دەست من ما سەراب (ئامەد).

شـەربـەتـا شـێرین لـەبـان زەهـرا هـەلاهـل بـوو دنـاڤ
لـەو ب نـارێ فورقـەتـێ ئـاخر ل مـن دل کـر کـەبـاب
هودهودەک خوەش طەبع من ئیرۆ دڤـێ هـەر وەک نـەسیم[1]
دا ب بـال دلبـەر هنـارا و[2] بانییـا دیـسا جـەواب
عـەرض و حـالێ مـن بگۆتـایێ ب عنـوان و ئـەدەب[3]
ئاستان بکـرا زیـارەت چـەتـر و سـەیـوان[4] و طـەنـاب
دا د چـەشـما مـن وەرینـا خـاک هـەر وەک تووتیـا[5]
یـا حـەبیبـێ لـێ نهـایی[6] بانییـا وی ئـەو تـوراب
هـەر کـەسـێ ڕابـت و بـەحسێ مـەهـدەرێ جـارەک بکـت
خێرێ هـەفتـێ حەج ددێـرت بـەلکـوو بهتـەر ئـەو ثـەواب
وەعـدە دابـوو: دێ شـەهیـدکم وی ب شیرێ خـوەی شـەریف
مـا نـەبـی ئیـرۆ پـەشـێمان ئـەو ژ تـەدبیـرا صـەواب
شـەرحێ حـالێ مـن مـەلا نـارت بـەیاضـێ هـێ تـەمـام[7]
ڤـێ سـەوادێ گـەر چ هـەردەم ژێ بـرن[8] سـەد ئنتخـاب

---

(١) .. ئیرۆ من دڤێتن وەک سەبا (ئامەد).
(٢) دا ژ من ببرا دوعایەک (ئامەد).
(٣) عونوانێ ئەدەب (عبدالسلام) بگۆتا وێ ب عونوانێ ئەدەب (ئامەد).
(٤) سێوان (عبدالسلام).
(٥) من د چەشمان دێ بکێشا هەر سەحەر وەک تووتیا (ئامەد).
(٦) یا حەبیب پێ لێ نهائی (ئامەد).
(٧) ناچت بەیاضا دەفتەرێ (ئامەد).
(٨) بکم (ئامەد).

# قافييا ( پ )

## لەو سەحەر جەولان ددت

لـەو سـەحـەر جـەولان ددت بـايێ صـەبـايێ ڕاست و چـەپ
سووسن وسونبول ب مەستى تێن[١] سەمايێ ڕاست و چەپ
دا ژ محرابـا دونوونـان سـەجـدە بـت ئـەسـوەد حـەجـەر
دل ب مـيـزان مـاهێ نـەو ئـەبـروو نومـايێ ڕاست و چـەپ
دل ژ بـــسكا سلـــسلين[٢] بـــوو فـــڕ ددا خـــالا سياهـــ
شـەهپـەڕێ زولفـێ شـەپـال و دال[٣] دايـێ ڕاسـت و چـەپ
عالـــەمـــێ وێـــران دكـــن زولفـــێن ژ ڕەنگـــێ عـــەنبـــەرى
چـــەرخ و پـــەروازێ ددن جـــارەک ل بـــايێ ڕاســـت و چـــەپ
خـەنجـەر و تيـر و تـەبـەر بـارين شبى بـەرق و برووسـک
مـــصرييان لامـــع ژ ئـــەلماســـان ددايـــێ ڕاســـت و چـــەپ
طـەيرک و عقد[٤] و شـەراب و نـەترک و بـەرگ و وەرەق
هەر ب لـەرز وجەذبـەيين يـاقووت و[٥] تـايێ ڕاست و چـەپ

---

(١) بێن (زڤنگى، ئامێدى) ومالكا ئێكێ د دانەيا (ئامەد) دا ب ڤى ڕەنگييە:
ئەمر كر سولطـانێ نەورووز گول خويائى ڕاست و چەپ
لەو سەحەر جەولان ددت بايێ صەبائێ ڕاست و چەپ
(٢) فولفولين (ئامەد، عبدالسلام، زڤنگى، ئامێدى، وەستانى، حەلەب).
(٣) شەپالێ دال (زڤنگى، ئامێدى، وەستانى، عبدالسلام) شەپالێ دام (ئامەد).
(٤) طـەبلک (حەلەب).
(٥) د (ئامەد).

بشکۆوێن بەندا گریبانێ ژ ڕەنگێ کەوکەبان
بەرق و تیرڕێژان[1] ژ خورشیدی ڤەدایێ ڕاست و چەپ
کەوکەب وقەوس وقوزەح لوئلوء د بەندا حەیدەری
تێن طەوافا زولف و خالێن دلروبایێ ڕاست و چەپ
دل دخوونت زولف و خالان دێم و بالایێن ژ نوور
هەر ب قانوون موژدەیا غەیبێ ژ نایێ ڕاست و چەپ
زەنگیيان جەوشەن[2] ڤەبەستن پێشبەری جۆقا حەبەش
دابەڕستن یەک ب یەک چوون بەر لوایێ ڕاست و چەپ
چنگەچنگا بشکۆوان ئاواز و دەنگێ زەرگۆوان
سەد مەلائک گوهـ ددن بەر وێ نەوایێ ڕاست و چەپ
لەو ژ عشقا وێ دنالن بازن و بەرگ و وەرەق
جەذبەیا دل من ژ ڕەمزا وان گهایێ ڕاست و چەپ
زوهرە و عقدا ثورەییایێ د شەرقی کەشف بوون
(لیله القدر)ێ ژ مەغرب پەردە دایێ ڕاست و چەپ
زوهرە ڕەنگێ ماه وخورشیدێ ژ بالا وێ نوما
لەو دو کەوکەب چوونە ڤێرا د ئستوایێ ڕاست و چەپ
بێتە ئەیوانێ ژ خولوێ حووریيا قودسی سرشت
سەد هەزاران حووری[3] قودسی تێن لقایێ ڕاست و چەپ
ما مەلایی (أز) لەبێ لەعل ئابێ حەیوان بت نەصیب
قودسییان ڕاگرتنە دەستێ دوعایێ ڕاست و چەپ

---

(١) تیرۆژێن (عبدالسلام، زڤنگی، ئامێدی) تیر وسیر (حەلەب، وەستانی، کۆڤلی).
(٢) قووشەن (پاشا، عەمەر، کۆڤلی، وستانی، حەلەب).
(٣) رووح (ئامەد، حەلەب).

# قافییا ( تـ )

## نێرگزێن شەنگ دمەستن

نێرگـزێن شـەنـگ دمــەســتن چـەپ و ڕاسـت
ســاقیيان جــام د دەســتن چــەپ و ڕاســت
ڕاسـت و چـەپ دان[1] جـەگـەر و سـینە کـولاب
عەرعەرێن شەنگ د مەستن[2] چەپ و ڕاست
تــۆخ و عــالا کــو خویــا بــوون ژ عــەجــەم
عــەرەبـان تیـپ شـکەسـتن چـەپ و ڕاسـت
بــەر ڤ شــەرقــێ و ســەحــەر ســایێ دڤــێن[3]
هنــدووێن ڕۆژێ پــەڕەســتن چــەپ و ڕاســت
قــەیــصەرێ ڕۆمــێ ل ســەر حــەددێ فــەڕەنــگ
تـۆپ و زنجیـر[4] ڤـەبـەسـتن چـەپ و ڕاسـت
هــەردو دەســتێن خــوە حــەمائــل شــەڤــەکــێ
مــە ژ بـۆ یـارێ دخـوەسـتن چـەپ و ڕاسـت

---

(١) تێن (زڤنگی، ئامێدی).
(٢) دلستن (عبدالسلام) عەرعەرا شەنگ شەنگ دبستن (پاشا) عەرعەر و شەنگ دبەستن (ئامەد).
(٣) ب تنێ دانـەیا (ئامـەد) ب ڤی ڕەنگییـە، و د پتریـیا ژێدەران دا هۆسا هاتییـە: بـەر ڤ شـەرقێ دسـەحـەر وەستاین.
(٤) طۆپ و جەبخانە (ئامەد).

ڤـــە مـــەلـــێ ســـوڕپەرییـــا حـــووری صـــفەت

سەد مـەلـەک دەست ب دەستن چەپ وڕاست

# گەر ژ وێ حوورسرشتێ

گـەر ژ وێ حوورسرشـتێ[1] عـشوەیـەک ئظـهـار بـت[2]
دێ ببـت نـارێ (خلیـل اللـه) ودۆژەهـ سـار بـت
وەر ژ بـەر پـەردێ یـەدێ بـەیـضا ب مـوعجز بێتـەدەر
شەمس و کەوکەب دێ هلین عالـەم تـەژی ئـەنـوار بت
وەر ژ عەکسا خەمرییان قەوس وقوزەح دت یاسەمین[3]
دێ گـول و ڕەیحـان ببـارن تێـک وتـێ[4] گـولزار بـت
شەمع دێ جان دت ژ شەوقێ بێتە بەر صوبحێ نەفەس
نارت ئاخر گەر ب موویەت[5] بەحثێ زولفا یار بت
سلـسلا بـەحثـێ ژ خوونـا دل بـرن[6] زولفـا ب چـین
دێ خەطا بت نافەمسک[7] ئـەر نافـەیێ تاتـار بـت
طـەوقـێ گـەردەن حـەلقـەیا زوننـارێ زولفـا یـارێ مـن
دێ کلیتـا کـەلبـێ[8] عـشقێ حـەلقـەیێ زوننـار بـت

(١) حووری بهشتێ (ئیسماعیل).
(٢) ل دویماهییا مالکێن ڤێ هەلبەستێ دڤێت پیتا (ر) بێتە کێشان ب جرئیییەکا کورت دا کێش لەنگ نەبت.
(٣) قەوسێ قوزەح دت ئاسمان (ئیسماعیل).
(٤) دنێ (ئیسماعیل، کۆڤلی) تێک وتێک (ئامەد).
(٥) موویەک (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).
(٦) دلبەران (حەلەب، وەستانی).
(٧) ناڤێ مسک (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی) نافەئێ مسک نافەئەر (وەستانی، حەلەب).
(٨) گولب (وەستانی) قولپێ (عبدالسلام، حەلەب).

عەقدێ ئحرامێ د عـشقێ دا کـو پیرێ عـشقێ بـەست

دێ چ غـەم گـەر خرقـە رەهنـێ خانـەیـێ خـەممـار بـت

گەزمەیەک قـەوسـێ شـەڤین عاشـق ب نیڤـا دل کـەڤت

دێ ژ جان دەستان بـشۆت خاسـما کـەڤـان نووبـار بـت

وەر ژ قەوسەینان ب میزان بێتـە دەر جۆتـەک خـەدەنـگ

دێ جـەگـەر بـت پـارە پـارە سـینە تارومـار بـت

خـوون ژ مێلاکـێ ب دەربـا خـەنجـەرێ مـا[1] بێتـە دەر

بوو شـەهیـدێ عـشقێ ئێـدی دێ ژ کـوو هشیار بت؟

دێ ژ وان لـەعـلان شـفایێ دل ب قـانوون طـەلبـە کت

دا ئـشارەت خوەش بکـن دێ هـەر کـەسـێ بیمـار بت

بولبـولێ مـەجرووحـێ عـشقێ طاقـەتـا خـاران نـەهـن

دێ کەلافا[2] ڕیشـێ سینە بشکۆوەک بێ خار بت[3]

هەر دلـێ بازی صفەت دێ صەیـدێ تـەیغوونـەک وە بـی

فـڕ و پـەروازا هومـایی پـەنجـەیـێ شـونقار[4] بـت

یـار دڤـێ حـاکم بـتن قـەولـێ ڕەقیبـان گوهـ نـەکـت

شـاهێ مـولکێ دلبـەرێ دێ فاعلـەک موختـار بـت

دل ب ظـولمێ ناسوژی غونج و خەط و خالێن ل دل[5]

خـەیرخـواهێن دەولـەتـێ میـر دێ ژ وان گوهـدار بـت

---

(١) گەر (زڤنگی، ئامێدی).

(٢) گولاڤا ( عبدالسلام، وەستانی، حەلەب) کولافا (زڤنگی).

(٣) ئەڤ حەفت مالکە د دانەیا (ئیسماعیل) دا نەهاتینە.

(٤) شمقار (ئیسماعیل).

(٥) دهوور (ئامەد، عبدالسلام) د دل ( زڤنگی).

طـەیرێ دل بێ طـەمعـەکێ نائێتـە دەست شـەهزادەیـان
قووشـچیێ شـاهین د دەسـتی دێ د پـێ ئـازار بـت[1]

بـەندەیـێ بـاخوێ بڤێت دێ مـەیلـێ سیم و زەر نـەکت
دا عــەطـایــا پادشــاهان بــێ حــەد و ئــەژمــار بــت

سـار نابـت دل[2] ب سـەد جـەور وجـەفایـان ذەررەیـەک
عـشق طـەبعـەت نـارە هنگـی دێ بچت[3] دژوار بت

لـەشکەرێ عالـەم مـەگـەر یـەکسەر تـە دژمـن بـن مـەلا
غـەم ب موویـەک ناکـشینی گـەر تـە دلبـەر یـار بـت

---

(١) وێ دبێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٢) سار دبت دل ما (ئامەد).
(٣) بچت (زڤنگی، ئامێدی).

# قەلبێ مە شوبێ زێرێ

قەلبێ مـە[1] شـوبى زێرێ[2] ژ فـەيضا تـە جـەلا گـرت
مـا ڕووسـيەهـ وسـفر صـفەت ڕەنگـێ صـەفـا[3] گـرت
تـەشـبيهى جـەسـەد دل[4] مـە د نێـڤ ئاتـەشـێ عـشقێ
دل قەلبـێ حـەقيقـەت بـت و[5] ئكـسيرێ هـەما گـرت
سـالـک كييـە هـاتى[6] ژ مـەجـازێ ب حـەقيقـەت
صـوورەت نـە شناسـى و ب مـەعنا تـە[7] فـەنا گـرت
تـەنهـا نـە ل مـن لامعـێ حوسـنا تـە شـەفـەق دا
عالـەم ب خوە وێ حوسـن و جـەمـالێ د خـوە دا گـرت
تـەيغـوونێ د دەسـتێ تـە و هـێ[8] دەولـەت وئقبـال
هـەر چـى تـە بـوويى رام[9] د تـۆرا خـوە هومـا گـرت

---

(١) تە (پاشا).
(٢) قەلبێ مە نە زێڕە لێ (ئامەد) قەلبێ نە شوبى زێڕە (ئيسماعيل).
(٣) صەدا (ئيسماعيل).
(٤) تەشبيهى ب جەدوەل (عبدالسلام، زڤنگى، ئامێدى) تەشبيهى جەداول ( وەستانى، حەلەب).
(٥) ب تە (ئامەد).
(٦) ئێ هاتە (ئامەد) سالک وەكى هاتى ژ مەجازێ ب حەقيقەت (ئيسماعيل).
(٧) نە (ئامەد، زڤنگى، ئامێدى).
(٨) زەهێ (ئامەد، ئيسماعيل).
(٩) برى دامێ (زڤنگى، ئامێدى) بووى دام (ئيسماعيل) عبدالسلام، وەستانى، حەلەب) هەرچى كەتە وێ دامێ (ئامەد).

جـانێ خـوە مـە کـر دانـە و[1] دامـا کـو ڤـەدایـی
ئـاهوو صـفەت ئـەو پـێ حـسیا ڕاهـێ خـەتـا گـرت
عـەنقـا نـە شـکارا کـەسـە داڤـا تـو بچـین ڤـە[2]
داڤـا تـو ل عـەنقـا کـو ڤـەدی بـادی هـەوا گـرت
هەر کەس سەحەرێ طـالبێ تشتەک ب چەمەن هات
هن سووسن و هـن سونبول و هـن زولفـێ دوتـا گـرت
دەسـتێ مـە سـەحـەر گـرت و بـرین سـەیـرێ حـەبیبـێ
(فـي الحـال) ڕەقیبـی ژ حـەسـەد لـەرزە و تـا گـرت
ئـەو کـەبکـێ خـەرامـان کـو د کـۆزێ ل قـەبـۆ هـات
شـاهینێ قـەضـایێ ب تـەغـافول ژ خـوە ڕا گـرت
زنهـار کـەسـێ دەسـت بیـت ئـەرقـەمـێ سـەروێ
بێ عشوەیێ لـەعلان تـە[3] ب تـەسلیمێ ژها گرت
صـەبـرێ بـەری شـێرینە، وە ئوسـتادی خـەبـەر دا
لەو دل مە ب تەحلی و غەمان[4] خوررەم و شا گرت
هـەر نـەشـتەر و شـەوکـێن کـو حـەبیبـێ مـە ل دل دان
من یـەک ب یـەک و تێکی ل دەردێ خوە شفا گرت
عاشـق ژ غـەمـێ سایەیـێ[5] وێ جامـە طـەلـەب کـر
پـوڕ عـەقـل ددیـرت مـە ژ قـسمێ حوکـەمـا گـرت

(١) دانەئێ داما (عبدالسلام، زڤنگی) دانەء و دل (ئیسماعیل).
(٢) ڤەر (عبدالسلام، حەلەب، زڤنگی، وەستانی) بۆ بچین ڤە (ئیسماعیل) بچن ڤە (ئامەد).
(٣) نە (ئامەد).
(٤) لەو دل ب تەجەللا و غەمان (ئیسماعیل).
(٥) گیسۆوێ (ئامەد).

صـەف صـەف نـەتنـێ گـەزمـە دبـارن ژ کـەڤانـان
دل کـاکولێ زولفـان ژ[1] کـەمـەنـدێ ب تـەبـا گـرت
دێوانـە هـەرێ تـێن و[2] د ڤـێ سلـسل و بـەنـدێ
کـو موسـتەحـەقـێ خوسـرەوێ خووبـان ب جـەزا گـرت
پـەیـوەسـتە دو فێـرس ژ مـە ڕا[3] دابـەرزیـن دل
زولفـان ژ چـەپ و ڕاسـتێ ل ئۆغلمـە جـەمـا گـرت
قـەوسـێ دو هـلالان کـو ل سـەر بـورجێ ئـەسـەد بـت
بوو شوهرە د عامێ عەمـەل ئـەنگوشت نومـا گـرت[4]
شـعرا تـە مـەلا سـحرێ شـەکـەرریـزە ب مـوعجز
زانـم ژ لـەبێ لـەعلێ تـە ئـەڤ لـەفـظ و ئـەدا گـرت

(١) د (ئامەد).
(٢) دیوانە هەبی هەر تو (ئامەد).
(٣) ژ کەمین (ئامەد).
(٤) ئەڤ هەر پێنج مالکێن دویماهییێ د دانەیا (ئیسماعیل) دا نەهاتینە.

# مەحبووب ب دل بت

مـەحبـووب ب دل بـت[1] مـە ب ئـەڤـراز چ حاجـەت
عـەنقـا ب خـوە بێـتن فـڕ و پـەرواز چ حاجـەت
نەی[2] دوورە حەبیبێ مە ب[3] فەریاد وفـەغـان كـین
وەک[4] گوهـ ل ضـەمیـرا دلـە ئـاواز چ حاجـەت
گـۆ: سـوختە مـورادا خـوە ژ مـن طـەلبـەكـە ئیـرۆ
مـن گـۆ: ژ كـەریـم طـەلبـە و داخـواز چ حاجـەت
مــن نالــە ڕەفــیقن غــەم و تــەحلینــە موصــاحب
فــەریــاد ئــەنیــسێ منــە دەمــساز چ حاجــەت
دلــدان و نــەوازش چنــە دوشــنام بــەســن مــن
پـوڕ دەرد و جـەفـا حورمـەت و ئعـزاز چ حاجـەت
صـوحبەت ب مـەی و چـەنگێ حـەبیبـێ مـە بڤێـتن
فـەریـاد و فـەغـانێ مـە بـەسـن[5] سـاز چ حاجـەت
ڕازێــن مــە ژ[6] حاجـەت وە كـو غـەممـازی بـزانن
ئـەشـكێن مـە بـەسن دیـدەیـێ غـەمماز چ حاجـەت

---

(١) مەحبووبێ د دل بت (ئیسماعیل) مەحبووب كو ب دل بت (ئامەد).
(٢) نێ (ئامەد).
(٣) چ (ئامەد).
(٤) وی (ئیسماعیل، ئامەد).
(٥) ب ڤی ڕەنگی د دانەیا (ئیسماعیل، ئامەد) دا هاتییە.
(٦) چ (ئامەد).

هـەر لـەحظـە چ حاجـەت کـو ب نـازان بکـوژی مـن
جانـا ژ خـوە قوربـانی تـە مـە نـاز چ حاجـەت
تـا چـەنـدێ ب هـەجرا خـوە تـو مـن تـەجربـە ئینـی
زێـرێ ژ خـوە خـالص محـەک و گـاز چ حاجـەت
حاجـەت نیـە جانـا یـەدێ بـەیـضا بـدەرانـی[1]
ئنکـار د دیـن دا نـەبـت ئعجـاز چ حاجـەت
ئـەسـرارێ ئـەزەل دێ د ئـەبـەد بێنـە ظـوهـوورێ
ئـەنجـامێ سـەرئـەنجـامێ ژ ئاغـاز چ حاجـەت
گـەر لوئلـوئێ مـەنثـوور ژ نـەظـمـێ تـو دخـوازی
وەر شـعرێ مـەلـێ بـین تـە ب شـیراز چ حاجـەت

(١) بدەرینی (ئیسماعیل، ئامەد).

## کەس ب دادا مە نەپرست

کـەس ب دادا مــە نــەپرســت گلــەهــ وداد چ کــت؟
تــە نــەبــت دادرەســەک بیهــوودە فــەریــاد چ کــت؟
ب شـرینێ نــە گــەهــت دەســت ئــەگــەر رۆســتەم بــت
دێ ب بــازوو و مــلان شــوبهەتــی فــەرهــاد چ کــت؟
فاعلــەک لازمــە دا فعــل و ئــەثــەر پــەیــدا ببــت[1]
گـەر تـو حـەدداد نـەبـن کـوورەیـێ حـەدداد چ کـت؟
مومکنــەک دێ هــەبــتن داکــو گــەلــەب حاصــل بــت
صەید و نێچیر کو نـەبت توولـەیێ صـەییاد چ کت؟
هـەر گـل و سـەنـگ دبـتن زێـر ب تـەدبیـرێ حـەکیم
قابلییــەت کــو نــەبــت حکمــەتــێ ئوســتاد چ کــت؟
کـان ب گـەوهـەر چ بکت گـەوهـەر ئـەگـەر پـاک نـەبت
تـو بـەصیرەت تـە نـەبت سیرەتـێ ئـەجداد چ کـت؟
زێـــر و زیـــوەر دکـــرن جـــەلبـــێ قولووبـــان حاشـــا[2]
حوسن و سورِ ذات[3] نەبت قامەتێ مـەییاد چ کت؟
عاشـقێ مـەسـت ب عـشقێ نیـە حاجـەت ب مـەیـێ
واردێ وارد و ئـــــەحـــــوال ب ئـــــەوراد چ کـــــت؟

---

(١) بت (ب تنێ ل نک یووسفی نە بت) بکت (ئامەد).
(٢) ل ڤێرێ گوهۆرین کەفتییە تەفعیلا دویماهییێ ژ (فەعەلون) بوویە (فەعلون)، حاشانە (ئامەد).
(٣) ذاتی (ئامەد).

نە[1] غەرەض ڤێككەتنا يەک و ل يەک[2] مورشد بت
سـالک وطـالبێ ئرشـادێ ب بـەغـداد چ کـت؟
جەهدە و سەعی و طـەلەب بێ[3] ئەثەرەک صافی نەهن
تـو نـەبی پـەردەنـشين چاکـەر و قـەوواد[4] چ کت؟
چ ئـەثـەر دێ ل بـەرێ خـارە بکـت قـەطـرەيـێ ئـاب
قەلەمێ ما ب دوسێ قـەطـرەيـێ زوهـا دێ چ کت؟
دێ ژ حـەق جاذبـەيـەک دل بگـرت وەرنـە مـەلا
ژ ئـەزەل گـەر تـو هدايـەت نـەبـت ئرشـاد چ کـت؟[5]

(١) تە (عومەر، زڤنگی، ئامێدی).
(٢) وەلييەک (عبدالسلام).
(٣) ئەو بێ (ئيسماعيل، کۆڤلی).
(٤) چاکە وفەوواد (ئيسماعيل، عبدالسلام، وەستانی).
(٥) ئەڤ هەلبەستە د چاپا حەلەبێ دا نەهاتييە.

# ئەووەل کو یارێ دا مە

ئـەووەل کـو یـارێ دا مـە یـەک ذەررەیـەک عنایـەت
قـسمەت مـە خـەمـر و جامـە د[١] دەفتـەرا هدایـەت
حوسـن و جـەمـالێ جانـان نـادێرتن تـو پایـان
هـەر چ نـەبـت بدایـەت ئـەصـلەن نـەهـن نهایـەت
فـەیـضا عولـوومێ حکمـەت جاما صـەدەف کـو گێـڕا
مە ژ دەستێ موغبەچان دیت ب موصحەف و ب ئایەت
عـارف حـەتـا نـەنووشـی ژ دەسـتێ مـەی فرووشـی
غائـب نـەبـوو ژ هووشـی پـەیـدا نـە کـر ولایـەت
گوناهـ و زوهـد[٢] و طامـات هـل نـاگرت خـەرابـات
کـەسـێ ب ڤـی دەری ڕەت[٣] دڤـێ بکـت رعایـەت
عـشقێ ژ هـەردو چـەشـمان ئـەووەل د دل ئـەثـەر کـر
لـێ ذەررە ذەررە ئـاخر سـۆتن کـر و سـرایەت
(شـاکي الـسلاح) هـەر دەم ب کوشـتنا مـەلـێ بـت[٤]
گازنـدەیـان ژ کـێ کـم ژ کـێ بکـم شـکایەت؟

---

(١) ژ (بەغدا) جام بوو ژ (ئامەد).
(٢) گوناهێ زوهد (ئامەد).
(٣) بێت (ئامەد).
(٤) بێ (بەغدا) ب کوشتنا مە هەر تێ (ئامەد).

جامــا د[1] دەســتێ شــاهد ژەنگــێ ژ دل دشــۆتن
پیـرێ موغـان ژ ڕەنـدان وەهـ وەهـ دکـر روایـەت[2]
ئـەطـوارێ عـشق و مـەستی ئـەسرارێ بـوت پـەرەستی
تــەقریــرێ ســەد روایــەت ناکــت ل بــۆ کفایــەت
(لیطمــئن قلبــي، عــین الیقــین) دبــەخــشت
(عــین العیــان) دڤێــتن کــافی نــەهــن درایــەت
میــری و پادشــاهی موویــەک ل نــک مــەلایــی
نــادم ب مــولکێ عالــەم یــەک ذەررەیــەک عنایــەت

(١) ژ (ئامەد).
(٢) پیرێ موغان وە گۆتی رندان دکر روایەت (ئامەد) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئیسماعیل) دا نینە.

## عەرعەر خەراما

عەرعەر خەرامە ب قەدد و قامەت
یەک بووسە دا مە ب سەد قیامەت
یەک بووسە بەخشی ئەووەل ب ئحسان
ئاخر ل من کر جورم و غەرامەت
ژ ژەنگ و زەرقێ دل دا بشۆتن[١]
جاما صەدەف بن رەند[٢] و کەرامەت
ژ هەردو چەشمێن تەی مەست وخوونریز[٣]
نوورا[٤] دو چەشمان کێ دی سەلامەت
ل دەرد وئێشان پەیکان و نێشان[٥]
مە ژ دل د چەڤان[٦] کفشن عەلامەت
رسوایێ عشقێ نە تەنها ئەز بووم
کێ[٧] دی زەمانان حوب بێ مەلامەت
دو سەجدە فەرضن (في الحال) ببین بەر[٨]
دەما خویابن ئەو قەدد و قامەت

(١) بشوویین (ئیسماعیل، ئامەد).
(٢) رەنگ (بەغدا).
(٣) ب هەردو چەشمێن د مەست و خوونرێز (ئیسماعیل) ژ وان چەشمێ خوونرێز سەرتیر دبارن (ئامەد).
(٤) مەلا عبدالسلام جزیری دبێژت: بەلکی (تۆرا) بت. و د دانەیا (ئامەد) دا: تیرا، هاتییە.
(٥) کو نار و پێتە ل دل مە دائم (ئامەد).
(٦) مە ژ هەردو چەشمان (زڤنگی، ئامێدی، عەمەر) مە ژ هەردو چەڤان (ئامەد).
(٧) کەس (بەغدا، زڤنگی، ئامێدی، عەمەر).
(٨) ئەووەل ببن بەر (ئامەد).

دا عــــەیبـــێ ڕەنــــدان نــــەکـــی ب بــــادێ[1]

(نفـــــــوس قـــــــوم بهـــــــا تـــــــسامت)

مــــەلا ل عـــــومرێ بـــــێ فــــەیـــــده بـــــۆری

کوشـــــتا[2] ب زۆری قـــــەهـــــر و نـــــەدامـــــەت

(١) ب بازی (ئامەد).
(٢) کێشا (زڤنگی، ئامێدی) کێشایە رووزان جەور و نەدامەت (ئامەد).

# قافييا ( ث )

## عومر ضائع بوو مە بێ دلبەر

عـومر ضـائع بـوو مـە بـێ دلبـەر عـەبـەث
وەی! تەڤی عومرێ مە بۆری بەر[1] عـەبـەث
دل ئـــەمانـــەت دا ب نائـــەهـــلان نـــەدی
لێ[2] ب نائـەهلان مـە دا گـەوهـەر عـەبـەث
دا د سـەيـرا عـشقێ بـێ دلبـەر نـەچـی
لـێ دبـت سـەيـرا تـە بـێ دلبـەر عـەبـەث
پـور د پـێ وەصلێ مـە سـەعـی و جـەهـدە دا
جـەهـدە و سـەعيـا مـە هـاتن دەر عـەبـەث
سـەعـی و جـەهـدێ ئـەم بكـن مـەيخانـەيـێ
ئەو كو ناچت سەعی وجەهدا بەر عەبـەث[3]
دەسـت هێلـين ئـەم د سـەعـی و جـەهـدەيـێ
جەهدە و سەعيـا مـە نـارت سـەر عـەبـەث[4]

(١) پور (ئيسماعيل، وەستانی، حەلەب، ئامێدی) ل ڤی عومرێ مە بۆری هەر (ئامەد).
(٢) لەو (ئامەد).
(٣) ئەڤ مالكە ب تنێ د دانەيا (ئامەد) دا هەيە.
(٤) ئەڤ مالكە ب تنێ د دانەيا (ئامەد، ئامێدی) دا هەيە.

ئاهــــ وێ كوشـــتم ب دەربـــا خـــەنجـــەرێ

مـا د مێلاكـێ درەت[1] خـەنجـەر عـەبـەث

دل ژ دەربـــا كاشـــۆوان بـــوو پـــارە پـــار

گـۆ د مـەيـدانێ دبـت سـەد كـەر عـەبـەث

مــەهــدەرا ڤــى ســوختەيــى ئيــرۆ بكــن[2]

ئـەز دبێـژم نابت ئـەڤ[3] مـەهـدەر عـەبـەث

كفـشە مـەعنـا كـێ ل لـەوحـێ سـيم دى[4]

نوقطـەيێ مسك و خەطێ عـەنبـەر عەبەث

دا مــەلا هــشيار ببـى[5] لــێ پـوڕ كـەسـان

سـينە پـوڕ لێدانـە سـەنـگ و بـەر عـەبـەث

---

(١) دچت (ئامەد).

(٢) مەهدەرا من ئێ بكت ئيرۆ ژ وێ (ئامەد).

(٣) ئەو (ئامەد).

(٤) وى (پاشا، يووسفى، عەمەر، عبدالسلام، وەستانى، حەلەب).

(٥) ئەى مەلا هشيار بە (ئامەد).

# نامێ عەنبەرشکەنێ بێت

نامێ عەنبەرشکەنێ بێت تو[١] ژ عەنبەر مەکە بەحث
بـل ژ وێ سلسله و زولفـێ موعـەنبـەر مـەکـه بـەحث
ڤـەکـە لێڤـێ و ژ نێڤـێ بـوەریـن قـەنـد و نـەبـات
ژ لەبێ لـەعلێ شەکەربێژ و ژ شـەککـەر مـەکـه بـەحث
ب سـەرئـەنگوشـتێ عـەقیقـی بـدە فنجـانێ[٢] رەحیـق
ئابێ حەیوان تە چین ناڤ و[٣] ژ کەوثەر مەکە بەحث
زەرییـێن شـوبهەتـی[٤] دورِدانــە بـبن شـاهدێ بــەزم
ژ گەنم رِەنگ وسیەه چەردە و ئـەسمەر مـەکە بـەحث
دێ بــشارەت ژ ئــشارەت ژ نــەیــێ بێنــە ســەمــاع
تـو ژ نـایێ و سـەمـایێ[٥] بکـە بـاوەر مـەکـە بـەحث
دێ[٦] نهــانی ب دەرئــاغووش بــدی جــانێ شــرین
شاخێ عومری بخوە بەر ژێ و ژ قەیصەر مەکە بەحث

---

(١) ب ڤی رِەنگی د دانـەیا (ئامـەد) دا هاتییـە، و د دانـەیا (وەستانی) دا ل جهێ تـو (و) هاتییـە، و د پتـر دانەیان: (بێت ژ) هاتییە، وئەوا مە ل سەر هلبژارتی ژ لایێ کێشێ ڤە دورستترە، و ژ لایێ مـەعنـایێ ڤـە چو خەلەتی تێدا نینن.
(٢) شەهکاسێ (ئیسماعیل).
(٣) ئابێ حەیوانێ مەبێژە تو (ئامەد).
(٤) شەهلا و (یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) شەهلە و (ئامەد).
(٥) سەماعێ (ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی).
(٦) وێ نهالێ (زڤنگی، ئامێدی) دەی (عبدالسلام).

ئایەتێ حوسنێ موفـەصـەل کـە ژ کـەششافێ جـەمـال
علمێ عشقێ بکە تەفسیر و ژ دەفتـەر مـەکـە بـەحث
رازێ دەهــرێ ژ ســپهرێ تــو نزانــی ب جــەدەل
حکمـەتـێ داوەرە تـو ژ حکمـەتـێ داوەر مـەکـە بـەحث
ئـابێ حـەیـوان تـە دڤێـتن تـو ببـە هـەمـرەهـێ خـضر
جامێ جەم بین و ژ دارا و سکەنـدەر مـەکـە بـەحث
ژ ئــەزەل عاقبــەتــێ کــار کــو مــەعلــووم نــەبــت
جامێ مەی نووشە ژ تەقدیر و موقەددەر مەکە بـەحث
دلـێ یـارێ مـە نـەبـوو نـەرم ب سـەد ئـابێ گـری[(١)]
ژ دلـێ دلبـەرێ مـا و بـەرێ مـەرمـەر مـەکـە بـەحث
تیـر سـەد[(٢)] تێنـە جـەگـەر سینە ل بـەر مایـە چـەپـەر
ژ دل و جەرگێ کول و سینەیێ کـەرکـەر مـەکـە بـەحث
شـیرێ ئـەلماسـێ کـشینت تـو ژ لامـع دە[(٣)] خـەبـەر
ڤـەکرت حوققـەیێ یـاقووت ژ گـەوهـەر مـەکـە بـەحث
ژ شـەفـەق زوهـرە خویـا بـت تـو بنـێ پـەروینـەیـان[(٤)]
جەبهەتێ (أو) بنومیت تو ژ مەهـ و خاوەر مەکە بـەحث
ل ڕوویێ یارێ دو مەهـ نەو مـە قـران دینـە دمـەست[(٥)]

---

(١) ئاب وگری (ل نک هەمییان گۆڤلی وزڤنگی تێ نەبن ).
(٢) سەد تەبەر (ئیسماعیل، ئامەد).
(٣) چ ژ لامع دێ (ئامەد).
(٤) ژ بلی یووسفی ل نک هەمیان (پەروینان) هاتییە، لێ یا یووسفی ژ لایێ کێشێ ڤە راستترە، و د دانـەیا (ئامەد) هاتییە: تو ل پەروینا مونیر.
(٥) دو هلال وێ د قرانن ل ڕوییێ یارێ مە دی (ئامەد).

تو ژ سەير و قەمەر[1] و طالع و ئەختەر[2] مەكە بەحث

پـورِ ژ دێمـێ خـەط و خـالان تـە خـەبـەر دايـە مـەلـێ

نەظـەرێ وەر بدە بەژنێ ژ موفەسسەر[3] مەكە بـەحث

(١) قەمەرێ طـالـع (زڤنگی، ئامێدی).

(٢) تو ژ سەيرا قەمەر وطـالعێ ئەختەر (ئامەد).

(٣) صەنەوبەر (ئامەد).

## تو سەحەرگەهـ ب تەماشا وەرە

تـو سـەحـەرگـەهـ ب تـەماشـا وەرە بـازارێ حـودووث
ل[1] تـە بـێ فائـدە ئـازارێ نـەدت خـارێ حـودووث
دا ژ دل غونچـە لـەبـەک نـازک و تـەڕدانـە[2] بژێـرى
ب تـەبـەسـسوم ب تـە ڕا بێتـە ژ گـولزارێ حـودووث
سـەد گرهـ مـن د دلـن ژێ کـو چەپ و ڕاست دکت[3]
شـاهدێ حوسنێ قـدەم[4] زولفـێ گرهـدارێ حـودووث
بـل ژ سـولطـانێ قـدەم مـن ب تـو ئقـرار نـەهـن[5]
گەر ل کابا مە نهەن مەتقەب[6] و بزمارێ[7] حـودووث
دل د دەریـــایێ قـــدەم قافـــە ب ثابـــت قـــدەمـــى
گـەر چ دائـم ل سـەرێ فـەرقـە مـە منشارێ حـودووث
بەلکوو ديوار ب گوهن لێ[8] ب خـودێ کـى ب خـودێ
ب تـو ڕەنگـى نـەکـرى ئـەشـکـەرە ئـەسـرارێ حـودووث

(١) لێ (يووسفى، عەمەر، زڤنگى، ئامێدى، عبدالسلام، وەستانى، ئامەد).
(٢) دوڕدانە (ئيسماعيل، ئامەد).
(٣) دکر (عەمەر، زڤنگى، ئامێدى) لەو کو گرهدار دکت (ئامەد).
(٤) شاهێ حوسنێ قدەمێ (زڤنگى، عبدالسلام).
(٥) نيە (ئيسماعيل، ئامەد).
(٦) مثقب (ئامەد، کۆڤلى) مەدقەب (پاشا، عەمەر).
(٧) منقارێ (ئيسماعيل).
(٨) گوهـ بن (عبدالسلام، زڤنگى، ئامێدى) گوهـ بێن ( وەستانى، حەلەب) بەلکوو ديوار ب گوهـ بن ب خودێ کى ب خودێ (ئيسماعيل، ئامەد).

لـەمعـەیـەک گـەر ژ کنـارێ قـدەمـێ پـەرتـەوێ دت
دێ ژ بەر وێ سەعەتێ[1] مەحوو بن ئەنـوارێ حودووث
بـەر[2] ب سـەد پـەنجـەرەیـان دایـە شـوعاعێ قـدەمـێ
گونبەدێ عشقێ ل سەر کورسییێ دیوارێ[3] حودووث
تـو حـودووثێ وە مـەبـین قـەنـج نـەظـەر دێ جـارەکـێ
ل ئـەساسـێ قـدەمـێ دانییـە دیـوارێ حـودووث
هـەرە ئـەصـلێ خـوە و تـەرتیـب و قیاسـێ ژی بکـە
گـەر نزانـی چیـە یـەکجـاری بـەرێ دارێ حـودووث
ئاتـەشـێ عـشقێ شـوبی زێـرە و وجـوودێ[4] حەل دکت
هـەیـە مـومکن نـەفـڕت زیبـەقـێ فـەررارێ حودووث
(اللـە اللـە) کـو د عـومرێ خـوە تـو جـارەک نـە بهـی
چ صـەدا تێـت ژ ڤـێ گونبـەدێ دەووارێ حـودووث
تـو ژ بـەر پـەردەیـێ وەهمـێ وەرە دەر دا ببهـی
چ نـەوا تێـت ب سـەد نـەغمـە ژ ئـەوتـارێ حـودووث
حـال و موسـتەقبـەل و ماضـی د خـوە دا تێـک یـەکـن
صوبح مەوجوودە ب عـەینـی خوە د ئێڤارێ حودووث
ڕاست و چەپ گاف و سەعەت هەر ل مە ئەو داتینت[5]
ذوولفـەقـارێ قـدەمـێ حـەیـدەرێ کـەررارێ حودووث

---

(١) شەفەقێ (ئامەد).
(٢) وێ (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).
(٣) دەووارێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) ئەگەر زێڕێ وجوودێ (ئامەد).
(٥) هەر ل سەر من ددتن (ئامەد).

ڕاست و ئـەڤـراز و نـشووڤـی نـە[1] بـووارن یـەک ویـەک

لـێ تنـێ وێ ل مــە بـوو دائـرە بـەرواری حـودووث

دێ ب قــەلبــێ مــە چ دت لامعــەیـا ئــسلامییێ[2]

کو ل جانێ خوە مە خەف بەستییە زوننارێ حودووث

ڕەنـگ و ژەنگـێ حـەدەثـێ نـەقـشێ حـودووثێ مـە د دل

بدە بەر ڕەندەشێ عشقێ ئـەوە قـەصـارێ حودووث

جــان ل ســەر دەســتی نهــایی دڕییــا جانــان دا

رووح صەف صەف کو ڤـەوەستانە د بـازارێ حودووث

وێ ژ غــەفلــەت بــرەتــن ســایە زەوالــێ ئــەی دل[3]

ڕوون تنـێ[4] دا تـو ئـەمانـەت ل سها دارێ حودووث

تو ژ فەصلی[5] هەرە ئەصلی کو د ڤی دەیرێ[6] خەراب

دا نەبی مەرکەبێ جەهلێ تـو ل بـن بـارێ حودووث[7]

دا نگــارێ خــوە ب ســەد ڕەنگــی ببینــی ئیــرۆ

وەرە جـارەک بکـە سـەیرێ تـو د ئـەطـوارێ حودووث

تـو ب حـالێ مـە دزانـی[8] چیـە هـەر لـەحظـە مـەلا

مە د دل تێت و درەت خـەنجـەرێ غـەددارێ حودووث

---

(١) مە (ئیسماعیل، ئامەد).

(٢) دێ ل قەلبێ مە چ دت لامعێ نوورا قدەمێ (ئامەد).

(٣) دێ ژ غەفلەت ڤەبرت سایە ژ سەر فەرقێ تە ئەو (ئامەد).

(٤) رووبنێ (کۆڤلی) رووتنێ (یووسفی، عەمەر) روونەنێ (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).

(٥) وەصلێ (ئامەد).

(٦) دێرێ (عبدالسلام، زڤنگی).

(٧) ئەڤ مالکە د دانەیێن ( پاشا، وەستانی، حەلەب) دا نەهاتییە.

(٨) نزانی (پاشا).

# قافییا ( ج )[1]

## شمشادێ خەرام

شمشادێ خەرام و سەروێ غەنناج
جانان دبرت ب عشوه تاراج
من دی سەحەرێ د خوابێ مەستی
بێ دەنگ[2] تەذەروو و لالە[3] دورراج
بشکفتی ژ غونچە نێرگزا مەست
بوو فەرق ژ سەر قەدیفە دیباج[4]
جەبهەت کەشفی ژ صوبحێ صادق
نووری کو ڤەدا ژ سەر شەبێ داج
ئەلماسی نومانە شوبهی مصری
دانین جەگەرێ مە دل کر ئاماج
نەسرین و بەنەفشە تەوزاندن[5]

(١) قافییا (ج) د دانەیا (ئیسماعیل) دا نینه.
(٢) ڕەنگە (ئامەد، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٣) ناله (کۆڤلی).
(٤) د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا پەیڤا (دیباج) هاتییه، و د هەمی ژێدەرێن دی دا (تاراج) هاتییه، ومەلا عبد السلام جزیری د شەرحا خۆ دا و ژ نک خۆ پەیڤا (دیباج) دانایه وئەو دبێژت: (دیباج) دورستتره.
(٥) نەسرین و بنەفش و نێرگزێ مەست (ئامەد).

مــاوەر درەشــانده شووشــەیــێ عــاج
جــوهتێ حــەبــەشــان (بطـرفــة العــین)
ئــانی قــەدەرەک ژ ئــەسـپەهــان بــاج
ســیما کــو نومــا نــەمــا ل هــش ســیم
سیماب ژ خەجالـەت مـا ژ ئخـراج[(١)]
مرئـــــاتێ ســـــکەنـــــدەری ل پێـــــشە
(بحــر و لهــا العکــوس أمــواج)
دۆرا قـــەمـــەرێ ژ بـــەر شـــەفـــەق دا
کو سپێده[(٢)] ل فەرقێ سەر نها تـاج
چـەرخ و فـەلـەک و مـەلـەک دیـارن[(٣)]
(شـــمس و کواکـــب و أبـــراج)
زوهــرە ب قرانــێ قــابێ قــەوســەیــن
(و الـــنجم اذا هـــوی بمـــدراج)
دەنگـێ مـــەلـــەکـان زمێهنــە[(٤)] زمــزم
ئـەرواح ژ[(٥)] عــشقێ تێنــە معــراج
دل بــەحــرە و ســەد هــەزاری مــەوجــن
عارف[(٦)] چ خەبەر ژ بـەحرێ مـەوواج

(١) سیماب ژ خەجلە مایە رەجراج (ئامەد).
(٢) شەوقێ (ئامەد).
(٣) دبارن (یووسفی) دبازن (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) ز مهتە (پاشا، کۆڤلی، عەمەر).
(٥) د (ئامەد).
(٦) زاهد (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).

بــۆری و ب غــەنجــەکــێ مــەلا کوشــت
ئـەو غونچـە لـەبـا دەلال وغـەننـاج[1]

(١) ئەو مەعدەنێ رەمز و ناز و غەنناج (ئامەد).

## دل ژ علاجێ..

دل ژ علاجــێ كــو بــدەركــت مــزاج
دێ ژ لـەبێ نۆشـێ عـەطـا بت عـلاج
ئايينـەيـێ جـامێ جـەهـان بينـێ جـەم
بـادەيـێ لـەعلـەينـە د جاما زوجـاج
ئـاڤێ حـەيـاتێ ب مـە دا شـەربـەتـەک
زنـدە كـرين مـا ژ عـەدوو ڕا نـەشـاج
بـەنـدە كـرم گـەر چ شـەبـەهـ فيـل بـووم
سـيمبەرا سـاعد و بـازوو ژ عـاج
ئەختەرێ ئقبال و مەهێ بورجێ بەخت
مهر و سپهر و كەمەر و تەخت و تاج
كووسێ كو هنگاڤتی ب شاهی ل تەخت
پادشـەهـان نـەقـدێ ڕەوان دا خـەراج
خوسرەوێ شيرينێ ل دەربـەنـدێ حوسن
سـيمبەران لازمـە لـێ مـوهر و بـاج
سككەيێ شعرێ مـە ب نـاڤێ تـە هات
لـەو ب عـەيارێ د جـەهان دا ڕەواج
ئــابێ ڕەوان مــن دييــە شــعرا مــەلا
(ينكــر للمــاء لــسوء المــزاج)

# دیسا ژ نوو بێ حاله دل

دیسا ژ نوو بێ حاله دل     ساقی وەرین جاما زوجاج
موشتاقی خەمرا ئاله دل     لێ خوەشی ئانی[1] بت مزاج

ساقی کو دێ[2] مەهوەش بتن     کاکول ژ شێڤا[3] ڕەش بتن
قەرقەف بلا ئاتەش بتن     ئەم دێ ب وێ دل کین علاج

دا ئەم ب وێ دل حەی بکین     پێ سینه داغ و کەی بکین
سەد مەنزلان پێ گەی بکین     ئەو دێ د سەیرێ دت[4] ڕەواج

بێ نوور و نارێ موجبەتێ     بێ نەقش و وەصفێ[5] قودرەتێ
ناچین[6] مەقامێ وەصلەتێ     (نور لنا واللیل داج)

ئەڤ نار و سیقالا[7] دله     دائم ل وێ قالا دله
نەورووز و سەرسالا دله     وەقتێ هلێتن[8] ئەو سراج

حەتتا ب نوورا بادەیێ     ڕەنگین نەکی سەججادەیێ
دووری ژ وێ شەهزادەیێ     دوڕدانەیا گەردەن ژ عاج

---

(١) پێ خوەش دبت (ئامەد).
(٢) ساقی دڤێ (ئامەد).
(٣) شیشا (کۆڤلی).
(٤) کت (عبدالسلام، زڤنگی، حەلەب، وەستانی).
(٥) صونعێ (ئامەد).
(٦) ناچی (ئامەد).
(٧) نارێ سیقالا (عەمەر، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی) نوور و سیقالا (کۆڤلی).
(٨) کو هل بت (ئامەد، وەستانی).

دوڕدانـــەیـــا گـــەردەن بلـــوور رەیحان ل سـەر[1] وەردێـن د جوور
هـەی هـەی ب مـەستی تێنـە دوور خـالا ل نـک فـەرقـێ ب تـاج

مهـرا تـە پـوڕ ئـەبتـەر کـرین خـالان ژ بـەر[2] بـسکان دەریـن
زولفـا[3] موسـەلسـەل عـەنبـەریـن چـین چـین ژ چینـێ تێتـە بـاج

تـــەنهـــا نـــە کوردســـتان ددن شـــیراز ویـــەنـــگ ووان[4] ددن
هـەر یـەک ل سـەر چـەهڤـان ددن ژ ئـــەســـپەهـــان تێـــتن خـــەراج

چەهڤێن بـەلـەک قـەوسێن هـەلـەک چـەرخ و فـەلـەک غالـب مـەلـەک
(فـــي حبهـــا عمـــري دلـــک[5] والحـــب یجـــري فـــي عجـــاج)

شـاهد هـەزار ڕەنـگ خـەمملـین رەقـص و سـەمـا پـێ کـەمملـین
ئیـــرۆ مـــەلا ئـــەم ســـەد دلـــین ســـاقی وەریـــن جامـــا زوجـــاج

---

(١) صوبحان ژ سەر (پاشا) رەیحان ل سەر دێم بوونە هوور ( حەلەب).
(٢) بن (کۆڤلی) ژ بن زولفان (ئامەد).
(٣) بسکێ (ئامەد).
(٤) شیراز و گورجستان ددت (ئامەد) نەیگ و دان (کۆڤلی) نەیگێ وان ( عەمەر) وکۆڤلی دبێژت : نەیگ باژێرەکە ل تورکستانێ، و ل نک کۆڤلی ل جهێ (دن) ل هەر سێ جهان (دل) هاتییە.
(٥) هلک (ئامەد).

# قافییا ( ح )

## پورِ مەکە ئسرافێ

پـورِ مـەکـە ئـسرافێ د قـەتلـێ موبـاح
(سـفک دم العاشـق مـالا يبـاح)
سینە ب دەستێ خـوە موبـارەک ڤـەکـە
(تعـرف کـم فـي کبـدي مـن جـراح)
دل ژ هـەوایاتـە و[1] فکـرێن د هـوور
(فـي لجـج بـين هبـوب الريـاح)
عـشق گها کێ و ل عـەقلـێ[2] خـوە مـا
(يفتـک بالعاشـق حـسن المـلاح)
دێ دوسیەهـ سورمەیێ چەڤێن خوە کت[3]
خـاکێ رِەهـێ یـارێ صـەبا هـەر صـەباح
تـۆز و غوبـارێن سـەحـەرێ بـەر چـەمـەن[4]
(قـد نـشر الطيـب و بالمـسک فـاح)
فێـرس و رِمبـاز گهـان یـەک ب تیـر
(أحمـد فـي البـين قتيـل الرمـاح)

---

(١) د (تنێ ل نک پاشا وئامەد نەبت).
(٢) ب حالێ (کۆڤلی).
(٣) کم (کۆڤلی) دێ د سیەهـ .. (ئامەد، عبدالسلام).
(٤) تۆز و غوبارێن چەمەنێ هەر سەحەر (ئامەد).

(بوســەزنــان هــر کــه بــران آســتان)

(مکـــن مـــن جبهتـــه لا بـــراح)

حـــل لـــه القتـــل بـــشرع الهـــوی

مـــن کـــشف الـــسر و بالـــسر بـــاح)

حوسـنێ ئـەدایـا تـە مـەلا هـەر کـێ دی

(صـــح لـــه أنـــک عـــین الفـــصاح)

# حەیف د قەیدا خاك و گل بت

حـەیـف د قـەیـدا[١] خـاک و گـل بـت عـارفێ چالاک رووح
دێ موجـەررەد بـت کـو پـەرتـەو دت ژ نـوو ئـەو پـاک رووح
قـەیـدێ خـاک و گـل نـەبـت دا بـێ حجـاب و پـەردە بـی
مثلــی بـــەدرێ جارنـــان تێخــت خوســووفێ خـــاک رووح
شەمعێ سـەر[٢] نـوور نـادرت گـەر ئـەو نـەکـت پـەرهیـزێ دل
ذەوقــێ جامــا عــشقێ ناکـت گـەر نـەکـت ئمـساک رووح
دل ب طـایـــەک نێرگـــزان دە[٣] نازکـــەک تـــەروەنـــدە دە
گـول دکـن[٤] تـەشبیهی خـاران هـەر خـەس و خاشـاک رووح
جــامێ عــشقێ پــاکێ رووحــانی طـــەهـــوورا باطنـــە
شـەووشـی و هـەر[٥] وە مـا حـەتتـا ئـەبـەد ناپـاک رووح
هـەیئـەتـا کـەیـف وکـەمـێ بـێ[٦] کـەیـف و کـەیفـا عارفـە
دێ بمینـــت گـــەر نـــەبـــت ناچـــار بـــێ تـــەریـــاک رووح
دێ ب گـــولزارا جـــەمـــالا ســـەبـــزە پووشـــان وێ چ بـــت
ئـــێ د مهـــرێ دا نـــەبـــت دل پـــارەپـــارە چـــاک رووح[٧]

---

(١) حەیفە قەیدا (پاشا، ئیسماعیل، کۆڤلی، عەمەر، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٢) سرِ (ئامەد، عبدالسلام).
(٣) و (ئامەد).
(٤) نەکن (ئیسماعیل) دکت (ئامەد).
(٥) ئێ نەنۆشی هەر (ئامەد، عبدالسلام، زڤنگی، حەلەب، وەستانی).
(٦) لێ (ئیسماعیل).
(٧) ئەڤ مالکە د چاپا حەلەبێ دا نینە.

بــەر ژ جــان دەرراکــەیــەک[1] ڕەوشــەنتــەر و والا دڤێــت
صــوورەتــێ حوســنا موقــەددەس دا بکــت ئــدراک رووح
گــەر خــەبــەرداری ژ ســڕڕا (کنــت کنــزا)[2] گوهــ بــدێر
دا ب سەد نووریٚ[3] بەیان کت مەعنەییٚ (لـولاک)[4] رووح
لامعــێ ســڕڕا تــەجــەلــی ســەر ل طــووریٚ دل ددت
ضـەبـط ناکـت وێ مـەجـالێ سـەد هـەزار ئـەفـلاک رووح
هەردو ئیلانێن[5] تە دی مـن طـەوقـێ گـەردەن کـر[6] مـەدام
دا مـە هـەر بێـتـن تـەبـەسـسوم وەی گـولا ضـەححـاک رووح
جـەوهـەرێ حوسـنێ ئـەدا تـەنهـا دبـت مـەقبـوولێ طـەبـع
گەر نە صەیقەل دت ب نووریٚ عشقێ وەک حەککاک رووح
دێ ب ڤــی ئــەنـداز وتــەرزی کـەی[7] ببـت سـحرێ حـەلال
گـەر نـە بـالا طـەبـع بـت وەک پـەهلـەوان چـالاک رووح

(١) پوڕ (ئامەد) پوڕ ژ جان ڕا دەرگەهەک (کۆڤلی).
(٢) ئەڤە ئیشارەتە بو وێ حەدیسا قودسی ئەوا دبێژت: (کنت کنزاً مخفياً فأردت أن أعرف فخلقت الخلق ليعرفوني) ملا (علي القاري) دبێژت: ئەو حەدیسەکا بێ بناخە ومەوضووعە. بڕێنە ( الأسرار المرفوعة في الأخبار الموضوعة) بپ ٢٦٩، دیسا بڕێنە: ابن عراق: (تنزيه الشريعة المرفوعة من الأخبار الشنيعة الموضوعة) ١٤٨/١.
(٣) ڕەنگی (ئامەد) نەوعی (کۆڤلی) تۆری (زڤنگی، ئامێدی) گهوران (وەستانی، حەلەب).
(٤) ئەڤە ژی ئیشارەتە بو وێ حەدیسا قودسی ئەوا دبێژت: (لولاك لولاك لما خلقت الأفلاك) وئەو ژی یا بێ بناخەیە وەکی مەلا علي القاري دبێژت (الأسرار المرفوعة ٢٨٨) و ابن الجوزي د (الموضوعات) دا ٢٨٨/١، سەیدایێ ناصر الدين الألباني د (سلسله الأحاديث الضعيفة والموضوعة) ٤٥٠/١.
(٥) ڕەشمارێن (ئامەد).
(٦) بن (ئامەد).
(٧) دێ (عبدالسلام) وێ (وەستانی).

دل ب رِم ئاڤێهـت وه لـێ[1] وێ بـارکری قـەوسـێ شـەڤـی
دێ بـدت بـەر گـەزمـەیـان بـێ سـووج ئـەو سـەففـاک رووح
شـەهـسوار ئیـرۆ کـەمـەنـد ئاڤێهتنـە[2] قـەلبـێ مـەلـێ
بـەنـد ناکـت غـەیـری فتراکـا تـە سـەد فتـراک رووح

(١) دلبەرم ئاڤێتە دل (ئیسماعیل، ئامەد).
(٢) شەهسوارێ من کەمەند ئاڤێتییە (ئامەد).

## عشقێ كو بدن

عـشقێ كـو بـدن ب يـەک دو ئـەرواح
پەيوەستە دڤێ ب هەڤ بن ئەشباح
جـان و جـەسـەدان كـو ئتحـادە
(و المـاء لـه المـزاج بـالراح)
وەصـلا تـە ل جـان و دل حـەياتـە
(مـن ذاق مـرارة النـوى طـاح)
تـەنها نـە د سينە مـن خـەدەنگـن
(من لحظك في القلوب أرماح)
پەروين ژ[1] شەفەق سەحەر خويا بوون
(لا بـدع و فيـه منـك مـصباح
لـو مـست مـن الهـوى كبـان[2]
لا بـدع وقـد تميـد أرواح)[3]
هەر شام و سەحەر ب دەستێ خووبان
(مـن خمرتنـا تـدور[4] أقـداح

(١) د (ئامەد).
(٢)أو مست.. (ئامەد) كتان (كۆڤلی).
(٣) تميل أدواح (كۆڤلی) تميل أرواح (ئامەد، وەستانی، حەلەب).
(٤) تدوح (پاشا) تروح (عبدالسلام).

إفـــــتح بلقـــــاک قفـــــل قلبـــــي
فالقلـــب لـــــه لقـــاک مفتـــاح)
سـەییـاح مـە دیـن د خـەلـوە ئیـرۆ
ئـەللاهـ کـو چ خـەلـوە و چ سـەییـاح
بـــەرقـــێ کـــو ڤـــەدا ژ بـــەر نقـــابێ
(و اللامـــع مـــن ســـناه قـــد لاح)
قـەوس و قـوزەحـان نومـان ژ بـالا[1]
(و العنبـــر مـــن شـــذاه قـــد فـــاح)
ئایینـــەیـــێ دل مـــەلا جـــەلا دە[2]
(مـن طلعتـه فقـد صـفی الـراح)[3]

(١) قەوسێ قەزەحان نوما ژ بالا (ئامەد).
(٢) دا (زڤنگی ئامێدی) ما (کۆڤلی).
(٣) ئەڤ شعره د دانەیا (ئیسماعیل) دا نینه.

# قافییا ( خ )

## ئاهێ ژ دەردێ دل نەکت

ئـــاهێ ژ دەردێ دل نـــەکـــت[1] هــەرچـــی نــەدی ئــازارێ چـــەرخ
دەربـــــــــێ ل نێڤـــــــا دل ددت لامـــع صـــفەت نووبـــارێ چـــەرخ

تـێن سـینەیـان[2] پـەیکـان نهـین ئامـــانجێ وان تیـــران ئـــەمـــین
دامـــا بـــەلایـــێ دەر کـــەمـــین هــەرگۆشــە دۆرمــادارێ[3] چــەرخ

بیـــرا خـــوە تیـــنن غـــەنجـــەیـــان عاشـــق د نێـــڤ ئـــشکەنجـــەیـــان
تاڤێتـــە دل بـــەر[4] پـــەنجـــەیـــان هــەردەم ژ نـــوو شـــونقارێ چـــەرخ

کـــو ڤـــان[5] لـــەطیفـــان گولعـــذار لـــەو تـێن ژ بولبـــول ئاهـــ و زار[6]
شـــونا گـــولان ڕەســـتینە[7] خـــار نێڤـــا جهـــێ گـــولزارێ چـــەرخ

ســەد بازییــان ئــەڤ حــەققــەبــاز تینـــــــت ب حیلـــــــە کارســـــــاز
گـەهـ گـەهـ کـو نـازە وگـەهـ نیـاز[8] سـەحـار و پـوڕ مـەککـارێ چـەرخ

---

(١) دکت (ئامەد، عبدالسلام، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی).
(٢) سینە بان (عبدالسلام).
(٣) دورئامارێ (پاشا، عەمەر) دا ئامارێ (کۆڤلی) وداماری (ئیسماعیل).
(٤) پوڕ (ئیسماعیل، عبدالسلام).
(٥) تیردان (کۆڤلی) ژ کۆڤان (ئیسماعیل، ئامەد، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).
(٦) ئاهـ هەزار (عەمەر).
(٧) ڕەشتینە (یووسفی).
(٨) گەهـ ئەو ب تازە گەهـ ب ناز (ئامەد).

هەرچی بخوونت[1] صوحبەتێ      ئاخر د جاما شەربەتێ
زەهرا هەلاهل دێ دەتێ      دا دل نەدن ئازارێ[2] چەرخ

ئەڤ ئەررەیا ژەهری ددان      من ژێ د دل دا بن[3] سنان
ما ل بەهرێ فەرقێ دژمنان      بێت و بڕەت منشارێ چەرخ

دژمن ژ جان تالان بتن      ئەو خوەهرێ وەک نالان[4] بتن
مێلاک و دل کالان بتن      لێ بێت وڕەت غەددارێ[5] چەرخ

داڤ گەهتە خانی[6] مثلی دەیر      چەندین کەواکب تێنە سەیر
پێکان ب داڤێ[7] شوبهی طەیر      هەر ژێ دبارن تارێ[8] چەرخ

ئەو گەزمەیێن وەک شوور و تیر      رەجم و بەلا ژێ تێنە ژێر
هندی کو دلبەر تێنە سیر      هەر وێ ئەڤە کردارێ چەرخ[9]

شەمس ب شەمس جام ب جام[10]      حەتتا دکن دەورێ[11] تەمام
ئاتەش درێژت هەر مەدام      ئەڤ گونبەدێ دەووارێ چەرخ

---

(١) هەرچی کو بینت (ئامەد).
(٢) غەددارێ (ئامەد) هەذذارێ (عبدالسلام).
(٣) نن (زڤنگی، ئامێدی) ین (ئامەد).
(٤) ئەو خوە هەرۆ نالان (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) دشوارێ (ئامەد).
(٦) دەڤ کوهنە (ئامەد، زڤنگی، عبدالسلام) خالی (وەستانی، حەلەب).
(٧) دتاڤێ (پاشا، کۆڤلی).
(٨) تاڤێ (پاشا) بارێ (یووسفی، عەمەر) نارێ (زڤنگی).
(٩) ئەڤ چارینە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هاتییە.
(١٠) شەمس و قەمەر نەجمێ عظام (ئامەد).
(١١) دەردێ (پاشا، یووسفی، عەمەر).

ئاگر د ئاب و گل[١] دکت — قەلبان ژ قەلبان[٢] هل دکت
مەتقەب د جان ودل دکت[٣] — دائم ئەڤستن[٤] کارێ چەرخ

چەندین د خووبانن ڕەزم[٥] — من ژێ د دل دانن گەزم
ئامانجێ وان ڕەمزان[٦] ئەزم — سەرعەسکەرێ سەییارێ چەرخ

من پوڕ شەڤان حەتتا سەحەر — دانینە ڕێ سەمع و بەصەر
ئەو ماهڕوو ما[٧] بێتە دەر — تا[٨] بیمە نەوبەتدارێ چەرخ

کەس دی ل لەوحێ سینە قەط — نەقشەک ڤە هاتی بێ غەلەط[٩]
هەردەم ژ نوو یەک تازە خەط — تاڤێتە دەر پەرگارێ چەرخ

مە ژ حەسرەتا شیرین لەبان — خەو تێتە چەهڤان قەط شەبان
فەریاد دەرن[١٠] بەر کەوکەبان — پورسێ بکە ژ بیدارێ چەرخ

ڤان ڕەهرەوێن[١١] هممەت بلند — بەردانە مەیدانێ سەمەند[١٢]

---

(١) ئاگر وئابێ گل (وەستانی، حەلەب).
(٢) قیلبە (ئامەد).
(٣) مثقەب د نیڤا دل دکت (ئامەد).
(٤) دبینت (کۆڤلی) ئەڤەکرداریێ (عبدالسلام) ئەڤیتن (ئامەد).
(٥) چەندین کو خۆبان بێن ڕەزم (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی) جندی وخووبان (عبدالسلام) چەندی دخووبانێن (وەستانی، حەلەب).
(٦) تیران (ئامەد).
(٧) تا (عبدالسلام).
(٨) لەو (عبدالسلام) لەو بوومە (ئامەد).
(٩) دەر غەلەط (ئامەد).
(١٠) دەر (یووسفی، زڤنگی، ئامێدی) دچن (ئامەد).
(١١) هەردوێن (پاشا) زەهرە ڤێن (کۆڤلی).
(١٢) کەمەند (پاشا، یووسفی).

سەرگەشتەیین[1] حەتتا ب چەند　　ئەڤ رەکبێ مەشعەلداریێ چەرخ

گاڤەک ژ دەنگێ زەنگلان　　ئێمن چ ڕوونین مەنزلان
هەی هەی ببینن مەحملان　　فەریادە هەر قەنتاریێ چەرخ

پوڕ من ژ ڤێ چەرخێ مەلا　　کێشانە ئافات و بەلا
ئەبلەه دبینم وی هەلا　　هەرچی ژ دل بت یاریێ چەرخ

(١) سەرگەشتە بین (عبدالسلام).

# دلبەرێ ئیرۆ سەحەر

دلبـــەرێ ئیـــرۆ ســـەحـــەر ئاڤێتـە جـەرگـێ مـن دو دۆخ
یـــەک ل ســـینە یـــەک ل دل دا لـەو ژ مـن تـێن ئـاخ و ئـۆخ

ئاهـ و ئـۆخێن مـن ژ دل تـێن لـێ ژ بـەر تیـرا قـزل تـێن
یـان ژ کۆڤـانێن د کـول تـێن ژێ دزێـت هـەر خـوون و زۆخ

خـوون ژ دل جۆجـۆ ڕەوان تـێ وەک عـەقیـق و ئـەرغـەوان تـێ
لـێ ژ دەست سـەلـوا جوان تـێ ئـەو شـەپـالا شـەنـگ و شـۆخ

ئـەو شـەپـالا شـۆخ و شـەنگـە کـافرا ڕۆم و[1] فـەڕەنگـە
دامـە بـەر جوهتـەک خـەدەنگـە ظـالمێ کوشـتم ب دۆخ

ظـالمێ کوشـتم شـەپـالێ نـازکێ قـەنجـێ دەلالـێ
بـوون حجابـا زولـف و خـالێ ئێـدەک و عـالا[2] و تـۆخ

نـەتـرک[3] و تـایێن ب ڕیـشی ئـێ د زێـڕن پێڤـە ویـشی
مـن دو فێـرس دیـن د بیـشی[4] مـروەت و ئنـصاف یـۆخ!

لـەو هـەڕفـتم ئـەز ژ مـەیلـێ شوبهەتی سەهل و سوهەیلێ[5]

---

(١) ڕۆمێ فرەنگە (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٢) بەرقەع وئالا (حەلەب، وەستانی) بەیرەق وئالا (ئامەد).
(٣) بیرک (پاشا).
(٤) پێشی (یووسفی، زڤنگی، ئامێدی).
(٥) سەهلێ ژ سەیلێ (عبدالسلام) سەهلی وسوهەیلێ (ئیسماعیل، زڤنگی) سەهلا د سەیلێ (ئامەد).

موحبــەت و عــشقا د لــەیلــێ　　ئــەز کــرم یــەکــسەر پلــۆخ

دەســت نــە هــێلم ئــەز ژ دینــێ　　شــوبهی فــەرهــاد و شــرینێ
وەر[1] ژ بـەر عـشق و ئـەڤینـێ　　مــن د رێ چــت ئـەڤ کلـۆخ[2]

صــوحبەتــا چـەرخ و سـەمـا تــێ　　وەک مـەلـێ سـەد موبتـەلا تــێ
زەمـــزەم و ئاڤـــا حـــەیـــاتێ　　موشـتەری سـەد شـەیـخ وشـۆخ

(١) دێ (ئامەد).
(٢) دا جان فرۆخ (حەلەب).

# هەی هەیا رەقص و سەمایا تە

هـەی هـەیـا رەقـص و سـەمایـا تـە چ خـوەش بـەستییە چـەرخ
کو ل سلسل[١] ب سەما تێت و ل سەر دەستی چوو[٢] بـەرخ
صـــووفییێن هــەر د طــەوافــێ (حجـر الأسـود)ە قــەصـد
گـول و سـونبول ب سـەمـا تـێن حـەمییـان زمزمـە چـەرخ
نـەقـشێ ئـەلماسـی ژ[٣] ئـەلماسـی بنـێ گرتییـە حـەرف
خـــەطـــێ یـــاقووتی ل یـــاقووتی شـــکێناندییە نـــەرخ
کـــەررخـــین ئـــەم د قیـــامێ[٤] مـــە ژ دل پـــەردە دڕانـــد
عـــارفێ وەقـــتم[٥] و مـــەعـــرووف بـــلا بێـــت ژ کـــەرخ
دا بناســی خــەطــەرێــن ڕێ تــو[٦] نــەبــی غافــل ژێ[٧]
دجلـەیـە لـێ د پـوڕن[٨] بڕبـڕێ پێـل و بـەر و مـەرخ[٩]

(١) د بورجێ (ب تنێ ل تک پاشای نەبت).
(٢) خوە (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام).
(٣) ل (ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی).
(٤) چەرخین ئەم د قوبابێ (کۆڤلی).
(٥) وەقتیمە (ئامەد).
(٦) خەطـەرین رەئی و (ئامەد).
(٧) پێ (عبدالسلام).
(٨) دبڕن (ئامەد).
(٩) مەر وبەرخ (وەستانی، حەلەب) بەر و بەرخ (ئامەد).

پیـــرێ شـــەعـــارە د شـــعرێ و مـــەلـــێ شـــال فـــرۆش
تو نشان[1] مـن مـەدە فـەرخێ[2] كـو ل نـك مـن بوویـە فـەرخ

(١) لەو نشانی (پاشا، یووسفی، عەمەر، كۆڤلی).
(٢) فەخری (وەستانی، حەلەب).

# قافییا ( د )

## سرێ وەحدەت

سـرێ وەحـدەت ژ ئـەزەل گرتییـە حـەتتـا ب ئـەبـەد
واحـد و فـەردە[1] ب ذاتـێ خـوە وی نیـنن چوعـەدەد
د قـدەم دا ئـەزەل و عـەینـی ئـەبـەد هـەردو یـەكـن
سـەرمـەدییـەت وە دخـوازت نـە ئـەزەل بـت نـە ئـەبـەد
فـەرقـە واحـد ژ ئـەحـەد لـێ د مـەقـامێ صـەمـەدی
ب حـەقیقـەت كـو یـەكـن هـەردو چ واحـد چ ئـەحـەد
یـەكـە دەریـا تـو بـزان قـەنـج چ مـەوج و چ حـەبـاب
د ئـەصـل دا كـو حـەمـی ئاڤـە چ ئـاف و چ جـەمـەد
ئافتـابێ ئـەحـەدییـەت د خـوە دا گرتییـە كـەون
نـەكو عـەورەک هـەیە لـێ گرتییـە چەهڤێن مـە رەمـەد
حوسـنێ ذاتـێ بـوت و لاتـان ژ جـەمـالا صـەمـەدە
ژ[2] مثالێ صەنەمی وەهـ[3] کو تەجەللایا[4] صـەمـەد!

---

(١) واحدەک فەردە (بەغدا).
(٢) ل (بەغدا، ئامەد).
(٣) هەر (ئامەد).
(٤) تەجەللایە (بەغدا).

غـەيـرى دەريـا نييـە صـەحـرا ب حـەقيقـەت ئـەمـا[1]
ژ ڕووێ كەيفە كو[2] ئەڤ ئاڤە بـوويى شـوبهى زەبـەد[3]
(كــل يــوم هــو فــي شــأن) نــەبــى غافــل ژێ[4]
هـەر پـەياپـەى ژ شـوئوونان دكـرت فـەيـض و مـەدەد[5]
گـــەر د ئـــادەم بـــديا ســـڕرێ علـــم ئبليـــسى[6]
(حينمـــــا أبـــــصره كبـــــر حينـــــا و ســــجد)
چ زەمـــان و چ مـــەكـــان و چ جهـــاتن چ حـــودوود
چ مـــەقـــادير و تـــەفاصـــيل و حـــسابن چ عـــەدەد
چ موناف‍ـــات و لـــــوزوومن چ قيـــاس و چ مثـــال
ئـەڤ چ تـەوليـدە چ تـەركيبـە چ رووحـن چ جـەسـەد
سـەر ب عـەجـزێ ددەرت قـووەتـێ دەرراكـەيـێ مـا
(رجـــع القلـــب كلـــيلا و متـــى قـــام قعـــد)
حيـرەت و عـەجـزە سـەرئـەنجـام د بـابێ نـەظـەرێ
(كـــىْ بخـــالقْ نظـــر قاصـــر مخلـــوقْ رســـدْ؟)
گوفت و گۆ مـەعرفـەتێ[7] چـەندى مـەلا پـەيدا بكـى
گـەوهـەرا مـەعرفـەتـێ نـاگهتێ كـەس ب خـرەد

---

(١) ب حەقيقەت تو بزان (ئامەد).
(٢) كەيف و كەممێ (ئامەد، كۆڤلى، حەلەب، وەستانى) كەففە كو (عبدالسلام).
(٣) ژ ڕوويێ ئاڤە هەمى ئاڤە بوويى شوبهى جەمەد (ئامەد).
(٤) تو غافل مەبە ژێ (ئامەد).
(٥) فەيضێ مەدەد (بەغدا، ئامەد، پاشا، يووسفى، عەمەر).
(٦) ئبليسى بەر سررێ علووم (وەستانى) گەر د ئادەم بدييا ئبليسى هەر سررێ علووم (ئامەد) سررێ عەلەم ئبليسى (بەغدا).
(٧) گوفت وگۆ چەندى مەلا مەعرفەتێ (پاشا، يووسفى، كۆڤلى، عەمەر).

## عیدە وهەر کەس ..

عیـدە و هـەر کـەس ژ دیـدارا تـە لـێ پیـرۆزە عیـد
ئـەز تنێ مـەحروومێ دیـدارم ب سـەد مـەنزل بـەعید
هـەر سـەحـەر دهنێـرم ئـەز جانـا ب ئاهـان ڕا ژ دل
(بـــارک البـــاري بإســـعاد علیهـــا یـــوم عیـــد)
دەرگەهێ لوطفا تـە خـانم مـا ل مـەحروومـان ڤـەبی
(إن کلبـــاً باســـطاً دهـــراً ذراعـــاً بالوصـــید)
پیـرەمـەردم[1] عاشـقم ئیـرۆ مـورادا مـن ببـەخش
(یـا حبیبـي یـا مـرادي یـا منـی قلبـي المریـد
فـــر عقلـــي مـــن لهیبـــي مثـــل بـــاز أو عقـــاب
ذاب روحـــي مثـــل مـــا إنحـــل فـــي نـــار جلیـــد
دمـــع عینـــي مـــن بکـــاءٍ مثـــل نـــار فـــي سـکوب
نـار قلبـي مـن غـرام فـي ضـرام[2] فـي الوقیـد)
دل ژ بـەر نـارێ مـەجازی بلحـەقیقـەت بـوو پـەڕەنـگ
(نـار قلبـي فـي هواهـا[3] مثـل نـار فـي حدیـد
کـــی خـــلاص أز دوزخ هجـــر تـــو یـــابم أی جـــوان
هـر نفـس دارد صـلاء[4] و نعـرء، هـل مـن مزیـد)

---

(١) پوڕ موریدم (ئیسماعیل، کۆڤلی).
(٢) خرام (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی، عەمەر، وەستانی).
(٣) هەواە (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) صەبا (یووسفی، کۆڤلی).

کـــی دزانـــت مـــن ژ ڕمبـــازان دەمـــا ئۆغلمـــە تـــێن
تێنە دل سەد ڕم ڕەوان[1] و سینە تێنێ سەد جەرید
مـــن ژ صـــەففـەینـا ژ نێڤـا مـەقتـەلـێ ڕم تێنـە دل
لێ ل وان دەستان نەهن خوون و غەزایە[2] ئەز شەهید
موصحەفا حوسن و جەمالێ سوورەتا[3] خال وخەطـان
(مـــا تلونـــا غيـــر حـــرفٍ ، لا و قـــرآنٍ مجيـــد)
گـەر چ هـەر دائـم ژ مهـرا[4] نـەینکـا دل بـەدرە مـن
وەک هلالـێ صـوبح تـێم ئـەز جارنـان بـم ناپـەدیـد
مـا ب لـەعلێن جانفـەزا نـاڤێ مـە بینـت جـارەکـێ
(بالـــدعا بلـــغ تحيـــاتي لـــسلمى يـــا بريـــد)
تو ژ مەلایی هەر[5] بپوڕس ئەسرارێ عشقێ حەل دکت[6]
ڤـێ موعـەممـایێ چ زانـن سـەد مـەلا وموسـتەعید
ئەر ب کوشتن وەر ب هشتن ئەمر وفەرمانـا تـە بت[7]
(أحمـــد عبـــد رقيـــق واقـــف بـــين العبيـــد)

(١) ژ وان (وەستانی، حەلەب، زڤنگی، ئامێدی).
(٢) خوونا غەزایا (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) صوورەتا (پاشا، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر).
(٤) میهرێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) مەلێ بوهتی بپڕس (عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).
(٦) ئەو حەل نەکت (ئیسماعیل).
(٧) یە ( حەلەب).

## نەیشەککەرا گەردەن ژ عاج

نـەیـشەککـەرا گـەردەن ژ عـاج		دیسا ب[1] ڕەشتۆزێن صەمـەد
قەوسێن ل بالا فەرق و تاج[2]		کـەیبـڕ ڕەشـاندن بـێ عـەدەد

کـەیبـڕ ڕەشـاندن بـێ حـساب		مصری کو دان سیقال و تـاب
سـەد ڕۆسـتەم و ئـەفراسـیاب		کوشـتن ل وان کـەرکر جەسـەد

سـەد پادشاهـ و خوسـرەوان		جـان دان ژ عـشقێ و ڕەوان
شیرین[3] و لبسێ ئـەرغـەوان		مـن دیـن ل بـەژنـا (سرو قـد)

من دیـن ل بـەژنا عـەرعـەرین		تـایێن[4] زوبـاد و عـەنبـەریـن
بـایێ صـەبـا دا چـەنبـەریـن[5]		زولف چوونه سەر نوورا صەمـەد

زولف چوونه سەر نـوورا زەلال		جـارەک وەرە بـایێ شـەمـال
بـسکان ژ سـەر دێمی ڤـەمـال		زولفان ل سەر[6] جوهتێ ئـەسـەد

سـەحـارێ جـوهتێ جـادووان		ئیـرۆ ژ ڕەمـزا ئـەبـرووان
دل گـرت و دا بـەر کاشـووان		کـەرکـر ل مـسکینان کـەبـەد

---

(١) ژ (ئیسماعیل، کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).
(٢) فالا ل نک فەرقێ ب تاج (ئامەد).
(٣) نەسرین (کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی) شێرین د (ئامەد).
(٤) بهنا (ئامەد).
(٥) پەنجەرین (ئامەد، یووسفی) بایێ صەبایێ ڕاست و چەپ (ئیسماعیل).
(٦) ژ بەر (ئامەد).

دل گـرت و دا بـەر خـەنجـەران　　　کوشــتم نگــار و[1] دلبــەران
مە ژ دەستێ ظـولما ئـەسمەران　　　داد و مـــەدەد داد و مـــەدەد

دلبەر ژ لەعلێن خوەی شەفاف　　　دا من مەیا گولگوون و صاف
دەریـایێ عـشقێ قـاف و قـاف　　　پەیـوەسـتە تێـتن جـەزر و مـەد

حوسـنا مونـەززەهـ بـێ مثـال　　　سـەردا لباسـێ خـەط و خـال
سەرگەشـتە حـەیـران مـایی لال　　　ئـەحمـەد کـو دی نـوورا ئـەحـەد

ئـەللاهـ ژ نـوورا سـەرمـەدی　　　یەک قەطـرەیـەک دا ئـەحمـەدی
شـیرینی و ڕەمـزەک[2] وە دی　　　مـەدهـووش مـا حـەتتـا ئـەبـەد

(١) نگارا (کۆڤلی).
(٢) فررەک (ئیسماعیل) لذە (کۆڤلی).

# قافییا ( ر )

## ئاهـ ژ دەستێ وێ سورێ

ئاهــــ ژ دەســـــتێ وێ ســــورێ[1]    دل ژ مــــەیــــێ[2] حـــەوالــــە کـــر
هــــەر چ ل مــــــن کــــری مــــەلا    جــــامێ مــــەیــــا دوســــاله کـــر

شــەنگــێ ب نــازی مــەشــشها[3]    مــــسک و زەبـــــاد وەشــــــشها[4]
ڕوو مــــە د بــــن پیبیانـــــە هێـــژ    زێــــدە ل مــــن دەلالــــە کــــر[5]

چیچــەک و گــول ســەحــەرگــەهــان    نــەســـتەرەنـــێن د خــەرگــەهــان
تێــــک ژ مـــــسک ومــــــاوەرێ    مــــارە[6] خونــاف و ژالــــە کــــر[7]

دێمــی[8] و بــسک و خــەمرییــان    تــــا و لفـــێن د شــــەترییـــــان[9]
مانــە تــەمــام کــەســک و ســوهر    بــــەدرە ل دۆرێ هالــــــە کــــر[10]

---

(١) من ژ غەما ب سەد بەلا (ئامەد، کۆڤلی).
(٢) دل ل مەلێ (ئیسماعیل) دل ل مەیێ (ئامەد).
(٣) سونبولێ زولف کو مەششها (ئامەد).
(٤) مسک و زەباد ژێ وەششها (ئامەد).
(٥) پیاله کر (ئیسماعیل) مارێ سیەهـ کو خوەششها عەقل ل من.. (ئامەد).
(٦) تازە (کۆڤلی) ماهێ (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب) سونبول ل بەر سێڤ و بهان تازە خوناف و ژاله کر (ئامەد).
(٧) من ژ غەما ب سەد بەلا (ئامەد، کۆڤلی).
(٨) کاکول (ئامەد).
(٩) تا و د زولفێ شترییان (وەستانی، حەلەب).
(١٠) بوونە هەلەک ل سەر ڕوویان حەلقە ل بەدرێ هاله کر (ئامەد).

دوور کرین ژ سونبولان | چیچەک وبشکۆ وگولان
دل ژ مە ڕەنگێ بولبولان | شوبهەتی داغێ لالە کر

پیرێ موغان ژ شیشەیێ | دا مە سەفینەکی[1] مەیێ
شوکور خودێ کو قولزومەک[2] | من ژ خوە ڕا قەبالە کر

خضرێ د[3] رەمز و موعجزێ | مەست مە دی[4] د دەنگزێ[5]
هات پەیالەیەک د دەست[6] | ئەشکەرە سەد پەیالە کر[7]

غونچە لەبا ژ ڕەنگ گولێ | دێمێ ب سڕ نوما[8] مەلێ
شوبهەتی بولبولان سەحەر[9] | لەو مە فەغان و نالە کر

---

(١) پەیالەیەک (ئامەد).
(٢) چەنگ و دەفەک د هەی هەیێ (ئامەد).
(٣) ب (زڤنگی).
(٤) قەدی (وەستانی).
(٥) مەست مە دی دو نێرگزی (ئامەد).
(٦) ئانی ڤیالەک ب دزی (ئامەد).
(٧) ئەڤ مالکە دچاپا حەلەبێ دا نینە.
(٨) هاتە ل سەر سەرێ (ئامەد).
(٩) دل هەررشاندی وێ وەلێ (ئامەد).

# دەرێ مەیخانەیا عشقێ

دەرێ مــەیخانــەیــا عــشقێ ســەحــەر عــارف زیــارەت کــر
ب ئابێ چەشم و خوونێ دل ووضوو بەست و طـەهارت کر
وەریــن[1] جامــا هلالــی دا ژ عــەکسێ مــاهێ نــەو بینــی
کو خانێ[2] مهر و جەرگێ چەرخ[3] و خوانێ رووزە غارەت کر
ب میزان قەوسێ ماهێ نەو ب[4] وەجهێ دلبـەرێ مـن دی
ژ[5] چەشم و گۆشەیێ ئەبروو ب دۆر جامێ ئشارەت کر
ب ئەبصاران نەظـەر من چوو ژ چەرخێ[6] قەوسێ ئەبroویان
شوکورخوازین[7] کو چەهڤان کار بەر عەینێ بەصارەت کر
ژ بــەر دێمــی نقــاب ئاڤێهــت و دەســتوورا طــەوافــێ دا
د سەعیێ بەیت[8] و ئحرامێ و مـن ئەسوەد زیارەت کر

(١) دەرین (کۆڤلی).
(٢) خوونێ (یووسفی).
(٣) جەرگێ خوە (یووسفی) تەرک و چەرخ (کۆڤلی) تەرکێ چەرخ (شۆشی) کو ئەو مەککارێ شۆخێ چەرخ (ئامەد).
(٤) ل (شۆشی، ئامەد، کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).
(٥) ب (ئامەد).
(٦) ب ئەبصارا نەظەر من کر ل دۆرێ (ئامەد).
(٧) شوکورخوانین (عبدالسلام).
(٨) بەست (ئامەد، حەلەب).

د دیـدارێ هـەزاران جـان نثـارێ[1] مـەقـدەمـێ یـارن[2]

کـەسـێ جانـان ب جـان بینـت ب عـشقێ وی تجـارەت کـر

ب دینـارێ دەنـی[3] زنهـار دا یـارێ خـوە[4] نـەفرۆشـی

کـەسـێ یووسـف فرۆتـی وی د عالـەم دا خـەسـارەت کـر

تنێ[5] ئەو سەجدەیا شوکرێ تە بت[6] محرابێ قەوسەینان

کو[7] دەلق و شەمل و سوججادە ب ڤێ ئاڤێ قەصارەت کر

د بەحثێ لـەعلێ لـەب هەر خام نـارت طـەبعێ ئـەلماسی

وەلـێ تـەئثیـرێ فـەیـضێ مهـرە تـەدبیـرێ حـەرارەت کـر

د ئعجـازا بـەیـانێ دا سـوخەن گـەر بێتـە ئنـصافێ

دزانت موختەصەر هەر کەس مـەلـێ سحرێ[8] عبارەت کر

---

(١) نشارێ (یووسفی) نیشانی (کۆڤلی).

(٢) یارم (پاشا، ئامەد، عەمەر، عبدالسلام).

(٣) دنێ (زڤنگی، عبدالسلام) ب دونیائێ دەنی (ئامەد).

(٤) د هندەک دانەیان دا هاتییە: (دا یارێ خوە تو نەفرۆشی) هاتییـە، وپـەیڤا (تـو) د هندەک دانـەیان دا وەکی دانەیا (حەلەب، وەستانی، پاشا، کۆڤلی) نەهاتییە، وئەو دورسـتترە؛ چونکی ئـەڤ پـەیڤـە ژ لایـێ کێـشێ ڤـە یا زێدەیە. و د دانەیا (ئامەد) دا پەیڤا (دا) نەهاتییە.

(٥) ببی (عبدالسلام) قەبوولە سەجدەیا شوکرێ (ئامەد).

(٦) دبت (شۆشی) بر (زڤنگی) دبەر (عبدالسلام) ل بەر (ئامەد).

(٧) مە (ئامەد).

(٨) سحر و عبارەت (شۆشی) سحرە (زڤنگی).

# خەلقۆ ل من کن شیرەتێ

خـەلقـۆ ل مــن کــن شـیرەتــێ		ئــەو دلبــەرا زەرریــن کــەمــەر
مــن دی د حــالێ غــەفلــەتــێ		هات دەر ژ بـورجێ وەک قـەمـەر

هـات دەر ژ بـورج و پـەنجـەران		دل گـرت و دا بــەر خـەنجـەران
ئــەڤ رەنگــە حــالێ دلبــەران		لـەو عاشـقان خوون بـوو جەگەر

قەلب و جەگەر من بوونە خوین		لــەورا ژ مــن[(١)] دەربــوون بــرین
ئــەی جــان وەرە حــالم ببــین		وەر رووح ژ قالــب بینــە دەر[(٢)]

جانێ مـن ئـەر بێ سەر جەسەد		مــزگین ب خاقــانی[(٣)] رەســەد
عالـەم حـەمـی پـێ بـن حـەسـەد		ئنــــسان و جــــنن و جانــــەوەر

عالەم حەمی تێک بوونە صەف		سەیرین ل[(٤)] شاهێ من ب خەف
هــاتن تــەماشــا چــار طــەرەف		شـاطر خومـار تـایێن[(٥)] د بـەر

---

(١) لەورا کو نوو (عەمەر، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی) لەورا ژ نوو (شۆشی، کۆڤلی) لـەورا کـو ژێ تـێن ئاڤ و خوین (ئامەد).
(٢) دا رووح ژ قالب بێتە دەر (ئامەد).
(٣) ئافاقان (ئیسماعیل، ئامەد، شۆشی، کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).
(٤) ب (پاشا، کۆڤلی) شێرین ل (وەستانی، حەلەب).
(٥) نهتن (کۆڤلی) تا بێن (حەلەب) تا تێن (شۆشی).

هـــات پادشـــاهێ پـــورِ سپاهـــ قامەت ئەلیف دێم شوبهی ماهـ
داد ومـــەدەد ســـەد ئاهـــ و ئاهـــ زولـف و[1] عـەقارب تێنه سـەر

کوشـتیمه خـەلقـۆ عـەقـرەبـێ مـەستم[2] ژ شـەوقا غـەبغـەبـێ
طـالع تنـێ مـن د کـەوکـەبـێ ئیـــرۆ عـــەقـــارب تێنـــە دەر

ئیـــرۆ عـــەقـــارب هاتـــە خـــوار چـوو نێـڤ بـاغێ[3] گولعـذار
ئـەڤ بوغچـەیا هـەر لـێ بوهـار هـەر بولبـولان لـێ قـال و شـەر

بێ حەد ژ دل نـالی کوعـەیب[4] د ئەو[5] بوغچەیا رچوانێ غەیب
ڤـان نالییـان نیـنن تـو عـەیب سـوهتینە ئـەم دل بـوو سـەقـەر

سـۆتن ل مـن جـەرگ و هنـاڤ وەردێن د هـوور[6] گرتن خوناڤ
زولف هاتـە سەر لـێ کر بـەلاڤ بـایێ نـەسـیم وەقتـێ سـەحـەر

ترســـم موخـــالف بـــا دەتـــێ زولفـــێن د دۆرا جـــەبهـــەتـــێ
راکـت قیـام وێ سـاعـەتـێ[7] عالـــەم ببـــت زیـــر و زەبـــەر

ظـــاهر دبێـــژم پـــەنـــدگیر دا دل نـــەدی زولفـــا حـــەریـــر
شـوبهی مـەلـێ دمینـی ئـەسیر گوهـدێرە قـەولـێ موعتـەبـەر

---

(١) زولفێن عەقارب (ئامەد).
(٢) سۆهتم (ئیسماعیل).
(٣) دانین د باغێ (ئامەد).
(٤) کەیب (ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) وکۆڤلی دبێژت : کوعەیب یان کوعەیت ئانەکو: بلبل.
(٥) دا د (شۆشی).
(٦) وان سۆرگولان (ئامەد).
(٧) راکن قیاما ساعەتێ (ئامەد).

# قەوێ مەشهوور بییە[1]

قـەوی مـەشـهوور بییـە نـاڤێ تـە مـەلا (خـمسة عشر)[2]
تـو ب شـعرا نـە تـە گـۆتی خـوە دکـی قـەنـد و شـەکـەر
دوڕڕێ ناسـوفتە دهـوونی مـە نـەدی مپلـی تـە قـەگ
نـە د سـەمتـێ عـەجـەمـێ دا نـە د ئقلیمـێ تـەتـەر
ئـەڤ چ شـعر وغـەزەلـن، مـەدح وپـەنایا خـوە دکـی[3]
د جڤاتـان وە د تـێ مـە تـو[4] ب طـەعـن و ب خـەبـەر
ئـەڤ چ تـەقلیـد و خطـابن[5] چ بطـاطـن تـو دکـی
سـەری ڤێـڕا دهـەژینـی ب دوسـەد ئاهـ و کـەسـەر
تـو دزانـی د فنـک دا[6] نـەمـەکـانێ غـەزەلانـە
چ بوهـا نینـە[7] مـەتـاعێ تـە ئـەیـا بـێ سـەر و بـەر

---

(١) د گەلەک دانەیێن دیوانا جزیری دا ئەڤ شعرە نەهاتییە، تشتێ هندێ دگەهینت کو دبت مـەلایی حەز نـەکر بت وێ بکەتە د ئەصلێ دیوانێ دا، بەلێ چونکی وی ئەو بەلاڤ کربوو ئەو ما ونەهاتە بەرزەکرن.

(٢) دیارە بۆ کێمکرنا بهایێ وی مەلای یێ شعرێن مەلایێ جزیری ددزین و ب نـاڤـێ خـۆ بـەلاڤ دکرن، یان ل دویڤ ئەدەب وتۆرەیێ ئیسلامی کو تـەصریح ب نـاڤێ وی کـەسی نـەئێتـەکرن یـێ ڕەخنـە لـێ دئێتـەگرتن، جزیـری نـەڤیایـە نـاڤێ وی ب ئاشـکەرا بێـت، لـەو وی ئـەو ب حـسێبا ئـەبجـەدی ئینایـە، سـەیـدا مـەلا عەبدرەحمان دوڕە د گۆتارەکا خۆ دا ئاشکەرا دکەت ودبێژت: نـاڤێ وی مـەلا داودێ فنکی بـوو. وئـەگەر ئـەم حسێبا ئەبجەدی یا نـاڤێ (داود) دەربێخین دێ دەرکـەڤت (١٥)، وئـەگـەر ئـەم نـاڤێ (الملا داوود الفنکي) ژی بهەژمێرین دێ بینین ئەو پازدە حەرفن. وزیرەکییا جزیری ل ڤێرێ بۆ مە ئاشکەرا دبت.

(٣) تە غەرەض نەقش و غەزەل مەد و ثەنایا خوەیە لەو (ئیسماعیل).

(٤) وە دبێژی مە (زڤنگی، ئامێدی).

(٥) شطاطـن (زڤنگی، ئامێدی).

(٦) فنکا تە (زڤنگی، ئامێدی) تو دزانی د فنک دا کو مەکانێ غەزەلان (ئیسماعیل).

(٧) تێنە (زڤنگی، ئامێدی).

دەســت وپ ایــان ژ بــەرێ زێــدە بکــی دێ تــە بکــم
مثلی حەممادێ عەرەب هەر وەکی شەیخ ئانی ب سـەر[1]

ئــەحمــەدم ســینە ســپەر پێــشبەری تیــرا فــەلــەکــێ
دەعــوەدارێ تــە مــە ئیــرۆ تــو ژ دەحلــی وەرە دەر![2]

(١) حـەمـمـادێ عـەرەب: (حـماد بـن مـیـسـرة الكوفي)یە ئەوێ ب ناڤێ (حماد الراوية) هاتییـە ناڤکرن، ل سالا(٩٥) مشەختی بووبوو و ل سالا(١٥٥) مربـوو، دبێـژن: وی شـعرێن خەلکی ڤەدگوهاستن و ژ نـک خۆ لێ زێدە دکرن!

(٢) ئەڤ هەلبەستە د دانەیا (پاشا، ئامەد) دا نینە.

# قافییا ( ز )

## جانا ژ جەمالا تە

جانـا ژ جـەمـالا تـە موقـەددەس قـەبـەسـم ئـەز
گەر خووب[1] وپەریزادە نەظـەرکی تە بەسم ئەز
مثلـی مـەهـێ نـەو گـەر تـە دڤێـتن مـە ببینـی
مێـزە بکـە جـامێ تـو دزانـی چ کـەسـم ئـەز
یەغما ژ[2] مە جان کر کـو تـەجەللایێ ل دل دا
من رووحێ د قالب تویی تەنها قـەفـەسم ئـەز
حوبـا تــەیــە مــن ڕادهــەژینــی کــو بنــالم
شەب تا ب سەحەر نالە ژ ڕەنگێ جەرەسم ئـەز
من گۆ: مـەهـێ نـەو چاشـنییێ ئـەبروویێ یـاری
گۆ: من چ حەدە شوبهەتی نەعلێ فـەرەسم ئـەز
ساقی ژ ئەزەل یـەک دو قـەدەح بادە ب مـن دا
حەتتا ب ئەبەد مەست و خومار و تەلەسم ئـەز
جانا تویی من جان گولییێ خار چ کەرەم پێ[3]
مننەت کو نە وەک بولبولێ محنەت عەبەسم ئـەز

(١) حوور (ئیسماعیل).
(٢) ل (ئامەد).
(٣) گول و بێ خار چ کەرەم بی (شۆشی) گەر م (عبدالسلام، زڤنگی) گولێ بێ خارێ کەرەم بوو (ئامەد) .

سەد جەور و جەفا دی ب مە نـاچین ژ دەرێ تـە

یەکسەر تو نەباتی و ل طـەبعـێ مـەگـەسم ئـەز

گـەر وەهـ! تـە دڤێـتن ببـڕی سـەر بکـە فـەرمـان

دا ڤێ سەعەتێ سەر ببڕم خوەش مـەقـەسم ئـەز

سەر تا ب قەدەم ئەر[1] بسوژم شوبهی مـەلایی

پەروانە صفەت صوهتم وبێ صەوت وحەسم ئەز

(١) ئەز (ئیسماعیل، عبدالسلام، زڤنگی) گەر (ئامەد).

# طوورم بـ دل

طـــوورم ب دل و پـــەیـــرەوێ[1] موســـایم ئـــەز
ئاتـەش پـەرەسـێ[2] نـوورێ تـەجـەللایـم ئـەز
بـــاری ژ (وعلـــم)[3] کـــو خـــەبـــەردار کـــرین
ئیـــرۆ تـــو بـــزان ئـــادەمـــێ ئـــەســـمایم ئـــەز
ئنـشائێ عولـوومێ لـەدونـی چونکـە م زانـی[4]
زانـــی کـــو ب حـــەقیقـــەت چ ئنـــشایم ئـــەز
حەرفێن رەقەمێ لەوحێ ووجوودا مـە بخوونـە[5]
دا قـــەنـــج ببینـــی کـــو چ ئملایـــم ئـــەز
ظـاهر تـو پـەریـشانییێ حـالێ م نـەبـین[6]
مـەجمووعـە د ذاتـێ[7] خـوە و طـوغرایم ئـەز
عالـەم چیـە؟ ئعـراب و حورووف و کـەلمـاتن[8]
ئـەو نوقطـە[9] د نـەفسا خوە و مـەعنـایم ئـەز

---

(١) عاشق و ( حەلەب) پەرەس نوور وتەجەللایم ئەز (عبدالسلام).
(٢) پەرەس و (ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی).
(٣) وی علمی (ئامەد، حەلەب).
(٤) گەر تو بزانی (د هندەک دانەیان دا هاتییە وەکی عبدالسلام دبێژت، ژ وان دانەیا ئامەد).
(٥) بخوان (پاشا، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) بخوون (یووسفی).
(٦) ببین (حەلەب، وەستانی).
(٧) زانێ (پاشا، کۆڤلی، عەمەر).
(٨) کەلمات (عبدالسلام).
(٩) لەفظێ (ئامەد).

سەد نیل و فورات[(١)] تێن ددەرن قەلبێ مە لێ[(٢)]
پـێ ناحـەسـهین قـولزوم ودەریـایم ئـەز
سەد نەقل و روایەت د مـەیا صاف و موویـەک
ئیـرۆ کـو[(٣)] ژ پیـرێ خـوە ب فـەتـوایم ئـەز
پەیوەستە تو هەر بانگی مەکی[(٤)] شوبهەتی نـەی
بـێ یـار و مـەی و سـاز وەکـوو[(٥)] نـایم ئـەز
هەر چی تـە دڤێتن ژ مـە وەر جان ب خـوە بت
جانـا بکـە فـەروارێ ڤـەوەسـتایم ئـەز
تو ژ نوسخەیێ تەوحیدێ مەخوون ئایەتێ[(٦)] نەفیێ
بـێ ئالـەتـێ ئثبـاتێ کـو (إلا)یـم ئـەز[(٧)]
سـەد شـیش ل دل دانـە ژ مهـرێ مـە[(٨)] مـەلا
لـەو هـەر ب فـەغـان مثلی نـەی و نـایم ئـەز
ئیـرۆ تـو بـەس بکـە لوقمـانییێ خـانم
لوطفـەک ب مـەلـێ ڕا بکـە سـەودایم ئـەز[(٩)]

---

(١) نیلێ وەها تێن و ددەرن (شۆشی، زڤنگی، ئامێدی) سەد نیل و فەراتن وە د قەلبێ مە رەوانن (وەستانی).
(٢) حوور (ئیسماعیل).
(٣) ئیرۆکە (وەستانی).
(٤) دکی (ئامەد).
(٥) م گۆ (زڤنگی، ئامێدی) بگۆ (عبدالسلام).
(٦) ئالەتێ (ئامەد).
(٧) ئەڤ هەردو مالکە ل نک (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی، عەمەر، وەستانی، حەلەب) نینن.
(٨) مهرا تە (وەستانی، حەلەب) مهرا تە مە لەو (ئامەد).
(٩) ئەڤ هەردو مالکە ل نک (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی، عەمەر، وەستانی، حەلەب، شۆشی) نینن.

# عاشق ئەر جارەك

عاشـق ئـەر جـارەک ژ بـالایێ[1] بـدت بـەرقـا مـەجـاز
دێ ل نک صاحب دلان حەتتا ئـەبەد بت سـەرفـەراز
کـەشـفێ ئـەسـرارێ صـفاتان بـێ مـەحـەببـەت نـابتن
صـوورەتـێ ئـەسـما دڤێـتن دا بکـن[2] ژێ فـەهـم ڕاز
لامعـا حوسـن و جـەمـالێ دێ ژ علمـی بێتـە عـەیـن
عـشق دا ژێ هلبـتن کێ دی حـەقیقـەت بێ مـەجاز؟
حوسن و حوب بێ یەک دو نابن دێ بکن شاهـ و گەدا
نـوور نـادت شـوعلەیا مـەحمـوود بـێ شـەمعا ئـەیاز
مــەعنــەیـا عــشقێ دزانــی ئایــەتـا حوسـنێ بخــوون
دا تو حەرفێن موحبەتێ یەک یەک ژ هەڤ کی ئمتیاز
عاشقان بێ گاڤ لەو کالین ژ دل تێن[3] شوبهی ڕەعد
وان ژ بـالایێ[4] دبـارن وەک برووسـکان ڕەمـز و ڕاز
کی خەبەر دا کت[5] ژ عشقێ کەی ژ بەر وەستان گرت[6]
(گـر چـە راه از[7] ذرە ذرە سـینە سـوز و جـان گـداز)

---

(١) بالا لێ (کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام) بەلایێ (شۆشی).
(٢) بکین (کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام).
(٣) عاشقان بێ حەد ژ دل نالین و ئاهـ تێن (ئامەد).
(٤) بالا لێ (کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).
(٥) خەبەردار (کۆڤلی ب تنێ) دابت (زڤنگی).
(٦) وەستا وی گرت (ئامەد) .
(٧) أو (عبدالسلام).

ئافـەریـن سـەد ئافـەریـن هـێ مـن ژ وان ڕا ئافـەریـن
ئـێ ژ تیـرێن دلبـەران دائـم د دل پـەیکـان و گـاز
گوهـ دە ئاوازێ نـەیـێ[1] وەقتـێ سـەما تـێن موغبـەچە
فـەهمـێ ڕازێ گـەر دکـی چاوا دنـالـن چەنـگ و سـاز
ئەو[2] دلـێ من وەک کەبووتەر نابتن کەس لـەومـە کت
لەو د ڤـێ تـۆرێ وە دا کـەفتـی مـە دیـن سـەد شاهباز
وەر دلــۆ دا چــین تــەماشــایا جوانــانێ چــەمــەن
وێ هلانـی سـەر ب نـاز وسـایەبـان دانـێ نیـاز[3]
سونبول رەیحـان ب لـەرزن چیچـەک و گـول سـەر گـەڕان
نێرگزان کو صەیف پۆشن لـەو بنـەفشان غونچەباز[4]
زولف و سونبول مشک بووی وبسک وسووسن سڕشرین
(سرْو بالا) سەبزپووش و گول[5] نـشان و غونچـە بـاز
نێرگـزێن قامــەت زومــوررود ســەرگــران هــاتن خــەرام
چار ئەطـرافان ب ڕەف ڕەف[6] لێ ب مەش تێن سی وقاز
دل ب کێ دم ئەز ژ وان؟ هەر یەک ب غەنجان دل دبن!
دلروبـایێن جـان فـەزایـێن دلبـەرێـن عاشـق نـەواز[7]

(١) ئاوازێ بنێ (پاشا، شۆشی).
(٢) ئەڤ (ئامەد).
(٣) وێ هلانین سەر ب مەستی دلروبایان پڕ ب ناز (ئامەد).
(٤) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هەیە.
(٥) کل (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) رەڤ رەڤ (پاشا، کۆڤلی).
(٧) گوداز (ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) دین برێن عاشق نەواز (شۆشی).

عـەقـدێ ئحرامـێ دەمـا دلبـەر خویـابی (فـرض عـین)
سەجدەیەک بەر وان دو برهان ناگرت جهـ سەد نماز[1]

عیـدە و میـرێ مـە ئیـرۆ دەرگـەهـێ لـوطـفێ ڤـەکـر
گۆ: مەلا هنگی بخوازی دێ بدم بەس تو[2] بخواز

(١) عەداز (عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).
(٢) بستە (د هندەک دانەیان دا هاتییە وەکی عبدالسلام دبێژت).

# ژ ڕەعنا نێرگزێن تە

ژ ڕەعنـا نێرگـزێن تـەی مـەسـت و خـوونریز
زەمان بوو عەهدێ جەنگ ئەنگیزێ جەنگیـز
تـە جـانێ مـن دڤێـت ئـەی جـانێ عالـەم
ژ من بستین ب لـەعلێن خوەی شەکەرریز
دو عـەنبـەربـوو ل شمـشادی ب مـەستی[۱]
ڤـەبـەسـتن لـەو هـەوا بـوو عـەنبـەرئـامیز
ژ ئاخـا ئاسـتانێ مـستەکـێ[۲] بـین
ل داغـان دا ببیـنم خـوەش صـەبـا[۳] تیـز
تنـێ فـەرهـاد دزانـت لـەذذەتـێ عـشق
کـو وی جـان دایـە شێرینێ نـە[٤] پـەرویـز
طولووعـا مـا ژ بـۆ گیتـی شـەفـەق دا
ژ شـیرازێ شـوعاعێ دایـە تـەبریـز[٥]
تـەب و تـابێ هـەزار ئـشکەنجـە دا دل
ژ شـیرازێ نگـاهی مـەسـتێ تـەبریـز
ئیلاهـی نێرگـزا مـەی مـەسـت و نـازک
ژ دەسـتێ خـوار و بـەدخواهـان بپـاریز

---

(۱) ڤ بەستی (پاشا، ئیسماعیل، شۆشی، عەمەر، حەلەب، وەستانی) ڤەبەستن (ئامەد).
(۲) مەسکەنی (ئیسماعیل، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب، پاشا، کۆڤلی) مەسکەنێ من (شۆشی).
(۳) ل داغان دا دەبینم خوەش صەباح (ئامەد).
(٤) ب (پاشا، ئیسماعیل، شۆشی، کۆڤلی، حەلەب، وەستانی).
(٥) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هاتییە.

کـو لـێ تێـت ئـەو قـەبـایێ ئاسـمانی
لـەطیفـا شـەنـگ و نـازک وەک بـەلازیـز
سـەواشـەک رێهتـە دیـسا عالـەمـا دل
ب جـادوویێ دو چـەشـمێ فتنـە ئـەنگیـز
خـەبائـث طـەبعـە ژاهـل[1] سـەگ سرشـتە
یـەقین ئـەو کـەر[2] ژ جانـان لـەو دکت بیـز
مـەلا جـانێ تـە چـاوا پـەهلـەوان کـر
ل تـایێن خـەمریـان زولفـا دل ئـاویز
ژ حوسـنا بـێ نـشان نـادی نـشانەک
نـشانی گـەر ژ دل نـەکـرا ب[3] پـەرهیـز
مـەبین ئـەڤ گـەر[4] ب صـوورەت ئـادەمینـە
حـەمـی دارن ژ ئێگـر ڕا کـری ڕێـز

(١) زاهل (کۆڤلی) جاهل (حەلەب) ئەهلێ (وەستانی) زاهد (ئامەد).
(٢) کو (ئامەد).
(٣) تە (یووسفی، زڤنگی، ئامێدی) یە (عبدالسلام) ژ دل بکرا تە (ئامەد).
(٤) کەر (وەستانی، حەلەب).

# تو دزانێ ب خودێ

تـو دزانـی ب خـودێ مـن تـو خـەیـالـی[١] شـەب و رووز
ب خەیـالا خـوە مـەدام مـن تـو ل بـالـی شەب و رووز
هـەر ب میـزان دڕەشـینی[٢] جـەگـەرێ تیـر و خـەدەنـگ
ژ نەسەق صاعقە مە ژ قـەوسێ هلالـی شەب و رووز
مثلی گـۆیین تـە ڕەوان[٣] نالـە ژ دل تـێن مـسکین[٤]
ئـەم نـزانین تـو چـڕا هـەر وە دنـالی شـەب و رووز
تـە ژ[٥] فـەریـاد و فـەغانـان ب خـوە بولبـول کـەڕکـر[٦]
ئەلّلاهـ ئـەلّلاهـ! ژ چ دەردی وە دکـالـی شـەب و رووز
خوزیـا مـن بـدیا ئـەو قـەد و بـالایێ شـرین
هەر دەما ئەو کو بمەش تێ ب دەلالی شەب و رووز[٧]
دا کـو دلبـەر قـەدەمـێ لـێ بنهـەد ڕەوشـەن کـت
لەو تو خوونێ وە ژ چەهڤان ڤـەدمـالی شـەب و رووز

---

(١) ل بالی (ئیسماعیل).
(٢) دڕەشینن (حەلەب، وەستانی) هەر د پێ هەڤ دڕەشینی (ئامەد).
(٣) شەڤان (کۆڤلی) د رەوان (شۆشی).
(٤) مسکین تێن (ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی).
(٥) ب (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) تە ژ فەریاد و فغانێ خوە جهان کر تە خەراب (ئامەد).
(٧) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هاتییە.

تـە[1] تنـێ ذەوق وصـەفـا کـر ب سـەیـێن دلبـەرێ ڕا
سەرنخوون گەهـ شوبی نوون گەهـ وەکوو دالی شەب و رووز

فـەتـوەیـا پیـر[2] و مـەلا یـان تـو ب ئلهـامێ نـەبـی[3]
ڤێ مەیێ هـەر وە دنووشی ب حەلالـی[4] شـەب و رووز

---

(١) نە (پاشا، ئیسماعیل، شۆشی، کۆڤلی).
(٢) پیری (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) فەتوەیا پیرێ موغان دا ژ مەلێ ڕایە مودام (ئامەد).
(٤) جەلالی (ئیسماعیل).

## چوومە تەماشا چەمەن

چوومـە تـەماشـا چـەمـەن    تـازە گـول و نـەسـتەرەن
غونچـە و بـشكۆ ب كـەن    چيچەک و نەسرين سـەمـەن

تێک سەحەر مـەست بـوون    موحبـەتـەكێ خوەست بـوون
زولفەكێ ئـەو بـەست بـوون    عـەقـرەبييـان گـەست بـوون

يەک ب يەک ئەو خەملين    بوغچـە ب وان كـەملـين
بولبـولێ سـوهتی دلـين    تێـک ژ وان دەسـت بلـين

دل ب مـەيـێ بێتـە ساز
رەوضـەيـێ بـاغێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لـێ دمـەشـن سی وقـاز

بولبـولێ حـەيـران هـەزار    نالـەيـە وان زارە زار
غونچـە لـەب وگـولعزار    نـازكێ زێـرين هـەزار

هـن گـەش و هـن غونچـەنـە    پێـشی يـەكـن غونجـەنـە
پـورِ سـورِ و پـورِ عـشوەنـە    عاشـقێ حوسـنا خـوەنـە

پەرتـەوێ عـشقێ[1] ژ حـەق    سەد صفەت و سـەد نـەسـەق
ئـەو ددەرن يـەک شـەفـەق    لـەو مـە رِەوان تێن سـەبـەق

---

(١) شەوقێ (ئامێدی).

مـەعرفـەتـێ ڕەمـز ونـاز
رەوضـەیـێ بـاغـێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لـێ دمـەشـن سـی وقـاز

مــوغنی و ســازەنــدەیــن		لـێ ب[1] مـەجالا مـەیـن
خــەف ژ ســورا پــەردەیــن		بێـژە مـە[2] تـو مـوژدەیـن

زێـدە ب حوسـنن د قـەنـج		شـۆخ و شـەپـالـن د غـەنـج
لێ مـە ئـەوان زێـر و گـەنج		دا مـە ئـەوان سـەد شـکـەنـج

جـان بـدە وان دلکـران[3]		گـەوهـەر و لـەعـل و دوڕان
بـەخـشە ب شـیرین سوڕان		دل ب خــوە بــر ئــاوڕان

زەرمـــە کــرین ئحتـــراز
رەوضـەیـێ بـاغـێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لـێ دمـەشـن سـی وقـاز

لات و بـــوت و ســـیمبەر		قامەت و قـەد نـەی شـەکـەر
گوفـت ب قـەنـدێ د تـەڕ		وان ل مـە کـەرکـر جـەگـەر

وەهـ کـو چ شـیرین لـەبـن		غـەبغـەب و دێـم کـەوکـەبـن
کــاکول و گیـــسوو شـەبـن		ظـولـم و جـەفـا مـەشـرەبـن

---

(١) پوڕ د (ئامێدی).
(٢) ژێ ب بهن (ئامێدی).
(٣) گران (ئامێدی).

حـووری و شـەهـزادەیـەک دێم گول و لەب غونچەیەک
بـۆرییێ حـەق شیوەیـەک[1] نـازە نـەمـان غونچـەیـەک

ڕم مـە د دل چـوو وگـاز
ڕەوضـەیـێ بـاغـێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لـێ دمـەشـن سـی وقـاز

پـوڕ خـەجلـین سـیم و زەر غـەیـری ل تـەرحـێن د تـەڕ
بەلگ ووەرەق تاج وسەر[2] زولـف ل سـەر بوونـە گـەڕ

دل بـــدە وان بـــشکۆوان لوئلـوء و عـەقـد و گـۆوان
عـەرعـەر و سـەروا جـوان دا تـو ب وان بـی جـوان

نـــازک و خـــووب وزەری ڕەنگ مـەلـەکن سوڕ پـەری
دێم دوڕ و لـەب گـەوهـەری لـێ ببـە جـان موشـتـەری

حوسـن وجـەمـالا بخـواز
ڕەوضـەیـێ بـاغـێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لـێ دمـەشـن سـی وقـاز

گولـشەنـێ بـاغـێ ئـرەم نـەی شـەکـەرێـن موحتـەرەم
جوملـەیـێ ئـەهلـێ حـەرەم زەمـزەمـە وان صـوبح دەم

---

(١) شەپوەیەک (کۆڤلی).
(٢) پەڕ (ئامێدی).

پـــەردەنـــشینێ خومـــار دێـم ژ خـەططـێ غوبـار
ڕۆژ ب حوســنێ ڤــەشـار پـورِ ل مولـووکێن کوبـار

عـەرعـەر و سـەروا جـوان یاسـەمـەن و ئـەرغـەوان
رووح ئـەون و هـەر[1] ڕەوان دێ دل و جـان دیـن ب وان

لات و بـــوتێ دلنـــەواز
ڕەوضـەیێ باغێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لـێ دمـەشـن سی وقـاز

دل ب شـــەپـــالان بــدە ب ئاسـک و غـەزالان بـدە
ســـینە ب تـــالان بـــدە رووحـــێ ب خـــالان بـــدە

نـــووری چرایـــێ دلـــن چهـــرە گوشـــایێ دلـــن
شـەیـخ و مـەلایـێ دلـن قبلـــەنـــەمـــایێ دلـــن

کـەعبـە و ئـەسودد حـەجـەر پـــەردە هلیـــنن ژ بـــەر
لازمـە یـەک سـەجـدە فـەر سـەجـدەیـێ شـوکرێ[2] ببەر

دا تـــو ببـــی ســـەفـــەراز
ڕەوضـەیێ باغێ مـەجاز
مەست وخەرامان ب ساز
لێ دمەشن سی وقـاز[3]

---

(١) هەم (ئامێدی).
(٢) سوجدێ (پاشا).
(٣) ئەڤ هەلبەستە ب تنێ ددەستنڤیسا (کۆڤلی) دا هەیە.. و ددانەیا (ئامێدی) ژی دا هەیە.

# دانەييێن عەنبەر ل نەسرينان

دانـەيـێن عـەنبـەر ل نـەسـرينان ڕەشـاندن[1] خـال خـام
سووسـنێن نـازک ل سـەر خـالان چـەڤانـدن دال دام[2]
ئەو پەری وەقتێ د سوندوس دا ژ قوندوس بـن[3] خويا
بەندە دێ شاهـ[4] و گـەدا بت خوسرەوێ شيرين كەلام[5]
(ليله القدر) و بەراتن زولف و جەبهەت صوبحێ عيد
ديم وەكوو فـەصلا بوهارێ لـێ قيامـەت قـەدد و قـام
هـەر كـەسـێ جارەک دييـە ئـەو زنـدە مـا حـەتتـا ئـەبـەد
ئـێ نـەديتـى ئـەو پـەری ڕوو زنـدەگـى لـێ بت حـەرام
هەر كەسـێ جامێ ژ دەسـتێ وێ بنووشت، نـووش بـت
ئێ ژ دەستێ وێ[6] نەنووشی زەهر بت لێ ئەو مـودام
وان د ڕەقـصێ دا كـو ديـم ئـاورِ پـەياپـەی دانـە مـن
بـەرق وتيرێـژان[7] ل دل دا جـەذبـەيـا عـشقێ ڕەڤـام

(١) ڕەشاندی (پاشا، ئیسماعیل، شۆشی، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر) ڕەشاندن خەط وخال (ئامەد).
(٢) دام دام (شۆشی، عەمەر) سونبولێ نازک ل سەر خالان بەلاڤبوون دام دام (ئامەد).
(٣) بت (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی).
(٤) بەندەتی شاهی گەدا (پاشا، بەندەیێ شاه وگەدا (کۆڤلی) بەندەیێ شاهێ گەدا (یووسفی، عەمەر).
(٥) غولام (ئامەد).
(٦) وێ ئانکۆ: وئێ .. ئێ ژ وی دەستی (زڤنگی، ئامێدی).
(٧) تیر ئەز ئان (پاشا، یووسفی، عەمەر) تیران ژان (کۆڤلی).

جەبهەت و دێمێ ژ قودرەت لـێ نڤیـسی حەرف حەرف
کــاکولان تاتــا ل ســەر حــەرفــان کــشاندی لام لام
عومرەکە[1] دوور بووم ژ جانان کەتمە بەندا[2] فورقەتێ
ناگـەهـان پـەردە هلانـی گـۆ: مـەلایـم (الـسلام)! [3]

(١) عومرەکی (پاشا، ئامەد، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر).
(٢) بەحرا (ئامەد).
(٣) ئـەڤ مالکـە ل نـک (پاشا، ئیـسماعیل، شۆشـی، کـۆڤلی، حـەلـەب) نینـە، و ل نـک (زڤنگـی، ئامێـدی) پێشخستن وپاشخستن د مالکێن ڤێ هەلبەستێ دا هەیە.

# قافییا ( ن )

## یارب این گلدستهء

[ب زمانێ فارسی]

یـارب ایـن گلدسـتهء یـا نـرگس رعناسـت ایـن
سـرو گلـشن یـا ألـف یـا قامـت یکتاسـت ایـن
ایـن ملـک یـا شـاهد قدسـی اسـت یـا مـاه فلـک
حـور یـا روح القـدس یـا نـور چـشم ماسـت ایـن
کوکـب صـبح اسـت یـا خورشـید یـا درّ یتـیم
یـا تـن سـیمین بـر اسـت یـا گـوهر والاسـت ایـن
عـارض اسـت ایـن یـا شـعاع شـمس یـا بـدر منیـر
لالـه یـا نـسرین و گـل یـا بـادهء حمـرا اسـت ایـن
سـنبل تـر یـا بـنفش یـا سوسـن و گـل چیچکـه
زلـف یـا مـشک ختـن یـا صـورت طغراسـت ایـن
غمـزه ایـن یـا گزمـه ایـن یـا تیـر یـا سـحر حـلال
سـاحر ایـن یـا چـشم شـوخ تـرک بـی پرواسـت ایـن
مـیم یـا یـاقوت یـا سرچـشمهء آب حیـات
حقـهی یـا دردانـه ایـن یـا لعـل شـکرخا اسـت ایـن

خـط یـا قـوس[1] دو نـون مکتـوب مـشک اذفرنـد[2]

یـا هـلال العیـد یـا أبـروی بـی همتاسـت ایـن

کـوی أو یـا کعبـه یـا بیـت المقـدس یـا بهـشت

خلـد یـا فـردوس ایـن یـا جنـه المـأوی است ایـن

هـاتف غیـب اسـت ایـن یـا ترجمـان روح القـدس

بلبـل شیداسـت در گلـزار یـا ملاسـت ایـن[3]

(١) خط یاقوتی (پاشا، شۆشی، ئامەد، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر).

(٢) اذفران (پاشا) اذفرن (شۆشی).

(٣) هەژار ل وێ باوەرییێ یە کو ئەڤ شعره نه یا جزیرییه [ئیسماعیل تاها شاهین].

# ڕەمزێن تە د جانان

ڕەمـــزێن تـــە د جانـــان نـــە[١] ب ئـــەنـــدازە درازن
هـەر یـەک ب هـەزار ڕەنـگ ڕەوانـێ مـە دخـوازن
وان دەربـە ل جـانێ مـە وەکـی بـەرق و برووسـکان
ڕەمـزێن تـە[٢] د جانـان نـە تنـێ سـینەگـودازن
جانـا ژ جـەفایـا تـە وڤـولمێ چ خـەبـەر دیـن
کـو تیـر ژ جـەورا تـە د دل دا مـە ب گـازن
پـەروانـە و بولبـول ب دلـن[٣] شـوعلەیـێ عـشقێ
لێ گەر تو نەظـەر دی ب خوە ئەو گولشـەنێ ڕازن[٤]
پـەیـوەسـتە د وەصـلێ کـو دمیـنن ب سـەراسـەر[٥]
بـشکۆژ و طلـسم و وەرەق و نـەتـرک و بـازن
سـوببووحی و قووددووسـی و حـوورێن د بهـشتێ
پـەیـوەسـتە شـەبـێ قـەدرێ لقایـا تـە دخـوازن
سـونبول ب سـەمـا تـێن و گـولان پـەردە دڕانـدن
بـشکفتنە ئـالال و هـشین بوونـە تـەرازن

(١) د جانان ب ئەندازە (پاشا) خوە ب ئەندازە (ئیسماعیل) د جانێ مە ب ئەندازە (کۆڤلی) ڕەمزێ د تە جانانە (ئامەد).
(٢) تیرێ تە (زڤنگی، ئامێدی) ڕەمزێ د تە (ئامەد).
(٣) ب دلین (پاشا، شۆشی، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی) د دل شوعلەیێ عشق (ئامەد).
(٤) گولشەن ورازن (شۆشی، عەمەر، بووسفی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٥) کو مە دامن چنە دائم (کۆڤلی) لەو دسینم کو سەراسەر (یووسفی،عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) کو ب ئاواز و ب سازن (شۆشی) کو دبینم کو سەراسەر (ئامەد) د وەصلێ کو ب ئاواز و ب سازن (ئیسماعیل).

جۆبـــار د ڕەوانـــن چـــەمـــەنـــان تـــەرح جـــوانن
مـەسـتانە[1] ب ڕەف ڕەف ل کنـاران سـی و قـازن

هـەر یـەک ب تـەماشـاگەهـێ حوسـنا تـە ژ هـەر جـا
تـــەشـــبیهی نگـــاران ب جـــەمـــالا تـــە دنـــازن

تیـران ل مـە دت دۆسـت مـە تـێ[2] سـینە هـەدەف کـر
نـــازان ل مـــە کـــت یـــارێ مـــە زاری و نیـــازن

محرابـــێ دو ئـــەبـــروو کـــو ژ بـــالا ڤـــە خویـــا بـــن
دەر سـەجـدەگـەهـێ عـشقێ نیـازێ مـە نـەمـازن

گەر حوسن و مەحەببەت ب[3] سەرا پەردەیێ جان بـن
گەهـ شاە و گـەدا، گـەهـ ب خـوە مـەحمـوود و ئـەیـازن

ئـەڤ حـوور و پـەری چـهـرە، بـوت و لاتـێ جـەمـالێ[4]
دەر صـوورەتـێ تـەحقیـق مـەلا، عـەینـی مـەجـازن

---

(١) وەستانە (کۆڤلی).
(٢) دی (شۆشی، ئامەد) دبێ (ئیسماعیل).
(٣) ل (ئیسماعیل، ئامەد).
(٤) جەمالێ بوت و لاتان (ئامەد).

## مەلا مە ل گەردەنا دلبەر

مەلا[1] مە ل گەردەنا دلبەر ژ نوو سەد بووسە ماین[2] دەین
مەجالی دێ بخوازم ژێ[3] دبێ: دەینێ تـە (فـوق العـينْ!)
ب ڕەمـزا قابـە قـەوسـەینـێ ژوان برهـان خـەبـەرداریـن
(فــآت القـــوس باريهـــا ألا يـــا رامـــي القوســـينْ)
ژ سـررا[4] (لا مكـان) واجـب تـەنـەززول کـر د ئمکـانێ
(فـأين العلـم أيــن العــين وأيــن الأيــن إذ لا أيــن؟)
ژ مابـەینـا دو ئـەبروویـان پـەیاپـەی بـەرقـێ لامـع تـێن
ب عەینێ گەر ببی[5] صافە چ نوورەک صرفە ئەو (ما بينْ)
ب دەسـتوورا تـە دا وی ژی ژ ڤـێ نـاڤێ ڤـەرێکـم ئـەز[6]
(فـصف العــين نــور العــين ألا يــا زيــن كــل الــزين)
بوهایێ عشوەیەک لەعلان مە یەکسەر (ما ملک) بـەخشی
دل وجـان ژی ل سـەر دانـی و ظـالـم هێـژ دبێـژت دەیـن!
مـەلا هـەر وی ببـین هـەر وی ئـەگـەر هـەر وی د ناسـی تـو
(هـو المعبـود[7] و المـشهود بـل لا غيـر فـي الـدارين)

(١) بلا (ئامەد).
(٢) مابن (ئامەد).
(٣) مەجالی هەر دخوازت ئەو (ئامەد).
(٤) ژ سەرایا (عبدالسلام).
(٥) کەوکەبێ (حەلەب، وەستانی) ب چەشمێ دل ببینی تو چ نوورەک صرفە.. (ئامەد).
(٦) دو صادن وێ د قەوسەینان ل بەدرێ هالە کێشایە (ئامەد).
(٧) الموجود (ئیسماعیل، ئامەد).

## من د بەر (قالوا بلىٚ)[1]

مـن د بـەر (قـالوا بلـى) بـاطن ڤ وێ ڕا بـوو ئـەڤـين
هێـژ ل سـەر عـەهـدا (ألـستم) تـا ب ڕۆژا ئـاخرين
مـن دڤـێ لـێ ئـەشـکەرا کـم جـارەکـێ داغـا نهـين
(گفـتم أورا مـا دعـاگوی تـو ام أی حـور عـين
أعرضـت عنـي و قالـت: مـا دعـاء الكـافرين)
ئـەی شـەهـێ عـالی جەنـاب پـوڕ عـاجز و پـەرکـەنـدە ئـەم
ئاهـ ژ دەست جەورا ئـەڤينـێ چ بکرم؟ مـن[2] بـەنـدە ئـەم
صەبر و طـاقەت من نـەمـان لـێ بێ کـەس و دەرمانـدە ئـەم
(گـر بخـوانی ور برانـی بنـده أم تـا زنـده أم
واجـب لـي إمتثـال الأمـر مـاذا تـأمرين؟)
سـوهتم ئـەز پێتـا ئـەڤينـێ تێـک بـووم گـەرد و هـەبـا
إن لـي آيـات صـدق كـان فـي هـذا النبـا
حووريیـا[3] ڕۆژا لقـائێ نازکـا مـەخمـوور قـەبـا
(حبـذا روضـات نجـد زرتهـا عهـد الـصبا
روضـة يجـري علـى أرجائهـا مـاء معـين)

(١) ئەڤ شعرە تەخميسەکە ژ لایێ جزیری ڤـە ل سـەر هـەلبـەستـەکا شاعرەکی کو تـەخـەللوصا (جەلال) بۆ خۆ دانایە، وئەم نزانین کانێ ئەو جەلالەددینێ ڕۆمییە یان نە؟ وئـەڤ شعرە د دیوانا ڕۆمی دا ب بەر چاڤێ مە نەکەفتییە. وهەژییە بێژین: ئەڤ شعرە د دانەیا (ئیسماعیل) دا نینە.
(٢) چاکەرم هەم (ئامەد).
(٣) خوزییا (بەغدا).

من ل سەر بەدرا مـونیر مـەکتـووب دییـە نـەقشێ[1] سـەواد
سەر ب یەک ئـانی دو نوونـان خـەططـێ رەیحانی دو صاد
هـادری مـن سـەجـدە بـر لـەو غـەرقـێ خـوونێ بـوو فوئـاد
(بـــر در بـــاغ وصـــالش هـــاتفی ئـــاواز داد:
هـــذە جنـــات عـــدن فادخلوهـــا خالـــدین)

نـا ئێـتن گـوهتن ب قـال، شـەرح و بـەیانـا حوسـنێ تـو
دێ ب حـال و سـرِ بناسـین[2] دل فـەسـانا[3] حوسـنێ تـو
خـوەش مـەلا ئامـانجێ تیـران کـر[4] کـەمانـا حوسـنێ تـو
(قـــصەی عـــشق جـــلال[5] و داســـتان حوســـن تـــو)
(تلـــک أنبـــاء یقـــول النـــاس منـــا بعـــد حـــین)

---

(١) نەقشەک (ئامەد).
(٢) بناسن (ژڤنگی، ئامێدی) بناسیت (بەغدا).
(٣) فەشانا (پاشا، یوسفی، کۆڤلی، عەمەر).
(٤) تیری کر (بەغدا).
(٥) د دانەیا (ئامەد) دا پەیڤا (جەلال) ل ڤێرێ، و(مـەلا) د رێزکا بۆری دا ب سۆری هاتینە نڤیسین، تشتێ هندێ دگەهینت کو ئەو هەردو (ناسناڤێن) شاعرانە، وئـەڤـە هنـدێ تـەئکیـد دکـەت کـو ئـەڤ شـعرە (پێـنج خشتەکرنە) ژ لایێ جزیری ڤە ل سەر شعرا شاعرەکێ دی.

## صەنەمێ ژ قەوسێ ئەبروو

صـەنـەمـێ ژ قـەوسـێ ئـەبـروو دو هلالـێ نـەو نومانـدن
دو کەمان ل بورجێ میزان ب غەضەب ل مـن کشاندن[١]
نـە[٢] دو نـوون قـەلـەم موقابـل ب بـەدیع خـەط نڤیـسین
دو هلالـێ[٣] دەسـتێ قـودرەت ب قرانـێ یـەک کـشاندن
چ بــەراتــێ حوســنە یــا رەب ب نــشانێ پادشــاهی
ب طـەرەف دو طـورره، طـوغرا وە ب ماوەرێ ڕەشاندن[٤]
ئـەلیـف و دو لام و هـێ دیـن مـە د ئایـەتـا جـەمـالێ
ژ جـەگـەر مـە کـر تـەسـەللی و ژ سینە دەست فـەشـاندن
نـە تنـێ ژ قـشت و زولفـان مـە د سـینە سـەد کـولابن
ل جـەگـەر سـیەهـ کـەمانـان دو هـەزار تیـر ڕەشـاندن
ژ[٥] جـەگـەر مـەلا پلنگـان ب کـولابێ پـەنـس[٦] کـەرکـر
ئــەســەدان ژ پــەنجــە ڤێــڕان دل وســینە هــەڕشــاندن

(١) طـەواندن (ئامەد).
(٢) تە (ئیسماعیل، وەستانی، حەلەب) نە دو نوونێ قەلەمینە ب بەدیعی خەط نڤیسین (ئامەد).
(٣) هلالن (ئامەد).
(٤) حەشاندن (ئامەد).
(٥) تە (ئامەد).
(٦) کولاب وپەنس (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام) کولابێ تیژ (حەلەب، وەستانی).

# خەشمێ ل فەقیران مەکە

خـەشـمێ ل فـەقیـران مـەکـە زوو پادشـەهـێ مـن
پورسـێ بکـە جـارەک ل خـەطـا و گونـەهـێ مـن
تـەفتـیش ب موومـوو بکـە ئـەر ئـەم ب خـەطـا یـین
هنجـا نـەکـە بێـتن ت[1] وەلاتـی ت جـەهـێ[2] مـن
جـەورا تـە بـەهیتـین و جـەفایـا تـە پـەرێتـین
قوربـانی تـە بـم گوهـ بـدە جـارەک گلـەهـێ مـن
زانی کو ژ بەر ضـەرب[3] و جەفایان ئـەلـەمین دل[4]
ڕەحمێ ب گەدایێ خوە کە سولطـان و شەهێ من
سهـ سـالە ژ دەرد و ژ بـەلایـێ تـە هـەلاکـین
حـەتتـا ب فـەلـەک هـەر دڕەتـن ئاهـ وئـەهێ مـن
مـا یـەک نـەفـەسـەک مـن دبـتن صـەبر و قـەرارەک
قـەد بـێ تـە و بـێ تـە دبـتن مثلـی سـەهـێ مـن

(١) (ت) ل ڤێرێ و ل جهێ د دویڤ دا ژی کورتکرنا (تو)یە ئانەکو: چو، وڕامانا ڤێ ڕێزکێ ئەوە : هنگی تو نەهێلە چو وەلات وچو جهـ یێن من بن. و د دانەیا (ئامەد) دا ب ڤی ڕەنگییە: هێژا بکە دەر من ژ وەلات و ژ جهێ من.
(٢) د وەلات و د جهێ من (شۆشی).
(٣) جەور (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) ضەر و جەفا و ئەلەمێن دل (شۆشی).

گـەر شـوبهـەتـی پـەروانـە د بـەزمـێ تـە چ سـەد گـەر[1]
سـەد نالـە هـەزار ڕەنـگ وەکـی چـەنـگ و ژەهـێ مـن
نـوورین قـەدەحـا خـەمـر و حـەیاتـا مـە ب سـەر دان[2]
گـەر وێ بـدەتـن دەسـت ب دەسـت موشـتـەرەهـێ مـن
یـەک عـشوە مـەلا گـەر[3] ب بوهـا بێـت ژ لـەعـلان
سەد جان مە هەبن هێژ کو موقـەصـر د بـەهێ مـن

(١) تو چو سەد گەھ (پاشا، کۆڤلی، عەمەر) تو چو سەد کووھ (ئامەد).
(٢) وان (پاشا، شۆشی، عەمەر، یووسفی) ب سروان (ئامەد).
(٣) مەلایی ب بوها بێتە (ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام).

## ئەز نزانم سەبەبێ

ئــەز نــزانم ســەبــەبــێ، یــارێ چــرا دوور[1] کــرین
شاهێ شیرین دەهـەنـان ئـەم ژ خـوە مـەهجـوور کـرین

شبهی گۆ بێ سەر و پا بوومە ل بەر ضـەرب و شـەکـان
لـەو ب چـەوگـانێ جـەفایـا خـوە ژ دل هـوور کـرین

دا مــە ســەد جــامێ فراقــێ ژ خـوە غائـب نـەبـوویین
ژ وصــالێ قــەدەحــەک دا مــە و مــەخمــوور کـرین

نوورێ چەشمێ مە کو عالـەم مـە ب چەشمێن تـە ددی
ب جـەمـالا خـوە تـە وەک دیـدەیـێ بێ[2] نـوور کـرین

نـەفـەسـەک بێ تـە مـە نـاچی نـە دژیـن بێ تـە دەمـەک
ژ تـە هـات ئـەمـرێ هومـایوون تـە وە مـەئمـوور کـرین

مــە دزانــی کــو تــو دێ (عاقبــە الأمــر) چ کــی
لـەبێ لـەعلێ شـەکـەریـن ئاهـ کـو مـەغـروور کـرین!

ذەررەیــەک بــووم د[3] هــەوایــا تــە د ویرانــەیــەکــی
مثلـی رۆژێ ب شـوعاعا خـوە تـە مـەشـهوور کـرین

ژ (أنـا الحـق) ب لـەبـێن لـەعـل خـەبـەردار بـوویین[4]
ب کولابـا[5] سـەرێ زولـفـا خـوە تـە مـەنـصوور کـرین

---

(١) حەرفا (ر) دهەمی قافییێن ڤێ شعرێ دا دڤێت بێتە کێشان ب کەسرەیەکا کورت.
(٢) پڕ (ئامەد).
(٣) ب (شۆشی).
(٤) گولابا (پاشا، عەمەر،زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب).
(٥) کرین (ئامەد).

مونصەرف ما دبوويين ئـەم ب دو سـەد جارری مـەلـێ

لـێ ب وێ کـەسـر و ئـضافـێ ڤ خـوه مـەجرووور کـرين

# ئیرۆ ژ حوسنا دێم دورێ

ئیـــرۆ ژ حوســـنا دێـــم دورێ[1] دیــسا هــەلاک و ســەرخــوەشــین
ڕەمـــزێن د وێ شـــیرین ســـورێ ســـوهتم ب پێتـــا ئاتـــەشـــین

ســـوهتم ب بـــەرقـــا لامعـــە ئـــەو نـــەجـــم و بـــەدرا طالعـــە
شـــەمـــسا ســـەمـــائێ رابعـــە لـــەو پـــوڕ ژ شـــەوقـــێ شـــەووشـــین

پـــوڕ شـــەووشـــاندن وێ دلـــە زولفـــێن سیاهــ ســـەر دان ملـــە
تـــۆڕا موخـــالف[2] سلـــسله ســـەلـــوا عـــەقـــارب لـــێ مـــەشـــین[3]

ســـەلـــوا عـــەقـــارب لـــێ وەطـــەن ئـــەو نازکـــا نـــوورین بـــەدەن
قـــەنـــدێ دڕێـــژن گوفـــت و کـــەن بـــسکان د لـــێ کـــر[4] بـــاوەشـــین

بـــسک هاتـــە ســـەر لـــێ بـــوو بـــەلاڤ حـــەمیـــان د هـــەڤ گرتـــی خونـــاڤ
ئـــەو فـــەننـــەرە وێ ڕوو د نـــاڤ دل بـــەنـــدێ وێ مـــاهێ گـــەشـــین[5]

بـــسکا سیاهــ ڕەعنایـــە مـــەســـت یـــەک دی ب حـــەیـــران پێڤـــە ڕەست[6]
حـــەمیـــان ب مـــەستی حـــەلقـــە بـــەست دەر بـــەنـــدێ ئـــەو زولفـــا ڕەشـــین

---

(١) دلبەرێ (ب تنێ کۆڤلی تێ نە بت).

(٢) موخا بش (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی، عەمەر، وەستانی) فەخا لەش (عبدالسلام) ڤەدایی (حەلەب) تۆڕا ڤەدا لێ سونبولە (ئامەد).

(٣) دل گەستیییێ مارێ ڕەشین (ئامەد).

(٤) کو (پاشا، عەمەر) زولفا ل سەر کر باوەشین (ئامەد).

(٥) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هەیە.

(٦) بەست (زڤنگی، ئامێدی) پێ ڤەوەست (عبدالسلام، حەلەب، وەستانی) ل جیران پێڤە وەست (ئامەد).

ئێــسیر کــرم زولفــا چــەلــەک ئــەو حووریـیـا شــوبـهەت مــەلــەک
تیــر دان ژ ڕەشـــتۆزێن هـــەلـــەک مــەجرووحــێ قــەوســێ پــەڕوەشــین

تیــر دان ژ قـــەوســـێ مـــال زراڤ ئـەو گـەوهـەرا پـوڕ شـەوق و تـاڤ
ســـۆتن ل مـــن جـــەرگ و هنـــاڤ لـەو تێـک ژ جـەرگـی هـەررشـین

جـەرگ و جـەسـەد[1] تێـک سـوهتنە لـــەو خـــەف خـــەدەنگـــان نوهتنـــە
ژ قـــەوســـێ هلالـــی ژهـــ تونـــە حــەیرانــێ دێمــێ[2] مــەهــوەشــین

هـــەم بـــەدر و هـــەم زوهرایـــە دێـم ژ وێ عالــەمــا[3] کــوبرا یــە دێـم
خـوەش دەسـتخەت و طـوغرایـە دێـم حـەرفـا ژ مـسکێ ڕەش وەشـین[4]

لـــەوحـــێ ژ نـــوو[5] سـیقال بـدن هــــەردەم ژ نـــوو ڤـــە خـــال بـــدن
دا دل ب یـــەک دی پـــال بـــدن نوقطـــــان ژ زیرابـــــێ وەشـــــین

زولفـــا سیاهـــ عـــەنبـــەر بکـــە خـــەملـــێ ژ زێـــڕێ زەر بکـــە
زەربـــاف و دیبـــا بـــەر بکـــە مـــسک و گـــولاڤێ لـــێ ڕەشـــین

مـــاوەرکـــە طـــەرح و بـــشکۆوان جیرانـــێ[6] بـــەرگ و لوئلـــووان
ئـەو عـەرعـەر و سـەلـوا جـوان[7] شـەتـری ب مـەسـتی لـێ خـوەشـین

---

(١) کەبەد (پاشا).
(٢) دێما (کۆڤلی تێ نەبت).
(٣) نێ ژ عالەما (کۆڤلی) وێ ژ عالەما (ئامەد، یووسفی) ژ عالەمی (پاشا، عەمەر).
(٤) حەرفان ژ مسکێ لێ نشین (زڤنگی) حەرفان ژ مسکێ لێ ڕەشین (ئامێدی) خالێ ژ قودرەت لـێ نشین (ئامەد).
(٥) نوور (کۆڤلی).
(٦) حەیران کە (حەلەب، وەستانی) یاقووت و لەعل و لوئلوان (ئامەد).
(٧) ڕەوان (ئامەد).

شـــەتـــری وتـــاییێن ســـۆر و زەر بـــایێ نـــەســـیم لێـــدا ســـەحـــەر
ل[1] جـەبهـەتـێ هـەژیـان دو پـەرِ لـــەورا ســـوکارا بـــێ هـــەشـــین[2]

مـەشـها سـەحـەر یـارێ[3] شـەفیـق دا مـــن ب ئـەنگوشـتێن عـەقیـق
ژ[4] بـــادەیـــا نـــوورین رِەحیـــق مـەخمـووریێ خـەمـرا بـێ غـەشـین

مـەخمـووریێ بـێ[5] جـامێ ئـەزم یـــەغمـــاکری رِامـــێ ئـــەزم
چـــاڤنێریێ پـــەیغـــامێ ئـــەزم پـەروانـەیـێ شـەمعـا گـەشـین

پـەروانـەیـین سـۆتی کـەبـەد دلبـــەر ژ بـــەر بورجـــا ئـــەســـەد
تیـر دان ژ رِەشـتۆزێن صـەمـەد[6] لـەو تێـک ژ خـوونێ نـەققـشین

کوشـتم ب قـەوسـێ عـەنبـەرە شـــۆخێ ژ دل مـــل دان بـــەرە
ئێخـستە دل ســەد پـەنجـەرە ئـەڤ رِەنگـە ئـەم محنـەتکـەشـین

محنـەتکـەشـین رِووز و شـەبـێ دەر فورقـەتـا شـیرین لـەبـێ
ظـولمـا ژ بـەر دەسـتێ تـە بـێ ئـەو عـەدلـە ئـەم پـورِ پـێ خـوەشین

ظـولمـا تـو کـی پـورِ پـێ خـوەشم ســوهتی دلـــێ هجرانکـــەشـــم
مثلـــی پـــەرِەنگـــێ ئاتـــەشـــم رِووحـەک موجـەررەد بـێ لـەشـین

---

(١) ل وێ (یووسفی، زڤنگی، ئامێدی) سەر (ئامەد).
(٢) سوکار وسەرخوەشین (یووسفی، عەمەر، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی) لەو ئەم دمەست وبێ هەشین (کۆڤلی) سوکار و بێ هەشین (ئامەد).
(٣) ئەڤ (ئامەد).
(٤) حەیران کە (حەلەب، وەستانی) یاقووت و لەعل و لوئلوان (ئامەد).
(٥) وێ ، ڤێ (ئامێدی د فەرۆزێ دە) [ ئیسماعیل ].
(٦) تیر دانە سەر جەرگ و جەسەد (ئامەد).

مـــن دی ســـەحـــەرگاهـــا (ألـــست) جامـەک ژ کـەوثـەر دۆسـت د دەسـت
ژێ دا مـــەلـــێ لـــەو مایـــە مـــەســـت حـــەتتـــا حـــەیـــاتێ[1] ســـەرخـــوەشـــین

(١) حسابێ (ئیسماعیل، ئامەد).

## وەرە جانم

وەرە جـــانم کـــو چ نـــازک وەرەســـین
ژ گـول و نـەسـتەرەنـان ئـەم تـە بـەسـین
تـو شـەهـەنـشاهی بـەسـی مـن ژ بوتـان
نە موحب هەر نە کەس و خار و خەسین
ژ خـوە خـانم ڤـەدی[1] نـاکی مـە ب تیـغ
تـو نـەبـاتی و ل طـەبعـێ مـەگـەسین
(هــر شـــبم نعــرەزنـــان تـــا بـــە ســـحر
بـە سـگ کـوی تـرا) هـەمنـەفـەسـین
بێ تو (باللە) نە بوویین[2] یەک نەفـەسەک
مـە تـویی ڕووح و موجـەررەد قـەفـەسین
جـــەذبـــە دل ڕادهـــەژینـــت ژ مـــە لـــەو
د شـــەبـان نالــە ژ ڕەنگــێ جـەرەســین
مـە ژ زولفـێن د سـیەهـ[3] ڕەشـترە بـەخت
سـەحـەرێ بێـت[4] پـەری پـێ نـەحـەسین

(١) ڤەدەر (پاشا) مە ڤەناکی (ئامەد).
(٢) بکین (پاشا).
(٣) دبوتان (زڤنگی، ئامێدی) مە ژ زولفێ تە (ئامەد).
(٤) سەحەران تێت (زڤنگی، ئامێدی).

وەرە مـــەیخانـــەیـــێ شـــاهد پـــەرەســـان
شەمعێ مەجلس تە نـەبیـتن[1] چ کـەسین
مـــە ژ نـــاری دییـــە نـــوورا تـــە د دل
لێ[2] ژ عشقا تـە هـەر ئاتـەش پـەرەسین
عـەینـی عـشقین و د دل ئاتـەشـێ طـوور
ژ سـەنـا بـەرقـێ جـەمـالێ قـەبـەسـین
تـــە دڤـــێ داوی بـــرِی بـــت نهـــە دا
ببرِم سـەر ب دو ئـەنگوشـت مـەقـەسـین
گـەر چ یـەکـسەر ل رەخـێن فیـل صـفەت
راست و چەپ بـازی ل سـەیرێ فـەرەسین
ب مـــەیـــێ صـــافی بـــدین خرقـــەیـــێ زەرق
ب خـــەرابـــاتێ موغـــان ئـــەر بـــرِەســـین
ئـــەم قـــەدیـــم بـــادە دنووشـــین ژ طـــەهـــوور
لەو موقیم مەست و خومـار و تـەلـەسین
مـــە شـــەڤـــان جـــام د کـــەف یـــارێ د بـــەر
هەی هەی و صوحبەت و میرێ عەسەسین
مـــە ســـەراپـــەردەیـــێ حوورانـــە مـــەقـــام
ژ سیەهـ زولفـێ بوتـان ئـەر ڤـەرِەسـین
مــە ژ کــەف بــادە دبــر جــامێ ب خــەف

(١) شەمعێ تە ئەر نە بئیسین (زڤنگی، ئامێدی) شەمعێ تە گەر نەبتن ئەم ( حەلـەب، وەستانی) شـەمعێ تە نەبیستن ئەم ( عبدالسلام) شەمع دا بۆ تە ببێژت (ئامەد).
(٢) لەو (ئامەد، کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).

(بالحقیقت) لـەو د عـشقێ پـەرەسـین[1]

قـەلبـێ ئـەعیـان دکـرت حـوببێ ووجـوود

عـشق ئکـسیره و ئـەم سـیم و مـەسـین

مـولهمێ غـەیبـێ وه ئمـلا دکـرت[2]

مـەدەد وفـەیـض ژ (روح القـدس)یـن

جـەوهـەرێ عالییـه عونـصور مـه مـەلا

(بالحقیقه) نـه ژ خـوار ئوسطـوقوسین[3]

(١) ئەڤ مالکه د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هەیه.

(٢) دگرت قەلبی د ئەفلاکێ شوهوود (ئامەد).

(٣) نه ژ چار ئوستوقوسین (ئیسماعیل) وه نەخەسین ( حەلەب، وەستانی) نه ژ ڤان خار و خەسین (ئامەد).

## پەیوەستە دو ئەبروو

پـەیـوەسـتە دو ئـەبـروو ل مـە مـەحبـووبێ کـشاندن
سـەد گـەزمـە پـەیاپـەی ل ئـەزێ خـەستە ڕەشـاندن
تیـرەک ژ کـەمـانێ غـەضـەبـێ دا جـەگـەرێ ڕیـش
مـل دانـە بـەر و سـەر[1] ژ دو گۆشـان ڤـەوەشـاندن
جـوهتێ ئـەسـەدان پـەنجـە ل سـەر سـینە نهانـدن
کـوللاب گهانـدن دل و هـەسـتی هـەڕشـاندن
بـرهێن تـە ژ قـودرەت کـو نومـان گۆشـەیـێ ئعجـاز
پەیـوەسـتە کـەمانـان ل گوهـان[2] گۆشـە کـشاندن[3]
مهـرا تـە د جـانێ خـوە[4] ژ دل خـەف کربـوو مـن
دل چـوو جـەگـەر و سـینە ل سـەر جـان فـەشـاندن
نـوونێن تـە هلالـی ب قـران یـەک ژ سـوڕا حـەق
بێ عـەیـب ل دێمـێ قـەلـەمـێ غـەیبـێ کـشاندن[5]
نـەققاشـێ ئـەزەل ئـسمێ[6] جـەمـالێ کـو نڤیـسی
حـەرفـێن تـە موجـەسـسەم ژ سـوڕێ تـازە ڕەشـاندن[7]

---

(١) رەس (پاشا، یووسفی، عەمەر) پەیوەستە کەمانان ل گەهان گۆشە هەژاندن (ئامەد).
(٢) گەهان (عبدالسلام).
(٣) گهاندن (ئیسماعیل) مل دانە بەر و سرر ژ دو گۆشان ڤەوەشاندن (ئامەد).
(٤) ب حالێ مە (ئیسماعیل).
(٥) گهاندن (ئامەد).
(٦) نەقشێ (ئامەد).
(٧) حەرفێن د موزەییەن ژ سووڕێ تازە نهاندن (ئامەد).

رەیحـانی و دیـوانی و هـەم ثولـث و موسـەلـسەل
یـەک یـەک وە هـەزار ڕەنـگ ژ[1] حوسنێ نـەقشاندن
ئـەڤ ئایـەتـێ نـووری ژ مـەلا ڕا کـو نڤیـسی
کاتـب ژ سـوری نوقطـە ب زیرابـێ فـەشـاندن[2]

(١) ب حوسنێ (ئامەد).
(٢) ب زێڕئاڤێ ڕەشاندن (ئامەد).

# شۆخ وشەنگێ

شۆخ و شەنگێ زوهرە ڕەنگێ    دل ژ من بر دل ژ من
ئاوڕێن هەیبەت پلەنگێ    دل ژ من بر دل ژ من

وێ شەپالێ مسک خالێ    دێم دوڕێ گەردەن شەمالێ
جەبهەتا بسکان سەما لێ    دل ژ من بر دل ژ من

زولف و خالان نوون ودالان    وان ژ من بر دل ب تالان
گۆشەیێ قەوسێ هلالان    دل ژ من بر دل ژ من

دێم نەدیرێ بووعەبیرێ    خەمری و گیسوو حەریرێ
سینە کر ئامانجێ تیرێ    دل ژ من بر دل ژ من

سوڕ شرینێ نازەنینێ    کوشتم و ناکت یەقینێ
وێ ب چەنگالا ئەڤینێ    دل ژ من بر دل ژ من

فەتل[1] و تابان دا غورابان[2]    ئەبلەق و جوهتێ شبابان[3]
دامە بەر پەنجە و کولابان    دل ژ من بر دل ژ من

خوەش خەرامێ ئەز غولامێ    نازکێ شیرین کەلامێ
طووطییا ئەیوان مەقامێ    دل ژ من بر دل ژ من

ماهڕوویێ مسک بوویێ    سوڕ پلنگێ شێر خوویێ

---

(١) قەتل (پاشا، یووسفی، کۆڤلی).
(٢) وان شهابان (کۆڤلی) وان غورابان (بەغدا).
(٣) شەرابان (پاشا) غورابان (کۆڤلی).

وێ ب زولفا[1] شوبهی گوویێ
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

هەردو چەشمان ناز و خەشمان
کێ[2] ژ بەر وان عەقل و هەش مان
ساعەتا مـن دی ب چەشمان
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

ماهتـــــابێ ئافتـــــابێ
دێـــم ژ ڕۆژێ شـــەب نقـــابێ
خـوەش ب چـەنگـال و کـولابێ
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

(ســـروناز)ێ ســـەرفـــەرازێ
شوبهی زێـڕ ڕەمـزا مـەجازێ[3]
دامـە بـەر چـاکووچ و گـازێ
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

بـەژن و بـالا تـۆخ و عـالا
مـن کـرن ڤێکـرا مطـالا[4]
چیچـەکـا تـەرحـێن والا[5]
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

میـرێ غـازی شـیرێ طـازی
ڤێکـرا مـن دیـن[6] ب بـازی
کـر ل م ژ غـەفلـەت ڤـە گـازی
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

شـیر و خـشتن زولـف و قـشتن
هـن ڤـەشارن هـن وە هـشتن[7]
پـەهلـەوانـان دەسـت ڤـەمـشتن
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

روهنییـا چـەهڤـێن مـەلایـی
ئـەو تـەجـەللایـا تـە دایـی
یـا ژ ئـەحمـەد دل ڕەڤـایی
دل ژ مـــن بـــر دل ژ مـــن

(١) زولفان (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، کۆڤلی).
(٢) کەی (بەغدا، کۆڤلی).
(٣) شوبهی زێڕی بێ مەجازێ (بەغدا).
(٤) ئەم کرن فکر و مطالا (ئامەد).
(٥) د ئالا (کۆڤلی) ژ ئالا (عەمەر) و ئالا (ئامەد، یووسفی، حەلەب، وەستانی).
(٦) ڤێکران من دی (زڤنگی، ئامێدی).
(٧) ڤەهشتن (بەغدا، ئامەد، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).

## ئەی دل وەرە[١]

ئەی دل وەرە وەقت و مەجال　　دا کەین ثەنایا هندییان
عەبدال ببین ئەم لا ئوبال　　دیسا ژ دەست وان خەمرییان

دیسا ژ دەست وان سۆرگولان　　پەرجان[٢] ژ خال و فلفلان
پەردە ژ تایێ سونبولان　　بەند بوو ژ داڤا بەندییان

بەند بووم ب داڤا عەنبەرین　　شاها ژ من پەردا بەرین
رەنگێن سیاهـ دێ پێک بەرین　　دا بێنە جەنگێ جندییان

دا بێنە جەنگ و حەرب و شەڕ　　زولفا ژ قەوسێ بێ وەتەر
تێک دا خوڕین تورک و تەتەر　　دەنگ تێتە نێڤا مەستییان

بەستم ب دێم[٣] ئەز بووم مەدام　　چوونە ژ دەست من عەقل و فام
مەجنوون ئەزم صەحرا مەقام　　دل کەفتە زارێ ئەفعییان

ئەفعا ل سەر وا سلسلین　　ڕەشمار ژ دورجان کەملین
دبەر دا بنێر[٤] باغێ گولین　　دائم خەیالا حەبسییان

---

(١) د پترییا دانەیێن دیوانێ دا ئەڤ شعرە نینە، بەلێ د دانەیا (بەغدا) دا ئەو هاتییە، کو ل سالا ١١٨١ مشەختی (١٧٦٧ ز) هاتییە نڤیسین وبۆ مەلایێ جزیری هاتییە پالدان، هەر وەسا د دانەیا (کۆڤلی) و (قۆغی) ژی هاتییە. و(ئامێدی) ئەو د دانەیا خۆ دا ئینایە، ژ دیوانا کرمانجی ڤەگوهاستییە. و د هندەک ژێدەرێن نوو چاپکری دا هاتییە کو ئەڤ شعرە یا (ئەحمەدێ خانی)یە. و ل ڤێرێ دانەیا (بەغدا) مە کرییە بنیات.

(٢) پەردە (کۆڤلی) پەرچەم (قۆغی) نینە.

(٣) سۆتیمە دێم (قۆغی).

(٤) وەر دا ببین (کۆڤلی).

مــەحبــووس ئــەزم زنــدان قــەفــەس
شـــاهی ژ مـــن گرتـــی هـــەوەس
زاغـــا ژ دێمـــێ ڕەنـــگ وەرەس
مـــەخلـــووق ژ مـــسکی جـــسمییان

مەخلووق ژ مسکی ڕەنگ جەسەد
دنــدان و لێــڤ لــەعــل و بــەرەد
پــەیدا نییــە ئــەو ڕەنــگ چــو قــەد
نــە مــەغــرب و نــە شــەرقییــان

نینــە د شــەرق ئــەو ڕەنــگ زەری
ئنـــسانەکـــە مثلـــی پـــەری
مـــــەولا ژ نــــووریٚ ئافـــــەری
نائێـــت ژ ویٚ دیـــن وەصـــفییان

نائێـــت ژ ویٚ دیـــن وەصـــفەتـــان
دێمـــێ شـــەمـــالا ظولمـــەتـــان
ســـــەرداره تـــــا ئنـــــسانەتـــــان
ئــدراک ژ ویٚ گــرت ئــەصــلییان(١)

ئــەحمــەد مــەبــە جــەور و جــەفــا
تــو تــەرک مــەکــە ئــەمــریٚ ئیلاهــ
لـــەو عاقبـــەت دیٚ بـــین فـــەنـــا
بگـــرن طـــەریقـــا شـــەرعییـــان

---

(١) ئەڤ مالکە ل نک (عبد الرقیب) نینە.

# boowiin چۆلەخ

بـووبین چۆلــەخ[1] و کــەڤتــین مــەطبــەخـا میــر
قـــــەوی ظـولمـــــە ل مــــــە مـــــسکین و ژاران
ژ دوهنــــــێ ســـــــونبولان و خـــــوون و گۆشــــتی
فــراخ شـــەو بـــوون ب مـــە ســەیــرێن بهـــاران
مـــە هــەســـکوو بـــوو قـــەلـــەم سـونبول د وێ دە
ســــیاهین ئـــــەم وەکـــــوو کـــەڤلـــێن د مـــاران
ژ بهنـــا جلـــک و پـــەلکـــێ دوو بـــوە عـــوود
مـــــە وێ زانـــــی قــــەوی علمـــــێ گــــراران
مـــە دەســـت و پـــێ مـــودام هـــەر ب بـــرینن
ژ بـــەر ضـــەربـــێن بڤـــر طـــەڤـــشێن تـــراران
وە ئـــەجلافـــین کـــو نائێـــت ژێ خـــەبـــەردان
ژ بهنــــــا زنخییــــــا پیـــــــست و عیـــــاران
قـــــەوی زەحمــــەت چییــــە تێــــدا کلاهـــــی
ســـەلام و ســـەد ســـەلام ل رەمـــزێن کوفـــاران[2]

(١) چۆلەخ ئانەکۆ: چەلەنک وزیرەک.

(٢) ئەڤ چەند مالکە د دانەیا (ئیسماعیل) دا هاتینە بەری شعرا (ژ مابەینا دو ئەبروویان..) وپێڤە هاتینە گرێدان، وئاشکەرایە کو ئەو شعرەکا نەیا تمامە، وشێوەیێ وێ ژێ ب سەر شێوەیێ شعرا جزیری ڤە ناچت، وەسا تێ نەبت جزیری ئەو ل جحێلینییا خۆ نڤیسی بت، ئەگەر هات وشعر یا وی بت!

# قافییا ( هـ )

## ژ ڕەمزا دلبەرێ دیسا

ژ ڕەمزا دلبەرێ دیسا　　ل من باطن ڤەژین دەردە
د لبسێ تارییێ ئیسا[1]　　خویا بوو ئەو سیەهـ چەردە[2]

د لبسێ تاری و نووری　　پەری ڕەنگێ صفەت حووری
ژ وادی ئەیمەنا طووری　　موقەددەس کر ل من عەردە

ژ نار و نووری تەقدیسێ　　تەجەللا کر ل من دیسێ
ل سەر تەختێ خوە بەلقیسێ　　هلانین بێ حجاب پەردە

حجاب و پەردە ئاڤێتن　　صەبا ڕەیحان هلاڤێتن
ژ بورجان تیر پوڕ ڕێتن　　گهان من ڕاست و چەپ جەردە[3]

کرم ئامانجێ مزراقان　　د دل دا تیر چوون فاقان[4]
ب جەلالدێ خوە ئەو خاقان　　دبێژت: هێژ تو خەنجەر دە

(١) من دی (ژبلی دانەیا ئامەد) دیسا (عبدالسلام).
(٢) جەردە (یووسفی، عەمەر، زڤنگی).
(٣) گەها من ڕاست وچەپ کەردە (کۆڤلی).
(٤) ئافاقان (عبدالسلام، حەلەب) ل دل دا تیرێ ئافاقان (ئامەد).

ب دەربێن خەنجەران کوشتین     ب خوونا سوهر لێمشتین
د چینا سونبولێن قشتین     مە دل پورِ مسک و ماوەردە

گولێن هەر مسکێ ئەذفەر لێ     عەبیر و عەنبەرێ تەڕ لێ
سەمایا سووسنان هەر لێ     ب زولفان ما تو ماوەر دە

ب سەر وان[1] سونبولێن تاری     ب هەڤڕا بازی و یاری
ب جۆ دا خوون[2] ببت جاری     ژ قەوسان گەزمەیان بەردە

ئەزم ئامانجێ وان تیران[3]     ژ پەیکانان و سەرتیران
بوویم پوولاد ل بەر شیران     سەراسەر تێک مام گەردە[4]

کو دلبەر هاتە ڤێ یۆلێ     ژ بەر پورِ هن کەتن[5] چۆلێ
ژ قەنجان گۆ ڕەڤا هۆلێ     ژ مەحبووبان بڕن نەردە

ژ قەدد و بەژن و بالایێ     ژ ڕەنگ و دێم و سیمایێ
تو ڕەنگی قەگ خەبەر نایێ     د حوسنێ جەوهەرەک فەردە

ب خەمل و ڕەنگ و ڕەعنایی     ب مەحبووبی، ب زیبایی
ب ئەو حوسنا خودێ دایی     ژ گول ڕەنگان گولا زەردە

نەبات و شەککەرا لێڤێ     نەسیمێ وێ گول و سێڤێ
هلینت پەردەیا شێڤێ     شفایا هندەکی دەردە

---

(١) ب سەروێ (ئیسماعیل، شۆشی، ئامەد).
(٢) ب جۆ وان دان (حەلەب).
(٣) میران (ئامەد).
(٤) بەردە (عەمەر، زڤنگی، ئامێدی، حەلەب، عبدالسلام) یەردە (ئامەد).
(٥) پورِ هنگتن (پاشا، یووسفی،عەمەر، کۆڤلی) ژ بەر بورهان کەتم (ئامەد).

ژ نــەقــش و صــونعێ جــەببــاری موطـــەررا طـــوررەیـــا تـــاری
ل نـــووری مـــسکێ تاتـــاری ل ســـەر وان خـــەمرییـــان بـــەردە

ل بـــەر ڕۆژێ ببـــت خێلـــی[1] بنێـــرم[2] قامـــەتـــا عێلـــی
قـــەدیــف و زەرکــەشــێ[3] تێلــی زەبـــاد و مـــسک و عـــەنبـــەر دە

ب ســـــیماڤێ، ب زێراڤـــــێ تـــو ڕۆژی نـــەقـــشەکـــێ بـــاڤێ
کـــو دا ئـــەرژەنــگ[4] ژ وێ نــاڤێ ل بـــەر ڕۆژێ نـــەبـــت پـــەردە

ئـــەگـــەر بـــەرقـــەک ژ وێ ڕۆژێ ژ شـــەوقـــا[5] عقـــد و بـــشکۆژێ
بـــدت قـــەلبـــی وەکـــی دۆژێ ل بـــەر دۆژەهـــ دبـــت بـــەردە

د مــەیــدانێ[6] شــرین غــەنجــان بچــەرخــن[7] مثلــی شــەطــرەنجــان
توورابـــا بـــەر پییـــێ قـــەنجـــان زەبـــاد وعـــەنبـــەریـــن گـــەردە

دبـــت بێـــژن وی ســـولطانی[8] ب هـــەفـــت ئایـــاتێ فورقـــانی
ل مـــەحبووبـــان تـــو خاقـــانی وەرە دەربـــێ ل قـــەیـــصەر دە

مـــەلا زانـــم ژ مـــەجـــذووبان تنـــێ نـــاڤی تـــو بـــێ خووبـــان

---

(١) ل بەر ڕوو قەط نەبت خێلی (ئامەد).
(٢) بێژم (پاشا، یووسفی) ببێژن (عەمەر) ببینم (کۆڤلی) ب بەژن و قامەتا غێلی (ئامەد).
(٣) سەرکەشێ (پاشا، شۆشی، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٤) ئەو ژەنگ (عبدالسلام).
(٥) ژ بەر وی (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) د مەیدانا (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٧) بچەرخین (پاشا، یووسفی،عەمەر، کۆڤلی، وەستانی، حەلەب، عبدالسلام).
(٨) دبت بـەژنا مـە خاقـانی (پاشـا، شۆشـی، یووسـفی، کۆڤلی، عـەمـەر) دبت بژنێ مـە خاقـانی (عبدالـسلام، حەلەب، وەستانی) دبێژم ئەز کو سولطـانی (ئامەد).

دەمـــا دل دی ب مـــەحبووبـــان		ب شـۆخ و شـەنـگ و ئـەسـمەر دە

دەمـــا جـــەلـــلاد بـــێن بـــازی		ب شـــیر و خـــەنجـــەرێـــن طـــازی
ل دەرگـــەهـــ دا نـــەکـــی گـــازی		دەلال و نازپـــــــــــــــــــەروەردە

ئـــەمانـــەت دا ژ بـــێ هووشـــی		دورێـــن ناســـوفتە نـــەفرووشـــی
مـــەلا زانـــم ژ مـــەدهووشـــی		تـــە دل بـــێ خـــواب و بـــێ خـــوەردە

# دلبەرێ سەردارێ خووبان

دلبـەرێ سـەردارێ خووبـان ئـەز نـزام ئاگـەهـ هـەیـە
د[1] حـەبس و زنـدانێ ئـەسیر و گرتییـێ[2] دەرمانـدەیـە؟
گـرتییم مـاییم[3] د حـەبسێ کـی گـەلـۆ مـەهـدەر بکت؟
جـارەکـێ نـاڤێ مـە بینـت پـوڕ ثـەوابـەک زێـدەیـە
محنـەتـێ حـالێ[4] ئـەسیران کـی ل میـران عـەرضـە کـت
دێ بـتن[5] پورسێ ل مـن لـەو پوڕ ب ڕەحم و شـەفقـەیـە
گـەر بپورسـت جـارەکـێ خـاتوون ل حـالێ سـوختەیـی[6]
قوفـل و زنجیـر دێ ڤـەبن بـێ ئـسم و دەست و مفتـەیـە
بەند و زنجیر دێ ڤـەبن جەرحێن د کول دێ خوەش بکت
لـەو کـو نـاڤێ دلبـەرێ دەرمـانێ دەردێ بـەنـدەیـە
هـەر چ بیڤێـرێ[7] کـو نـاڤێ دلبـەرێ بێـتن ل سـەر
خـوەش دبـت هـادر د گـاڤێ بـێ گومـان و شـوبهەیـە

---

(١) تە (پاشا، یووسفی، عەمەر).
(٢) گرتییە (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی) گرتی و (کۆڤلی، ئامەد، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٣) مایی (پاشا، یووسفی).
(٤) محنەت وحالێ (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، وەستانی).
(٥) وێ بکت (ئامەد).
(٦) خەستەیێ (کۆڤلی ل فەرۆزێ).
(٧) پەیڤێرێ (یووسفی) بێ ڤێ ڕێ (عەمەر) باڤێرا (ئامەد)، وبیڤێر مرۆڤێ نەساخە.

بـــێ گومـــان خاکـــا ڕِییـــا وێ تووتیـــا و دانـــەیـــە[١]
گـەر د چـەهڤـێن کـۆر ڤـە ئینـن خـوەش دبـن پـێ دیـدەیـە
مـەییتـێ سـەدسـالـە ژی وێ[٢] ڕێ ڤ بـەر قـەبـری کـەڤـت
دێ ڤـەژی ڕووح بێتـە سـەر سـاتا خـوە بێـتن زنـدەیـە
مـەییتـان ئـەو[٣] ڕادکـت یـەکـسەر دلان یـەغمـا دکـت
ئـسمێ ئـەعظـەم مـا دزانـت یـا مـەسیحا ئـەو ب خـوەیـە؟
ئـەز دبـێم عیـسایە ئـەو، یـا بووعـەلـی سـینایە ئـەو
لـەو ب ڕەمـز و عـشوەیـان پـوڕ مـوعجزات و شـیوەیـە
شـیوە و ڕەمـزێن د وێ تـەشـبیهـی بـەرقـێ لامعـن
کـووهێ قـاف بـت کـەر دکـت سـاتا خویـا بـت پـەردەیـە
پـەردەیـا مـەحبـووب د نێـڤ قـەلبـان کـو دێ کـەرکـەر بکـت
قـەط د پـەردێ خـەف دبـن خورشـید و مـاە و زوهـرەیـە!
زوهـرە و خورشـید و مـەهـ مـن دیـن[٤] د قـەوسـێ هـەمقـران
سـوڕڕێ[٥] دا دل عـەقـرەبـان چـەرخ و سـەمـا و هـەی هـەیـە
عـەقـرەب و قـەوس و قـوزەح ڤێـڕا موقابـل موشـتەری
ڕۆژ و شـەڤ نـوور وێ دڕێـژن بـەرقـێ دایـە سـپێدەیـە[٦]
ئـەو حـەمـی ڤێکـرا مـە دیـن تێکـل د چـەرخـی جـارەکـێ

(١) تووتیا ئا دانەیە (ئامەد) تووتییا دەردانە ئەو (کۆڤلی).
(٢) مەیتێ سەد سالە ژی گەر وێ (ئامەد).
(٣) لەو (یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی، حەلەب، وەستانی).
(٤) .. خورشید من دیتن ( عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) دیتی (ئامەد).
(٥) سەررە (پاشا) سررێ (کۆڤلی، یووسفی، عەمەر).
(٦) ڕۆژ وشیڤ ونوور وتیرێژ بەرق وهەم ئسپێدەیە (یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) ڕۆژ وهیڤ و نوور و تیرێژ (ئامەد).

هـەر[1] ژ وان بـێ حـالـم ئـەز ئـەحـوال و عـشق و جـەذبـەیـە
حـال ژ وێ ڕەمـزێ گـهـا مـن مـەسـتێ وێ ڕەمزێمـە هێـژ

سـەرخـوەشـم حـەتتـا ئـەبـەد بـێ جـام و نـەقـل و بـادەیـە
سـەرخـوەشـم بـێ جـام و مـەی ڕەمـزا نـهـین ئـەبتـەر کـرم

ناگـەهـان تیـر دانـە دل لـەو کوشـت هـادر سـوختەیـە
کوشـتییان خـوون دی ل قالـب لـەو ب وی دێ خـوەش بـتن[2]

هیڤییـان قـەط نـابڕم مـەقـصـوود مـە[3] دیـدارا تـەیـە
هیڤییـان قـەط نـابڕم جـارەک تـو بێیـی شـەفقـە کـی

عـەقـدێ ئحرامـێ دێ بیـنم[4] هـادری بـم سـەجـدەیـە
سـەجـدەیـا بـەر ئـەسـوەدان[5] نـادم ب سـەد حـەج ئـەکبـەران

سـووند دخـوم ب وان زولـف و خـالان هـەچـوەکـی بێـژم وەیـە!
سـووند ب وێ زولفـا سیاهـ ئـەز عابـدێ حوسـنا تـەمـە!

خـەف دنووشـم ڤـێ شـەرابـێ خـوەش شـەراب و قـەهـوەیـە
عومرەکە دسوژم ب خەف چەهڤەنێرێ یەک[6] پورسەک تەمە

دا بـەیـان کـم شـەرحـێ حـالێ دل ب حـەرف و نوکتـەیـە
سـەد هـەزار بـار شـاکرم ئـەز کـو ژ بـەلقیـسا پـەری

هودهـودێ شـیرین زەبـان ئیـرۆ خـەبـەردارێ مـەیـە

(١) هێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٢) کوشتییان خەون دی لقائێ لەو ب وێ دێ خوەش ببن (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام) خوون دی لقائێ (پاشا، عەمەر، یووسفی، وەستانی) کوشتییان بینە لقائێ ئەو ب وێ دێ خوەش ببن (ئامەد).
(٣) مە (د هندەک دانەیان دا نینە).
(٤) ببینم (شۆشی) گرێدەم (ئامەد).
(٥) ئەسوەدی (پاشا، شۆشی، ئامەد، کۆڤلی، یووسفی، عەمەر، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٦) چەهڤنێرەکی (پاشا، کۆڤلی، یووسفی، عەمەر).

ئـسم و نـاڤێ تـەی شـەريـف خـوەش كـر ل مـن قـەلبـێ مـری
لـەو د مـەدحـێ تـە و ثـەنـائێ بوويیمـە چـەنـگ و نـەیـە
شـوبهەتـی چـەنگـێ دنـالم هێـژ ژ دەسـت داغـا قـەديـم
هـەر وەکـی مـەشـعەل دسـوژم دۆسـت نـزام ئاگـەهـ هـەیـە؟!
مـن دڤـێ سـەر ل ئاسـتانێ هـەر وەکـی تـوولان نهـم
بەلکی جارەک کەیل[1] بپورست ئەڤ چ مەحرووم[2] توولەیە؟
گـەر ب نـاڤێ توولـەیـان جـارەک ڤـەخوونـت بـەنـدەيـی
ب مـەلـێ خـوەشـتر ژ مـال و گـەوهـەر و گـەنجینـەيـە
گـەوهـەر و گـەنجـێن مـەلـێ حوسـن و جـەمـالا دلبـەرە
سـەد (تعـالی اللـه تبـارک) ئـەڤ چ حوسـن و جلـوەیـە؟!

(١) ئەو (ئامەد) لەیل (کۆڤلی).
(٢) مەجنوون (کۆڤلی).

# فەلەکا ئەطلەسێ

فـەلـەکـا ئـەطلـەسێ سـەرگـەشـتە د جامـا مـە حـەبابـە
مـەوج ددت قـولزومـێ عـشقێ مـە ل سـەر دەست غورابـە
دل کـەمـەربـەسـتەیێ عـشقە[1] و ب خـوە زونـنـار پـەرەسـتین
مـەی و مـەعـشووقە دوعـایێ مـە و سـەجـجـادە قبابـە
ژ حجـابێ وەرە دەر نـازک و مـەسـتانە بمـەش تـو
تە جەهان زیـر و زەبـەر کـر ب خـودێ ئـەڤ چ حجابـە!؟[2]
دەسـتێ جبریـل هلاڤێت ژ بـەژنـا تـە نقـاب[3]
ب یـەقـین قافـە ل ڕۆژێ وەرە دەر سـینە[4] نقابـە
مـە ب ئـشراقی سـوئالەک ژ لـەبـێ غونچـەگوشا کـر
گـۆ ب ئلهـامێ دزانـی د سـوئالا مـە[5] جـەوابـە
تـو بنـێ سـاز ب ئـاوازی چ ڕەنگـی مـە دخـوازن[6]
(اللـه ، اللـه) ب خـودێ قـەط دبهـی ئـەڤ چ خطابـە؟
گوهـدە نـایێ ژ لـەبـێ لـەعلـێ ب قـانوونێ حکایـەت
دێ چ شـەهـدە ب دەفـێ ڕا بـدرت شـەهـدە ڕەبابـە

(١) دل کەمەربەستە د عشقێ (ئیسماعیل).
(٢) عتابە (ئیسماعیل).
(٣) نقابێ ( عبدالسلام، زڤنگی، حەلەب) نقابە (ئامەد) ژ بەر بەژنا تە (بەغدا).
(٤) ل ڕۆژێ کو ل سەر گرتی (ئامەد).
(٥) تە (ئیسماعیل، شۆشی) خوە (ئامەد).
(٦) تە دخوازن (ئیسماعیل) تە دخوازی (حەلەب) مە دخوازت (ئامەد).

تـە دڤێـتن ب مـەرا شوسـت وشـووا چهـرەيـێ دل كـەی
مـە طـەهوور ئاتـەشێ سـەييالـە و جاما مـەيێ نابـە[1]
خوەش پـەريشان صفەت ومـەجمـەعـەيێ صوورەتێ حالين
پيرێ عـشقين و جوان طـەبع و دلـی عـەهدێ شـەبابـە
دوورەدەسـتين ژ خـەيـالان مـە دڤـێ يـەک ژ خـودێ را
خەف د بـەحثا مـە ژ دل بێت و بـرەت عـەينی ثـەوابـە[2]
مـە موشـەررەف كـە دو چـەشمێن مـە بـساطا قـەدەمـی كـە
پـورِ ل نـک مـن هـەيـە مـەی، مێـزەكـە مـن سينە كـەبابـە
كـەسـک و سـۆران تـو بنـێ چـەرخ ل دۆرا دو هـلالان
دو قـران مانـە[3] بـەرابـەر شـەفـەقـێ پـەردە عـصابە
عـەرعـەران طـا د شـەپـالن وەرەقـان جـەذبـەيـە ڤێـرا
نێرگـزان سـەر د گـرانن ل بـەنـەفـشان خـەم و تابـە
چيچـەكێن قـەوس قـوزەح رەنـگ هـەزار رەنـگ سـەمايـە
سـونبولان گرتـی خونـاڤ و ل گـولان تـازە گولابـە
مەست و هشيار هەمی كەج كولـەهن رەقص و سـەما تێن
ئـەز نـزانم چ نـەسـەق كـەيفـە نـزانم چ شـەرابـە؟
خـاكێ پـايێن تـە د رێـزا سـەک و تـوولان خـوە دناسـين
مـە نـە سووج ونـە گوناهـ ونـە خـەطـا ئـەڤ چ عتابـە؟
ژ وصـالا خـوە زەكـاتێ بـدە مـسكين و فـەقيـران
كـو جـەمـالا تـەيـە كامـل د كـەمـالا خـوە نـصابە

(١) ئەڤ مالكە ب تنێ ل نک (ئامێدی) هەیە، وی ژ (هارتمانی) ڤەگوهاستییە و ل فەرۆزێ دانایە.
(٢) صەوابە (ئامەد).
(٣) بوونە (ئامەد).

عاشـقێ مـەسـئەلـە خـواهی[1] وەرە ئـەم مـوفتییێ عـشقین
دەسـتەکـێ سـوننەتـە تێـدا د یـەکـێ نـەصـصێ کتابـە
دل بـــشۆ تـــو ژ نفـــاقێ کـــو بـــدت ســـینە بـــەراقـــێ
ب صـەفـا هـەمـڕەهـێ ئـەربـابێ دل و ئـەهلـێ صـەفـا بـە
نـەظـەرا عـەینـێ عنایـەت[2] ب مـە دا شـاهێ ولایـەت
ژ عنایـەت نـەظـەرێ دل مـە تـەژی علمـێ عوبابـە[3]
لەبێ لەعلێن تـە د بێ هـەر ب یـەکی[4] نوقطـەیێ علمن
ب خەطێ حەرفێ ئەلف جەزمە شوبی[5] حەلقـەیێ بابـە
خەط و خالێن تـە ب موومـوو[6] ژ مـەڕا مـەسئەلـە گۆیین
مـە ژ وان حاشـیەیـان سـینە تـەژی شـەرحێ لوبابـە[7]
ئـابێ حـەیـوان تـە دڤـێ ڕاسـت بنووشـی شـەبـێ قـەدر[8]
دەست بەر گەردەنێ پوڕ[9] پێچ و خەمێ زولفێ دوتـا بـە
مـە ژ بـسکێن تـەی گرهـدار ژ بـەختـێ خـوە گرینـە[10]
مـە ژ زولفـێن ب خـەم و تـاب د دل دا خـەم و تابـە

(١) خواهم (ئیسماعیل).
(٢) سەحەرێ خضرێ عنایەت (ئامەد).
(٣) کتابا (العباب) ژ دانانا (الامام الصغاني) یە.
(٤) لەبێ لەعلێن تە دوبی هەردو ب یەک نوقطەئێ علمین (ئیسماعیل) لـەبێ لـەعلێ تـە دبێم هـەردو د هـەڤ (ئامەد).
(٥) وەکی (ئامەد).
(٦) د هەڤ دا (ئامەد).
(٧) ئەڤ مالکە ل نک (پاشا، کۆڤلی، عەمەر) نینە.
(٨) شەب و رووژێ (ئامەد).
(٩) پیر (زڤنگی، یووسفی).
(١٠) مە گرێنە (ئیسماعیل) ژ دو بسکێن تە گرهدار د دل دا مە گرێنە (ئامەد) .

تـە دڤـێ بـەرق و برووسـکان بـڕەشـینی تـو نـەظـەر دە

تـە دڤـێ ڕۆژ خویـا بـت ژ شـویاکێ تـو خویابـە

تـە دڤـێ زیـر و زەبـەر کـی مـە دو زولفـان بـدە بـەر بـا

تـە دڤـێ قـەنـج قیامـەت ل مـە ڕابـت ب خـوە ڕابـە

بـەس ل مـن نـاز و عتـابێ بکـە ئـەی نازکـە طـەبعـێ

تـە ل مـن سینە کـەباب کـر و ل دل عـەهدێ شـەبابـە[1]

قـەصدێ سـەرچـەشـمەیـێ حـەیـوان حـەقیقـەت کـە نـشانی

ب جەهـانێ مـەبـە مـەغـروور کـو جـەهان عـەینی سـەرابـە

سـەرکـەشـی شـیوەیـێ ئـەربـابێ وەفـا نینـە ڕحـێ مـن

تـە ژ دل سـوهت مـەلا بـەس ب مـەلـێ ڕا ب جـەفـا بـە

(١) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هەیە.

# موحبەتێ محنەت د زۆرن

موحبـــــەتـــــێ محنـــــەت د زۆرن
عـــومر و ژی خـــوەش پـــێ دبـــۆرن
حـــوب دبـــێم بـــێ شـــەک بـــەلایـــە
ســـــــۆتن و دەرد و جـــــــەفایـــــــە

ســـــۆتن و دەردێ ئـــــەڤینـــــێ
خـــوەش دبـــن مـــا ئـــەو ب دینـــێ؟
عللـــــــەتـــــــێ داغ و برینـــــــێ
شـــــەربـــــەتـــــا لێڤـــــان مفایـــــە!

هـــەر دلـــێ ســـوهتی ب ئـــولفێ
تـــا ئـــەبـــەد ئـــەو بـــەنـــدێ[1] قـــولفێ
یـــار نـــە دەرمـــان کـــت ب زولفـــێ
عـــــشق دەردەک بـــــێ دەوایـــــە

عـــشق دەردەک بـــێ طـــەبیبـــە
کوشـــــتمە جـــــەورا ڕەقیبـــــە
لـــێ مفـــا[2] وەصـــلا حـــەبیبـــە
پـــوڕ[3] لـــەعینـــێ ڕووســـیایە

داغ و کـــەی مـــن لـــێ هـــەزارن
ســـــوڕپەری دێـــــو وێ ل کنـــــارن
گـــول د دەســـت شـــەوکـــێن ب خـــارن
ئـــــەهرمـــــەن خاتـــــەم ڕەڤایـــــە

طـــەبـــع دێـــوان دەســـت گـــەهـــشتێ
عاشـــقێ دلبـــەنـــدێ قـــشتێ[4]
حـــــوور و ولـــــدانێن بهـــــشتێ
جـــان بـــدت یـــەکجـــار ڕەوایـــە

محنـــەت و جـــەورا حـــەبیبـــی
حـــەق تنـــێ دا مـــن غـــەریبـــی
قـــــەهـــــر و ئـــــازارا ڕەقیبـــــی
لـــێ شـــوکور بـــاخوێ وە دایـــە

---

(١) ما د (ئامەد).
(٢) شفا (ئامەد).
(٣) ئەو (شۆشی).
(٤) عاشقێ دلدار کوشتی (ئامەد).

ڕوهنييـــا وێ شـــەوق و تـــاڤێ
کـەس نـەهـن مـەحـرووم ژ نـاڤێ

شـــەربـــەتـا قـــەنـــد و گـــولاڤێ
لـــێ تنـــێ بـــۆ مـــن غـــەلايـــە

بـێ نـەصـيب مـن دی[١] ژ جـامێ
گرتييـــێ وێ قـــەيـــد و دامـــێ

دوور دوور مـــەحـــرووم ژ ڕامـــێ[٢]
ئـــەڤ غـــەريبـــێ جانفدايـــە

دوورەدەســـتم بـــێ نـــەصـــيبم
پـــوڕ ژ دينـــا تـــەی[٤] غـــەريـــبم

دلبـــەرم خـــانم حـــەبيـــبم[٣]
رووح و راحـــەت مـــن لقايـــە

پـــوڕ مـــولازم تـــێم لقـــايێ
مـــن ڕحـــێ شـــيرين ددايـــێ

مامـــە حـــەتتـــا مولتـــەقـــايێ
هودهـــود ئـــەر مـــزگين بدايـــە

هودهـــودێ ڕضـــوانێ غـــەيبـــێ
دا دلـــێ مـــن مـــورده حـــەی بـــێ

ســـەد خـــەبـــەر شـــيرين ژ جـــەيبـــێ
گوهـــ ل ڕێ مـــن وەک صـــەبايـــە

چـــەهڤـــەنێـــرم گوهـــ ل ڕێمـــە
عـــەرضـــحالا موجبـــەتـــێ مـــە

لـێ صـەبـا ڕوو[٥] دايـە پـێ مـە
بـەنـدەيـەک صـادق مـەلايـە

جانفـــــدايێ مـــــن د ڕێ دا
قالبـــەک بـــێ ڕووحـــە وێ دا

فورقـــەتـــێ دەربـــەک وە لـــێ دا
کوشـت دبـێم بـێ مـن ڕەوايـە[٦]

---

(١) ئەز بووم (ئامەد).
(٢) دوور و مەحرووم بووم ژ کامێ (ئامەد).
(٣) گرتييێ بەندا رەقيبم (ئامەد).
(٤) پوڕ ژ ديدارێ (ئامەد).
(٥) زوو (کۆڤلی) روه (عەمەر، وەستانی، حەلەب) ڕێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) کوشت دبێم من پێ رەوايە (ئيسماعيل) کوشتنا من کر رەوايە (ئامەد، عەمەر، حەلەب)... لێ من ڕەوايە (يووسفی) من لێ ڕەوايە (زڤنگی، ئامێدی).

دەم ب دەم ئەو چەهڤەنێرە — بێتە نیشانەک مە ژێرە[١]
دا ببت ئەو زندە ڤێرە — یارێ صادق بێ بوهایە

عاشقێن صادق د کێمن — یار[٢] دبێ: سەد جان فدێ من
زانم ئەو ناژیتە بێ من — عاشق وپورِ موبتەلایە

عالمین ئەم ڤێ دزانین — جسمە ئەو ئەم رووح و جانین[٣]
قەط ژ هەڤ باطن خویانین[٤] — گەر چ ظاهر ئەو جودایە

هودهودێ وێ رەمز و رازێ — با بوو[٥] ئەو چوو گوفت و سازێ[٦]
قصەبر بەحثا مەجازێ — قاصدێ خوەش طەبع بایە

با[٧] دەمێ وەقتێ مەجال دا — چوو کو ئەو یارە[٨] بپالدا
قصەیا حالی ب حال دا — گوهـ ددێرت یارێ بایە[٩]

موجبەتا مەحبووب و لاتان — پورِ ڤەکر زیوەر صفاتان[١٠]

---

(١) بێت ونشانەک ژ ئێرە (پاشا، عەمەر، یووسفی، کۆڤلی).

(٢) ما (زڤنگی، ئامێدی).

(٣) جسم و رام وروح وجانین (پاشا، عەمەر، یووسفی، حەلەب، وەستانی) رووحە ئەو ئەم جسم وجانین (کۆڤلی).

(٤) جودانین (عبدالسلام).

(٥) رابوو (ئامەد).

(٦) کوفتە سازێ (کۆڤلی) کەشف وسازێ (یووسفی، عەمەر، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی) گوفت ب سازێ (زڤنگی، ئامێدی).

(٧) وێ (ئامەد).

(٨) چوو گوهێ یارێ (کۆڤلی) یار لێ (وەستانی، حەلەب) چوو گها یارێ و پالدا (ئامەد).

(٩) یا رەپایە (پاشا، عەمەر) یار بهایە (کۆڤلی) یارەبا یە (یووسفی) یار پەنایە (وەستانی، حەلەب) یار وهایە (ئامەد) .

(١٠) بەرقەکە ژ نوورا صفاتان (ئامەد).

| | |
|---|---|
| دایە قەلب و ڕووح و ذاتان | ڕۆژ د مرئاتێ خوبایە |
| موحبەتا صووری دو قسمە | قوفل و مفتاح و طلسمە |
| هن ژ ڕووحن هن ژ جسمە | نار و نوورە هن هەوایە |
| حوببێ جسمانی دو ڕۆژن | گەر چ دل پوڕ پێ دسۆژن |
| خەف جەگەر پەیکان د نۆژن | مثلێ نەقشێ بێ بەقایە |
| گول حەتا سوهرن ب طێ ڤە | بێن تەبەسسوم پێڤە پێڤە |
| بولبولێ سەرخوەش د نێڤە | نەغمە و نال و نەوایە |
| هەر چ جلوا بوو[1] ژ ناڤێ | نووگولەک دی گرت خوناڤێ |
| وی ژ دل چوو موحبەتا ڤێ | ئەو ب یا دی ڕا تەبایە |
| هەر کەسێ موحبەت ژ ڕووحە | موبتەلای نوورا سوبووحە |
| وی د دل دا سەد جورووحە | جەذبە و لەرزین و تایە |
| هەردو ڕووح یەک نوورێ تاڤن[2] | چەرخەکە و دو ستێر ل ناڤن |
| هەردو دانە مورغ و داڤن | ئسمێ حەی دام لێ ڤەدایە |
| نوورە پوڕ نادر ووجوودە | گەر چ ئەووەل نار و دوودە |
| بەرقێ لامع دێ ل کوو دە؟[3] | حوب د قەلبان[4] کیمیایە |
| عارفێ جەوهەر شناسی | ئێ ب ڤی وەصف و لباسی |

(١) چوو (ئامەد).
(٢) نوور و طاڤن (ئیسماعیل).
(٣) لامعا بەرقا شوهوودە (ئامەد).
(٤) حوببێ قەلبان (ئیسماعیل).

دێ قـــــەدر بهتـــــر بناســــی		مـــەقعـــەدێ صـــدقێ جـــەزایـــە

دوور نـەكـى دا وى ژ دەرێ[1] خـوه		وەرنـــەگێـــرى وى ژ بـــەرێ خـــوه
بۆرییـــە ئـــەو د ســـەرێ خـــوه		ســــەر د ناڤـــا رێ نهایـــــە

مـا دبـت ئـەو دوورەدەسـت بـت		وێ[2] ژ فنجانـا تـە مـەسـت بـت
جـام ژ شـەهكاسێ ب دەست بـت		ئـــەبتـــەران ئـــەو مـــەى دەوايـــە

یـار پـورِ حوسـنەک ل بـال بـوو		دلبـــەرەک غایـــەت جـــەمـــال بـــوو
ئـەو ژ حـال ئاگـەهـ ب حـال بـوو		شـوبهى وێ[3] شـەفقـە و عـەطايـە

مـــــەهــــدەرا وێ خێرخـــــوازێ		نوکتـــەیــەک وێ رەمـــز و رازێ
وێ ب دل ســـەح کـــر ژ ســـازێ		مـــوغنى و قـــانوون و نایـــە

یووســــــفێ دەورێ زەمـــــانى		گـۆ نـەسـیم: هـان ڤـى[4] نـشانى
لـــێ ژ بـــۆ نـــەکهـــێ دەهـــانى		نـەخـوەشـان ئـەو لـێ شـفایە[5]

مـــاوەرا بـــەلگـــێن گـــولێ بـــوو		بهـــن و بوویـــا کـــاکولێ بـــوو
دارووێـــێ قـــەلبـــێ مـــەلـــێ بـــوو		لـــەو ب چـــەهڤـــێن دل جـــەلایـــە[6]

(١) ژ رێ (پاشا، یووسفی).
(٢) دێ (شۆشی، زڤنگی، ئامێدی).
(٣) کارێ وی (ئامەد).
(٤) هات ڤی (ئسماعیل) ئانی (ئامەد).
(٥) مفایە (ئیسماعیل).
(٦) من جەلایە (عەمەر، یووسفی، ئامێدی) مـن جلایـە (زڤنگی). و ل دویڤ دانـەیا (ئامـەد) ل ڤـێـرێ شعر ب دویماهی دئێت وشعرەکا نوی دەست پێ دکەت. وشعرا نوی ب ڤێ چارینەیێ دەست پێ دکەت:

غـەفلـەتێ بائێ نەسیم هات		خـەف ژ نـک یـارێ سەبایە
پڕ ب ئحسانەک عەمیم هات		قـاصـدێ شـاهـێ گـەدایـە

بـا نـەسـیم دێ چـی لـەزینـی ساغ و سـالم مـا تـو بینـی
ڤـی کومـەیـدی لـێ گـەهینـی دا[1] سـوار بـت لـێ پـەیایـە

غـەفلـەتـێ بـایێ نـەسـیم هـات خـەف ژ بـال یـارێ کـەریـم هـات
پـورِ ب ئحـسانەک عـەظـیم هـات قاصـدێ شـاهێ گـەدایـە

دل نـەفـەس دیـسا ب بـەر هـات لـەو حـەکیم لوقمـان ب سـەر هـات
نـافعێ دەردێ جـەگـەر هـات طـالعێ کـەوکـەب نومایـە

مـن کـو ئـەو نیـشان گهـەشـتێ ئـەڤ دلـێ سـەد داغـێ رِەش تـێ
ذەررەیەک خوەش لێ[2] نەهەشت تێ ئـسمێ ئـەعظـەم پـێ[3] گـەهایـە

چوومـە سـەر پـشتا کومـەیـدی مـن ژێ پـورِ ئـەو ژان و کـەی دی[4]
بەحر و بەرِ مە ل بەر خوە طـەی دی دەشـت و چـۆل و کـەربـەلایـە[5]

مـە و نـەسیم خوەش پـەنجە تێکرا وێ دچـین وەک طـەیـر ڤێکـرا
بـەحثـێ زولفـا یـار پێکـرا بـۆرێ عـشقێ پـورِ فرِایـە[6]

گونبـەدا نـوورین خویـا بـوو سـپێدەیـا صـادق نومـا بـوو
یـەک ب یـەک شـەوقـێ ڤـەدا بـوو قـەصـر و ئـەیـوان و سـەرایـە

قـومری و بولبـول دخـوینن لـێ عـەجـەب ئـەو خـوەش دمیـنن

---

(١) نا (ئیسماعیل).
(٢) ذەررەیەک عللەت (ئامەد).
(٣) لێ (ئیسماعیل).
(٤) من ئەوی پورِ ژان وکەی دی (پاشا، عەمەر، یووسفی) ئەو بەزی شیران وکەی دی (کۆڤلی).
(٥) چۆلێ کەربەلایە (کۆڤلی).
(٦) فەزایە (ئیسماعیل) ڤرایە (پاشا، یووسفی).

هــەر ســەحــەر مــەحبــووب دبیــنن　　عــەنــدەلیــب ڤێــرا تــەبایــە[1]

بوغچــەیــا ســۆرگول د گــەش تــێ　　چیچــەک و رەیحــانێ[2] ڕەش تــێ
دلبــەرێ ســەیــران[3] و گــەشــت تــێ　　ســونبولان طــا طــا ســـەمایــە

ســەبــزەیــان شــەبنــەم گــولاڤ لــێ　　سـۆر عــەقیقــان دوڕ خونــاڤ لــێ
دلبـــەران ســـەیـــران و ڕاڤ لـــێ　　عـــەرعـــەران ســـیتاب دایـــە

بـــووم شـــەریـــف ئــەز ب ئاســـتانێ　　شـــاهدێن وێ گولـــستانێ
ســـاقییان جـــام جـــام ددانـــێ　　کــەوکــەبــان ســەیــوان ڤــەدایــە

چــەنــدەکــی چــەمــەن حــەرەم[4] بــوو　　لــێ مــەدام وەک[5] صــوبحدەم بــوو
مــن بهــشــت[6] بــاغێ ئــرەم بــوو　　لــێ صــەبــا گــۆ مــن ســەبایــە[7]

صــەف ب صــەف ولــدان پــەری بــوون　　بــەنــدێ زولفــا عــەنبــەری بــوون
تێــک ل دێمــی موشــتەری بــوون　　ڕەقــص و گۆڤــەنــد و صــەفایــە

پـوڕ عـومر مـن چـوو ب سـەختـی　　لـــێ شـــوکورخوازم ژ بـــەختـــی
زوهــرەیــەک بــوو ئــەو ل تــەختــی　　بــەلکــوو بێم (شمس الـضحی)یــە

پـــەردەیـــا خـــەلـــوێ کـــو هلـــدا　　یـــەنگییـــەک مـــن دی د مـــل دا
گـــەزمـــەیـــا ژەهـــرێ ل دل دا　　قــەط نــەگــۆ قــەتــل وخــەطایــە

---

(١) فدایە (ئیسماعیل).
(٢) رەیحان د ڕەش (پاشا، یووسفی، عەمەر).
(٣) دلروبایان تێنە (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) خورەم (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب).
(٥) ئەو (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب).
(٦) ب هش (زڤنگی، ئامێدی).
(٧) صەبایە (ئیسماعیل، شۆشی).

هـــادری چـــووم ســـەجـــدە ژێـــڕا لـــێ نیـــەت ئحـــرام نـــە ڤێـــڕا[1]
عاشـــقێ ئـــەڤ گـــەزمـــە تێـــڕا هـــەر چ طاعـــەت کـــت ڕەوایـــە

چـــووم زیـــارەت پـــێ و دەســـتی لـێ نـەهـشت ئـەووەل ب قـەستی
دا بـــــسۆژت ڕووح و هــــەســــتی عاشـــقان ســـۆتن جـــەزایـــە

شـــەربـــەتـــا وەصـــلا خـــوە نـــادەت یـــار هـــەنـــن[2] عاشـــق جـــەزا دەت
دلبـــەران ئـــەڤ ڕەنگـــە عـــادەت مـــەهـــڕووان کـــەمتـــەر وەفایـــە

پیـشە مـەحبـووب[3] غـەنـج و نـازە وەصـــفەتـــێ[4] عاشـــق نیـــازە
یـــــار ل بـــــەر زازان ئجـــــازە شـــەربـــەتـــا شـــیرین مفایـــە

چـــووم طـــەوافـــا پـــێ و دەســـتان شـوبهەتـی سـەکـران و مـەسـتان
ئـەهلـێ حـال و خـووب پـەرەسـتان وان ژ عـــومر ئـــەڤ مـــوددەعایـــە

تللییـــێن نـــازک شـــەمـــالین مـن ل سـەر چـەهڤێن خـوە مـالین
طـــالبێ وەردێـــن ب خـــالین دل د ڤـــێ فکـــرێ تـــەبایـــە

چـوو عـومر مـە[5] د ڤـێ خـەیـالێ مـــا شـــەڤـــەک عیـــدان د ســـالێ
بـــێم زیـــارەت زولـــف و خـــالێ ڕۆژ و شـــەڤ مـــن ئـــەڤ دوعایـــە

چـــەرخ دترســـم کـــت شـــتابێ زوو ئـــەجـــەل پـــێ دت رکـــابێ
جـان بـرت مـە د ڤـێ عـەذابـێ ئـەڤ سیاهـ ڕەنـگ ئـەژدەهایـە

(١) لێ نەبت ئحرام تەڤێڕا (پاشا، شۆشی، یووسفی، عەمەر).
(٢) تا هنەک (زڤنگی، ئامێدی) یار حەتا (کۆڤلی) یار هنەک (حەلەب، وەستانی).
(٣) پیشەیێ وان (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) صەنعەتێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) چووبوو عومرم (ئیسماعیل).

چـەنـدەکـی صـادق جـەمـا بـن ئـــــەر ببێـــــژی جانفــــدابن
وەک مـــەلـــێ لازم تـــو نـــا بـــن وی ژ دل جـــانێ خـــوە دایـــە

## دلبەرێ سەردارێ خووبان

دلبـــــەرێ ســــەردارێ خووبـــــان		ئــــەز نــــزام[1] ئاگــــەهــــ هــــەیــــە
عارفــــە ب حــــالێ قولووبــــان		عالمــــە ب حــــالێ مــــەیــــە

عالمــــە ب داغــــێن فوئــــادان		گــەزمــەیــێن وان نــوون و صــادان
چوونــــە دل حــــەتتــــا ب ڕادان		یــــەنگییــــێ ڕەش گۆشــــەیــــە

گــەزمــەیــێن وان صــاد و نوونــان		ئــــاوڕێن ئــــەســــوەد عویوونــــان
ڕادکــــن ئــــەو قــــەتــــل و خوونــــان		مــــن دییــــە و دل شــــەهــــدەیــــە

لازمــــە ل ســــولطان و میــــران		پورســــکرن ل حــــالێ ئــــەســــیران
ئــــەم کــــرین[2] ئامــــانجێ تیــــران		ســــوختەیــــێن[3] دەرمانــــدەیــــە

هێــــژ نــــزانم میــــر[4] د بیــــرین		زانــت ئــەم ســی ســال ئــەســیرین
چــەهڤــەنێــر پوڕســەک ئــەمیــرین		لــــەو ب ڕەحــــم و شــــەفقــــەیــــە

پــــوڕ دبــــێم شــــەفقــــە ل بالــــە		عــــارف و صــــاحب کــــەمالــــە
جارنــــان بێینــــە خــــەیالــــە		پــــورس بکــــت چ لــــێ هــــەیــــە

شــــەفقــــە کــــت جارجــــار نهینــــی		توولــــەیــــێ ئاســــتان ڤــــەخــــوینی
دا ڤــــەکــــم داغــــان ببینــــی		نــــار و پێــــت و شــــوعلەیــــە

---

(١) ئەز دبێم (ئامەد).
(٢) ئێ کری (شۆشی).
(٣) قەط نەگۆ (ئامەد).
(٤) هێژ نزام میران (ئیسماعیل، شۆشی).

دا بزانت پێت و نارم  کوشتییێ جوهتێ خومارم
موحبەتێ سوهتم بووارم  لازم ئەو زانت وەیە

عالمە ب دەرد و برینێ  ما دەما دیدار و دینێ
خەف دبت ڕەمزا ئەڤینێ  ڤێ بزان بێ شوبهەیە

هەر دەما دلبەر دیار بت  جان و دل تێک تارومار بت
دێ چ ڕەنگ موحبەت ستار بت  خەفکرن بێ فەیدەیە

هەر دەما مەحبووب ظوهوور بت  زێدە مەظهەر بێ قوصوور بت
دێ تەجەللایەک ل طوور بت  بەرقێ لامع جەذبەیە

جەذبەیێ دل ژ[1] ووجوود بر  خەف ژ بەر عەینێ حەسوود بر
من ب[2] محرابێ سوجوود بر  لێ حەجەر نیشانەیە

سەجدەیا بەر نوون و دالان  من طەوافا زولف و خالان
ئەو بەسە ژ صاحب جەمالان  دا بچین لێ عومرەیە

ئێ یەکی صادق[3] حەبینی  بێ حجاب گەر ئەو[4] ببینی
ما ل هشیاری دمینی  سەرخوەشێ بێ بادەیە

عشقە طوغرایا نهینی  هەر دەما مەحبووب د بینی
دێ ب دل لازم بخوینی  ئەڤ چ ئسم و نوسخەیە؟[5]

---

(١) ژێ (پاشا، عەمەر) جەذبەئێ دل زێ و جوو دبر (شۆشی).
(٢) د (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) صاحب (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٤) ئەو لێ (پاشا، شۆشی، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی) لێ ئەو (ئامەد).
(٥) ئەڤ چارینە ل نک (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر) نینە.

لامعـــا وێ حوســـن و نـــوورێ گـــەر چ تـــێ دل شـــوبهی طـــوورێ
باطنــــە نــــایێ ظوهـــوورێ لـــــێ حجـــاب و پـــەردەیـــــە

عـــارفن مــــەعنـــا شناســـن ئـــەو[1] ب ســـەد صـــوورەت لباســـن
غـەیری مـەحبـووب وان[2] نـەناسـن خـــەف ژ وان زانـــی مـــەیـــە[3]

ئـــێ ل مـــن یـــەنگـــی کـــشاندی ســـەد خـــەدەنـــگ ڤێـــرا ڕەشـــاندی
دل ژ دەربـــــێ هـــــەررشــــاندی ئـــەز کـــری[4] ئـــەختـــەرمـــە یـــە

لازم ئــــەو زانــــت ب حــــالی دلبـــــەر و یـــــارێ مـــــووالی
گـــەزمـــەیـــێن قـــەوســـێ هلالـــی دەرب ل نیڤـــــا ســـــینەیـــــە

هێــژ دبــێم مــەحبــووب[5] نزانـــی مـــــن ئـــــەوە ڕووحـــــێ کیــــانی
پـــورس نـــەکـــر بیـــرا خـــوە نـــانی ئــــەڤ چـــڕا پـــەرکـــەنـــدەیـــە؟

پـــورس نـــەکـــر شـــاهێ جـــەهـــانی یووســـــــفێ دەورێ زەمـــــــانی
ئـــــەڤ چ خاکـــــە ل ئاســـــتانی بـــەل ئـــەســـیرەک ژ یـــن مـــەیـــە

بوومـــە خـــاک ئـــەز لـــەو ژ ڕێڤـــە دا دەمـــــا یـــــار بـــێ ژ وێڤـــــە
دامـــــەنـــــێ بگـــــرم ژ پێڤـــــە چـــەنـــدەکـــێ مـــن جـــەهـــدەیـــە

چـــەنـــدەکـــێ طاقـــەت ددێـــرم بـــم غوبـــار بـــەدرێ ڤـــەشـــێرم
گـــەر ژ چـــەهڤـــان ئـــەز بـــوێرم مـــن زەنـــەخـــدان طـــەلبـــەیـــە

---

(١) لەو (پاشا) لێ (زڤنگی، ئامێدی) لێ (ئامەد).
(٢) کەس (ئامەد).
(٣) خەف ژ وان ڕا توهمەیە (ئامەد).
(٤) ئەز کرم (ئامەد).
(٥) دلبەر (ئامەد).

دا بنووشم مەی ژ لێڤێ ماوەرا ڕەیحان و سێڤێ
لوئلوئێن شەککەر د نێڤێ ئابێ حەیوان چەشمەیە

چەشمەیا ئاڤا حەیاتێ شەربەتا قەند و نەباتێ
من ل داغان ئەو مفا[1] تێ جان ژ بۆ شوکرانەیە

لەو وەکوو سەودا ودینم هەر دەما دێمی[2] دبینم
دین دبم حەیران دمینم موشتەری یا زوهرەیە؟

شەمس د نێڤ بورجا شەرەف دا سەد کەواکب چار طەرەف دا
موشتەری هاتی ب ڕەف دا ئستوا چوو قبلەیە

ئافتابێ د ئستوائێ ئەز ژ بەر ضەرب و جەفائێ
جانفدا تێمە لقائێ شوبهەتی پەروانەیە

من تویی مەقصوود ژ ژینێ[3] من ژ بەر مەوجا ئەڤینێ
سەد[4] دکم دیدار و دینێ مەظهەرە بەس زێدەیە

ڕوهنییا چەهڤێن نەبینان مورشدێ مەجذووب و دینان
دارووییێ دەرد و برینان من طەلەب دینا تەیە

بینە پێ نازک موبارەک دەینە سەر چەهڤێن م بارەک[5]
من جورووح خوەش بن ب جارەک ڕوهن ببن پێ دیدەیە

---

(١) شفا (ئامەد).

(٢) یارێ (ئامەد).

(٣) دینێ (پاشا، کۆڤلی، یووسفی، عەمەر، وەستانی، حەلەب).

(٤) سەد (عبدالسلام، وەستانی) قەصد (ئامەد).

(٥) جارەک (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).

بین کەفا نازک ژ نوورێ    تللییێن جاما طەهوورێ
بهن ژ ماوەرد و بخوورێ    من زیارەت تەوقەیە

دا ل سەر چەهڤان بمالم    بولبولێ وەردێن ب خالم
جارەکێ رەحمێ کە ظالم    شەفقە خوٚ[1] حەققێ وەیە

ئەر نەکی رەحمێ تو میرۆ    دێ چ بت حالێ مە ئیرۆ
قەط نە جارەک بێی ئەسیرۆ    گرتییێ سی[2] سالەیە

شوونجهێ پەیکان و نەصلێ    ژ تللییێن یاقووت و فەصلێ
ئەر نەکی دەرمان ب وەصلێ    ژ دەرب و تیر و گەزمەیە

گەزمەیێن یارێ کو باڤێ    نە ژ مەی و قەند و گولاڤێ
بێت دەوا کت وان د گاڤێ    ما حەیاتەک لێ هەیە؟[3]

نەتنێ قەند و نەباتی    مەظهەرێ رووح و حەیاتی
هەم بوت و عوززا و لاتی    لەو مە دل بوتخانەیە

خوندێ لاتێ ئازەری تو    بێ[4] چ شیرین دلبەری تو
هەر جهێ لێ بێوەری تو    بێ خلاف ئەو کەعبەیە!

ما دبت بێ حەق[5] خلافێ    سەر دەتێ[6] ما ڤێ نصافێ

---

(١) کو (ئیسماعیل).
(٢) سەد (ئامەد).
(٣) ژ ضەرب و تیر و گەزمەیە (ئامەد).
(٤) لێ (ئامەد).
(٥) بێخن (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی) بێ خەف (حەلەب).
(٦) د دەت (زڤنگی، ئامێدی) تو وەرە جارەک نصافێ (ئامەد).

ئــەر بکــی بێمــە طــەوافــێ		مــن ب ئــەسـوەد سـەجـدەیـە

دا زیــــارەت کــــم نــــشانی		بــەر[1] زوحــەل بێــتن قرانــی
توولــەیــم ســەر ل ئاســتانی		چــەهڤــەنێــرێ مووچــەیــە

مــا ب زەهــرێ شــەککــەرینــی		مووچــە دی دا خــەف بخــوینی
دا ڕەقیــب مــەلعــوون نــەبینــی		پــوڕ (علیــه اللعنــه)یــه[2]

گــەر ببــەخــشی دل مــورادێ		ژ وێ حــەیـات و خــەمـر و بـادێ
دێ بکــم[3] گللــەهــ و دادێ		داد مــە دیــسا د بــەر تــەیــە

گوهــ بــدە بــەر گلهــ و دادان		حــاکمێ شــەهــر و بــیلادان
دێ تــو داخــواز و مــورادان		دی کــەســێ بــێ چــارەیــە

دێ تــو دیــسا شــەفقــەتــێ کــی		ب ئــەو نــشانا جــەبهــەتــێ کــی
مــە ژ حــەریمــێن خدمــەتــێ کــی		مــەحــرەمــێن بــێ پــەردەیــە

بــێ نــشانێن مــە نــشان کــی		ماهــ و خورشــیدێ قــران کــی
بــەنــدە کــەلبــێ ئاســتان کــی		دوور نــەکــی خــوەش توولــەیــە

دا دەمــا صــوحبەت ب جــووش بــی		جام ب خوە ژ[4] لەعلان بنووش بی
مە ژ حەبیب سەد دەنگ سورووش بی		دینبــەر وپــوڕ عــشوەیــە

---

(١) پر (شۆشی، ئامەد).
(٢) ئەڤ چارینە د دانەیا (ئامەد) دا ب ڤی ڕەنگییە:
دا زیـارەت کـم نـهـینـی		لێڤ و لەعلێ شەککەرینی
دا رەقیب مەلعوون نەبینی		پـڕ (عـلـیـه الـلـعنه)یه
(٣) دانەکم (زڤنگی، ئامێدی).
(٤) خوەش (پاشا تێ نەبت) جام ل سەر لەعلان (ئامەد).

شـــەربـــەتـــا وێ جـــام و طاســـێ
بێت مـە ژی فـەیـضـەک[1] ژ کاسـێ

یـــار کـــو تـــێ بێـــت ئنعکاســـێ
ئـــابێ حـــەیـــوان ئـــەو ب خـــوەیـــە

ئـــێ ژ ڤـــێ ظـــەرفـــێ ڤـــەخـــواری
مـــەســـتییا چـــەهڤـــێن خومـــاری

خـوەنـدی[2] ئـەو خـەططـێ غوبـاری
قـــەنـــج دبـــێ ئـــەو زێـــدەیـــە

مـــن ل دل تیـــرەک موغـــل دی
لـــێ دبـــێم دەردێ کـــو دل دی

تێـــک ژ بـــەر خـــوونێ قـــزل دی
هێـــژ ژ چـــەهڤـــێن شـــەهلـــەیـــە

رۆهنییـــا چـــەهڤـــێن مـــەلایـــی
حـــوب تنـــێ دا مـــن گـــەدایـــی

خـــالقێ حوســـنا تـــە دایـــی
حوسـن و حـوب یـەک چـەشـنەیـە[3]

دیتییـــە[4] نـــوورا یـــەقـــەق[5] مـــە
پـــوڕ نـــە بـــی ئـــەرزان ل حـــەق مـــە

سـەد نـەسـەق لـەو تـێن سـەبـەق مـە
لـــێ مـــەلا خـــوەش بـــەنـــدەیـــە[6]

---

(١) بێتە دل فەیضەک (ئامەد).
(٢) دیتی (ئامەد).
(٣) چەشمەیە (ئامەد).
(٤) دیتییا (زڤنگی، ئامێدی) دیتنا (پاشا).
(٥) ب حەق (پاشا، شۆشی، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٦) هەژار ل وێ باوەڕێیە کو ئەڤ شعرە نە یا جزیرییە [ ئیسماعیل ].

## طورڕەیا تابدار عەنبەر کە

طـــــوررەیــــا تابـــــدار عــــەنبــــەر کــــە
خـــەمـــرییێن شـــەنـــگ مـــسک ئـــەذفـــەر کـــە
ل گــــولان مــــسک و عــــەنبــــەر بــــڕەشــــین
ژ گــــولاڤێ جنــــەســــرییان تــــەڕ کــــە
کــــەســــک و ســــۆرێن ژ ڕەنگــێ قــــەوس قــــوزەح
ژ ســــەراپــــا گــــولاڤ و مــــاوەر کــــە
ســــورمە پووشــــین ســــوڕێ ب ســــەر کــــل دە
عــــاقلان لــــێ خــــەراب و ئــــەبتــــەر کــــە
هــــەر ســــەحــــەر دەســــتەکــــێ ژ نــــوو وەرگــــر
عــــەرعــــەرێ تێکــــدا ســــەراســــەر کــــە
قــــەد و قامــــا شــــرین[1] و نــــازک و تــــەڕ
لــــێ ســــەراســــەر بفــــەصــــلین و کــــەرکــــەر کــــە
نێرگــــزێن ســــەرگــــران هلــــین جــــارەک
دو قرانــــان ل یــــەک بــــەرابــــەر کــــە
تــــو بمــــەش کــــۆک ل ســــەر دەرێ قــــەســــرێ
ب خــــوە کــــۆکی ل شاهــــ و قــــەیــــصەر کــــە
وەرە وەک ڕۆژ ب ســــــەر دەرێ کــــــەلهــــــێ
عالــــەمــــێ تێکــــدا مونــــەوەر کــــە

(١) شەریف (زڤنگی، ئامێدی).

وەک گـــولا زەر ژ بـــۆ ســـەروا تـــە مـــرم
مـــە ب قوربـــانی خـــوە وەک گـــولا زەر کـــە
وەک گـــولا زەر د بوغچـــەیـــا تـــەمـــە ئـــەز
تـــو مـــە تێکـــل خـــوە وەک گـــولا زەر کـــە
زاهـــدێ هـــشک گـــەبـــع ســـەودایـــە
ب دو جامـــان گـــەبیعـــەتـــی تـــەڕ کـــە
وەرە جـــارەک تـــو دەرێ لـــوطفێ ڤـــەکـــە
مـــە ب قوربـــانی تێـــک خـــەنجـــەر کـــە[1]
ڤـەکـە جـارەک ب خـەنـدە شـەککـەرێ تـەنـگ
تێـــک مـــصرا مـــە قـــەنـــد و شـــەککـــەر کـــە
پـــێ ل ســـەر دیـــدەیـــێن مـــەلـــێ دایـــین
خـــەلـــوەیـــا صـــووفییان مونـــەووەر کـــە
خـــەط و خـــالان نـــشانی نـــشانی دە
مـــە ژ نـــاڤێ خـــوە ڕا ب دەفتـــەر کـــە

(١) ئەڤ مالکە ل نک (کۆڤلی) ب تنێ هەیە، و د دانەیا (ئامەد) دا ب ڤی ڕەنگییە:
وەرە جارەک ئەگەر تو لەطفێ بکی
مە ب قوربانێ یەک دو خەنجەر کە

# گەر چ بولبول

گـــەر چ بولبـــول جـــەوهـــەرێ ذاتـــێ گولـــە
لـــێ گـــولێ ڕەونـــەق ژ عـــشقا بولبولـــە

گوهـــدە ذکـــرێ حـــال و جووشـــا بـــادەیـــێ
وێ ب بولبـــول ڕا دخوونـــت بولبولـــە[1]

سووســنان ســەد ڕەنــگ ئــاڤێهتن کــەمــەنــد
وان نــە گــۆ دل بــەنــدێ تایــەک ســونبولە

ســونبولان ســەیــوان ل دێمــی تــازە کــر
ئافتــاب ئیــرۆ د بورجــا ســونبولە

قــەط ڤــەڕێکــی[2] ڤــی دەمــی حاضــر دبــت[3]
قصــصەیــا فــەصــلێ نــە کــارێ ســونبولە

عــەرعــەرا ڕەنگــین ژ تــایێ ســۆر وزەر[4]
قومرییــان ســەد ڕەنگــی شــیرین غولغولــە

ڕەمــزەیــا عــشقێ ژ بــالا هاتــە خــوار
قودســییان ئاڤێهتــە چــەرخــێ غولغولــە

مــن ژ دل ناســوورەکــی دا هــەســتییان
(لاجــرم) هێــژ نــەشــئەیــا داغــا کولــە

---

(١) بلبلە ( عبدالسلام، وئەو دبێژت : بلبل مەعنا وێ پەرداغێ مەییێیە).
(٢) دبت د بنیات دا : ڤ ڕێکێ ، یەعنی: ڤێ ڕێکێ.
(٣) بکی (عبدالسلام) بکت (ئیسماعیل، شۆشی، ئامەد، حەلەب).
(٤) ژ حوسنێ کەمملین (ئامەد).

بولبـــول و پـــەروانــــە و فـــەصـــــل و دەمـــــن
جنـــــسێ عــــشقا مــــــن تنــــێ دەردێ كولــــــە
نێرگـــزا نـــازک قـــەدا شـــەهلایـــا مـــەســـت
دیـــــن كـــرم ئـــەز بولبـــولان ســـەودا گولــــە
طـــەبعـــێ لامـــع وەش ژ مننـــەت بولحـــەســـەن
مـــــن د دەســـــت دا (ذو الفقـــار) و دولدولــــە
عـــەشـــقەرێ[1] بـــەد فعلـــێ چـــی هیكـــر عـــەجـــەب
(بـــارک اللـــە) خـــوەش بـــەزی هـــەســـپێ قولـــە
زولـــف و بـــسكان پـــورِ ژ مـــن دل بـــر بـــەلـــێ
رِشـــتەیـــا جـــانێ مـــەلـــێ ئـــەو كاكولــــە[2]

(١) ئەشقەرێ (ئیسماعیل، شۆشی، ئامەد، عبدالسلام).
(٢) لەو ژ وان داغ و برینان دل كولە (ئامەد).

# یارێ مە پوڕ

یـــارێ مـــە پـــوڕ نیـــشان و ســـوڕ سـیما ژ دوڕ دێـم کـەوکـەبـە
ئـەو لـەب شـەکـەر نـازک بـەشـەر جـەبـهـەت سـەحـەر کـاکول شـەبـە

شـــەب کاکولـــە خـــال فلفلـــە چـــین ســـونبولە داڤـــا دلـــە
مـــن غـــەفلـــەتـــێ دی قبلـــەتـــێ وەک ماهــ د تیـسا غـەبغـەبـە[١]

مـن دی ب خـەف صـوحبەت ب دەف شـاهێ ب خـەف[٢] فنجـان د کـەف
نوونێن ژ یەنـگ[٣] بـەردان خەدەنگ وێ پـوڕ ژ تـەنـگ[٤] شـیرین لـەبـە

دئـانی ظـوهـوور دێمـێ ب نـوور خـالێن د هـوور جامـا طـەهـوور
سـاقی وەریـن جامـا زەریـن ئـەو سـوڕ شـرین جـام مـەشـرەبـە

خـال و خـەتـێ شـۆخ قامـەتـێ مـە ژ ڤـێ کتێب و دەسـتخەتـێ
هـەردەم ژ نـەو دل فـەیـضە ئـەو ئـەڤ عـشق و سـەودا مـەذهـەبـە[٥]

مـن بـێ قـەدار ئـەڤ سـڕ ڤـەشـار عـشقا غـەدار سـوهتی سـتار
مهـرا بوتـان خـال و خـەتـان صـەندووقـە جـان[٦] و مـەقلـەبـە

(١) وەک ماهێ نیشان غەبغەبە (پاشا، یووسفی، عەمەر) وەک ماهێ تێ بان غەبغەبە (کۆڤلی).
(٢) نەجەف (ئامەد، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب).
(٣) نوونێ کوژی (پاشا، یووسفی، عەمەر) نوون کو ژ یەنگ (کۆڤلی).
(٤) وێ پوڕ ژەنگ (پاشا، عەمەر).
(٥) مەوهەبە (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) خان (ئامەد، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی، حەلەب).

دێمــێ ب خــال ئــەو نــوون و دال ئــسمێ جــەلال بــەژنــا شــەپــال
یــەکتــا ئــەلــف نــایێ وەصــف مــن عــەقلــێ طـفلــێ مـەذهـەبـە[1]

حـەتتـا نـە مـام سـالک تـەمـام شــیرین کــەلام مــا دا مــە جــام
بێ جەهد قـەط تێن ئـەمر و خـەط هـەر چ کـو مـەطلـەب مـەنـصەبـە

دەرمانــدەیــیم حــەیــران تــەیــیم پیرانــە[2] یــیم خــوەش بــەنـدەیــیم
زازا ب ســـرِ دل ژێـــم ڤـــەکـــر دەر حــەق مــە پــرِ ئــەرزان مــەبــە

بــەرگــێن گــولێ ئــەو مــسکە لــێ هوورهــوور وەلــێ دەرحــەق مــەلــێ
بــێ پــەردەوو خــوەش مــەعــدەوو یــەک وەعــدەوو پــورِ شــەفقــە بــە

(١) مەکتەبە (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٢) پەروانەییم (ئامەد) میرانە (حەلەب، وەستانی).

# ئیرۆ ژ موورادا تە[1]

ئیــرۆ ژ مــوورادا[2] تــە دلــێ مــن ب برینــە
(اللـه) چ حـەبیبـی چ طـەبیبی ڤـەکـەوینـە
جارەک تو نەظـەر دە ل مە مسکین و غـەریبان[3]
بـەردە تـو[4] ژ حـەبسێ و ژ زنـدانێ دەرینـە[5]
دائـم ژ خـەیـالا تـە مـە سـەد نالـە د دل دا
لـەورا ژ مثـالا تـە چـو سـۆرگول مـە نـەدینـە
مثلـێ تـە نـە ئـادەم وە نـە ئبـراهیم و نووحـە
یووسف ب تە مـەحبووب و ل یـەعقووبی شرینە
معراجێ تە کر کەس دی نەکر صـەدرێ رسالـەت[6]
قاصـد ژ خـودێ ڕا بـۆ تـە جبریلـێ ئـەمینـە
غـەیری تـە نـەهـن دەر صـەدەفـێ بـەحرێ ووجوودێ
لـەو لازمـە ئـەم قـەصدێ بکین ڕاهـێ مـەدینـە

(١) ئەڤ هەلبەستە ب تنێ ل نک (بەغدا، کۆڤلی، ئامێدی) هەیە، وسـەیـدا (عـبـد الـرقـیـب یوسف)ی ژی د (دیوانا کرمانجی) دا ئینایە.. وهێژای گۆتنێ یە مە مـالکێن ڤێ هەلبـەستێ ل دویڤ تـەرتیبا (کۆڤلی) نڤیسینە.
(٢) جەمالا تە (بەغدا، عبدالرقیب، قۆغی، ئامێدی).
(٣) منێ مسکینێ غەریبە (بەغدا، قۆغی) من مسکین وغەریبە (ئامێدی).
(٤) مە (عبدالرقیب، قۆغی).
(٥) ژ زندان مە دەرینە (بەغدا).
(٦) معراج د گەل کەس نەبووی صەدرێ رسالـەت (قۆغی).

ظـالم[1] ڤـەشـرى كـوفر نـەمـا قـەط د دنـێ دا
جەننەت بوو موزەييـەن خەملين حـوور و پـەرينـە
بووبـەكـر و عومــەر هــەردو ژ حوبـا تــە دنـالن
مــەقتــوول ژ فراقـا تـە چ عوثمـان و عــەلينــە
شەمـس و قـەمـەران شـوعلە ژ ڕوويـێ تـە ڤـەدابـوو
يەلمـووم ژ تـە بـوو مـۆم و شـەمـال ژێ ئـەيسينە
گاڤـا كـو تـو هـاتى بوويـە ڕۆنـاهى ل هـەر جـا
ئێـدى مـە نـە دى ظـولم و خرابـى ڤـەشـرينە
ئـسمێ تـەيـە مـەكتـووب د گـەل ئـسمێ خـودايى
چەنـد موذنـب و عاصـى ب وى نـاڤى غـەفرينـە
عەكسێ ژ روخێ[2] تە شەب و رووزان وە دخـوازن
هنـدى كـو هـەنـە جوملـەتـێ[3] مرئـات و ئـەيينـە
گـەر دێ تـو نـەبوويـا نـەدبـوو چـەرخـێ ب دائـر[4]
سەرگەشتە ژ شەوقێ نە[5] تنێ نەھ فـەلـەكينـە[6]
فـەهمـا منـە قاصـر وە نـەشـێم وەصـفێ ئـەداكـم
مــەدداح ژ تــە ڕا خـالق و هنـدى مـەلـەكينـە

(١) ظولمەت (قۆغى).
(٢) ڕوييێن (قۆغى).
(٣) خەملەئێ (قۆغى).
(٤) ئەڤە ئشارەتە بۆ وێ حەديسا قودسى ئەوا دبێژت: ((**لولاک لولاک ماخلقت الافلاک**)) وئەڤ حەديسە وەكى بەرى نوكە ژى مە دياركرى يا دانايييە مەوچووعە وچو بناخە بۆ نينن.
(٥) شەوقا تە (كۆڤلى) شەوقێ تە تنێ نە مەلەكينە (بەغدا).
(٦) .. شەوقێ تە تنێ نە مەلەكينە (قۆغى).

جارەک تو شـەفاعـەت کـە ب نـاڤێ خـوە ژ بـۆ مـن

لـەورا کـو مـەلـێ غـەیـری تـە ئـمـداد تـو نینـە

## ژ نەشئا بادەیا ساقی[1]

ژ نـەشـئا بـادەیـا سـاقی دلـێ مـەجرووحـێ شـەیدایـە
ژ شـەوقـا دیتنـا سـاقی ضـمیر و دا موجـەللایـە
وەرە صـووفی موسـلمان بـە ب سـاقی سـەجـدەئـێ بینـە
کـو صـوورەت مـەظـهـەرێ ذات و صـفاتێ حـەق تـەعالایـە
دلـۆ ئـەر تـێ مـەکـە گـازی جـەوابـا (لـن ترانـي) دا
ژ بـەر فکـرێ د مووسـایی دلـێ مـن طـوورێ سـینایە
بخـوازە گـەوهـەرا عـشقێ ب تـەرکـا ئـەمـرێ نـەفـسانی
ئـەگـەر جوزئـەک ژ مـە مایـە یـەقـین نـەقـشێ هـەیوولایـە
سەحەر هەر ڕوو ل مەیدانێ خەراب و مەست و سەرخوەش تێن
مـەلا عـوذرێ تـە مـەقبوولـە کـو دلبـەر مـاهێ سـیمایە

---

(١) ئەڤ شعرە د چو دەسنڤیسێن دیوانا مەلایێ جزیری دا -یێن ل بەر دەست- نەهاتییە، ب تنێ ئەو د (دیوانا جامع) دا یا مەلا ئەحمەد حلمی یێ قۆغی دا هاتییە، و تەخمیسەکا مەلا یاسینێ یوسری ل سەر هەیە، و وی ئەو بۆ جزیری پالدایە.

# قافییا ( و )

## مە لەو فنجان ل سەر دەستە

مـە لـەو فنجـان ل سـەر دەسـتە کـو مـەهتابـا هـلال ئـەبـروو
نومــاین مــن د مرئــاتێ مــەیــا صــافا زەلال ئــەبــروو
ب شـــــیرینی ب زیبـــــایی ب ڕەفتـــــاری ب بـــــالایی
بنــێ نــوونێن د طــوغرایی ل بــالا هــەردو خــال ئــەبــروو
بـلا بێـت[1] (صـائم الـدهر) و بـلا ئفطـار جـارەک بـت
کـەسـێ زانـی ژ دلبـەر وێ خویـابن هـەردو سـال ئـەبـروو
مـەشـی[2] مـەسـتانە ڕەیحـانی دلـێ مـن دی د ئامـانجێ
ڕەشاندی سینەیێ[3] تیران ب قەوسێ هەردو مال ئـەبروو[4]
سەحەرگەهـ زوهرە سیمایا مـە[5] چوو گولـشەن ب سـەیرانـی
ب سـەر چـەهڤـێن نـشانی دا خرامـی ئـەو هـلال ئـەبـروو
د بـێن: خـاوەر پـەرەسـتی تـو! نـزانن مـن د کـەشـفێ دا
نومـاین مـن د شـەرقـێ نازکـا گـەردەن شـەمـال ئـەبـروو

(١) بت (ئیسماعیل، بەغدا، ئامەد، عبدالسلام، حەلەب).
(٢) شەبێ (پاشا، شۆشی، بەغدا، ئامەد، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر).
(٣) کشاندی شیپەیەک (پاشا، شۆشی، بەغدا، یووسفی، عەمەر) رەشاندی شیبەیەک (ئیسماعیل، کۆڤلی) شێنەیەک (ئامەد).
(٤) ئەڤ مالکە ل نک (عەمەر) یا پاشختستییە
(٥) نە (یووسفی، عەمەر) سیما وا د چوو (زڤنگی، ئامێدی) ب خوە گولشەن (بەغدا).

تنــێ مــا هــەر تــەرازوونــە د بــابێ حوســنێ کێــشایی
هلالــێ خاتــەمــێ حوســنن ل وی دێمــێ ب خــال ئــەبــروو
مــە جــەوهــەر عونــصرەک خــامس نومــا ئیــرۆ د طــالع دا
د ڤــێ تــەقــویمێ ئنسانی ل طــالع بوونــە فــال ئــەبــروو
ب زوننــــارا د دێــــرێ دا ل هنــــداڤا چــــەلیپــــایێ
ب محرابــێ مــە بــر سەجدە بــەلــێ ئــەمما خــەیال ئــەبروو
د مابــەینــا دو ئــەبروویــان د بیــنم قابــەقــەوســەینــێ
ددت مــن (طرفــه العــین)ێ جــەوابــا ســەد ســوئال ئــەبــروو
د بــاطن ســەجــدەگاهــا مــن ژ بــۆ وێ[1] هــەردو ئــەبروونــە
ب عــەینی طــاقێ محــرابن د علمــێ ئــەهلــێ حــال ئــەبــروو
ئــەگــەر دەعــوایێ مووســایی[2] د عــشقێ دا بکــم جــائز
مــەلا دائــم تــەجــەللایــە ژ وێ تــەرحــا شــەلال ئــەبــروو
ب شــیرینی ب زیبــایی، چ کاتــب بــوو وە کێــشایی؟!
(تعالی الله) نـشان دانـە وە شیرین[3] ئـەڤ مثـال ئـەبروو
نــە شــیرینا ل دەربــەنــدێ نــە مــەحبــووبێ ســەمــەرقــەندێ
نــە کێــشاین ب ڤــی ڕەنگــی ل نــەقــشێ بــێ زەوال ئــەبــروو
نــشانا قابــەقــەوســەینــێ کــو قــەوس ئاڤێهتــە ئــەبــصاران
د تــەقویمــا تــەجــەللایــێ ب ســەر[4] لــێ بــوون هــلال ئــەبــروو

(١) سەجدەگاهێ من ل بەر وان (زفنگی، ئامێدی).
(٢) عیسایی (پاشا، ئیسماعیل، شۆشی، بەغدا، عەمەر، حەلەب، وەستانی).
(٣) (تعالی الله) زهێ صانع کو دانین (ئامەد).
(٤) دو سەر (ئامەد) ل سەر (ئیسماعیل، بەغدا).

# من دێ سەحەر

مـن دی سـەحـەر شـاهێ مـەجـەر	لبـسێ د بـەر مـەخمـوور بـوو[1]
ئـەو دێـم زەری سـورِ موشـتەری	یـا رەب پـەری یـا حـوور بـوو

حـووری وەشـە شـیرین مـەشـە	کـاکول رەشـە[2] خـال حـەبـەشـە
خـالێن د قـەر مـسکێ تـەتـەر	نـازک بـەشـەر کـافوور بـوو

نـازک لـەطیـف گـەردەن ظـەریـف[3]	لبسێ شـەریـف کـەمخـە و قـەدیـف
مـن دی ب وەخت ئـەو نیـک بـەخت	ئیـرۆ ل تـەخـت فـەغفـوور بـوو

فـەغفـوور سـورِە سـیما دورِە	هـەیبـەت پـورِە دل کـر گـورِە[4]
ئـەو هاتـە مـەش مـن چوونـە هـەش	دل مـن ژ عـەشـقێ فـوور بـوو

دل بـوو کـەری زایـا بـەری[5]	لازم هـەرِی دێ ئـەو زەری
مـن دی گـەلـەک ئـەو سورِ مـەلـەک	وەک مـەشعـەلـەک پـورِ نـوور بـوو

دێـم فـەنـەرە خـال عـەنبـەرە	بوومـاوەرە لـەب شـەککـەرە
ئەو مەی پەرەست مەشها و مەست	جامـا د دەسـت فـەرفـوور بـوو

---

(١) حەرفا (ر) یا ل بەری ( بوو) ل هەمی قافییێن ڤێ هەلبەستێ د ڤێت بێتە کێشان دا بکەفتە بەرانبەر (مستفعلن).
(٢) شەمعا گەشە (ئامەد).
(٣) خەفیف (پاشا، ئیسماعیل، کۆڤلی).
(٤) گورِە، ئانکو: گورِییا ئاگری.
(٥) رِۆژا بەری (ئامەد).

مەی[1] بەرکەفێ مەشها صەفێ سووزا دەفێ دا قەرقەفێ
حوسنا ل دێم وەصفان نەشێم هەر چ دبێم ژێ دوور بوو

دا من سورووش وەر[2] مەی بنووش ذەوق و خورووش لەو چووم ژ هووش
ژ وێ عشوەیا یار بوو خوەیا ئەو نە ژ مەیا ئەنگوور بوو

من دی ب خواب ئەو ماهتاب دا دل کولاب جوهتێ غوراب
دل شەووشاند خوێ[3] لێ ڕەشاند خوەش هەرشاند تێک هوور بوو

هوورکر جەسەد قەوسێ صەمەد تیر دان کەبەد داد و مەدەد
جەرحان ژ نەو خوون دایە کەو عشقا مە لەو مەشهوور بوو

لەو یەک نەسەق من تێن سەبەق نوورا یەقەق[4] دا دل شەفەق
شیرین لەبێ دێم کەوکەبێ[5] لێ بەندە بێ دەستوور بوو

دلبەر[6] نەظەر دا من سەحەر خەجلیم ژ بەر لێ ئەو قەدەر
زانم گووا ئەو ماهرووا[7] وەک لوئلووا مەنثوور بوو

پاش فورقەتێ زۆر موحبەتێ م ژ طەلعەتێ چووم حەضرەتێ
وەصلا حەبیب من بوو نەصیب مەلعوون ڕەقیب ڕەنجوور بوو

جاما زەلال خەمرا حەلال یارێ شەپال دا من ب حال

---

(١) جام (ئامەد).
(٢) پڕ (ئامەد).
(٣) خوون (پاشا).
(٤) یەفەق (پاشا، یووسفی، عەمەر) نوورا ژ حەق (ئامەد) ب حەق (شۆشی).
(٥) ژ بەر غەبغەبێ وێ کەوکەبێ (ئامەد).
(٦) میران (ئامەد).
(٧) دەردم دەوا بێهن و بووا (ئامەد).

عـــشقا غـــەدار ســـوهتی ســـتار[١] نێـڤ مــە و یــار ســەد ســوور بــوو

شــاهێ جــەڤــین غــەم ژێ ڕەڤــین مــارێ شــەڤــین ئیـساند ئـەڤــین
دەرد وبـــەلا وێـــن چـــوون هـــەلا عــومرەک مــەلا مــەهجــوور[٢] بــوو

پــوڕ مـــن زەجــر دیــتن هــەجــر مــا بــوو ئــەجــر صــوبح و فــەجــر
شـەمعـا مـە هـل بـوو سـەد عـەمـل مننـــەت مـــە دل مـــەســـروور بـــوو

ئحرام مە بـەست ئـەسوەد ب قـەست یار هاتـە مـەست ئـەز چوومـە دەست
جــوهتێ حــەبــەش تیــردان ب وەش حـەججـا مـە خـوەش مـەبـروور بـوو

یـار وەعـدە دا ب لـەعلـێن خـوە دا وەر بـا مــە دا[٣] چــین[٤] پـەردە دا
د ســـپێدەیـــێ چـــووم وەعـــدەیـــێ کـــو ژ بـــادەیـــێ مـــەخمـــوور بـــوو

وێ کـــاکولێ چینـــێن د لـــێ[٥] قـــەلبــێ مـــەلــێ داڤ دانـــە لــێ
داڤـــا دلان نێـــــڤ ســـــونبولان ســـەر ســـۆرگولان مـــەنقـــوور بـــوو

(١) تەشبیهی نار (ئامەد).
(٢) ڕەنجوور (شۆشی) مەنصوور (ئامەد).
(٣) دەریا مە دا (پاشا، عەمەر، یووسفی، کۆڤلی، وەستانی، حەلەب).
(٤) ناڤ (ئامەد).
(٥) چین سونبولێ (ئامەد).

# د دەست دا یەنگییەك

د دەست دا یـەنگییـەک نووبـار مـن دی ئـەو کـەمـان ئـەبـروو
ل بـالا جـەدوەلـەک جـەببـاری تێـدا[١] هـەمقـران ئـەبـروو
کو حەق ئەڤ حەرف و خەط کێشان ل طـالایێ مـە دەروێشان
دو قـەوسـان گۆشـە لـێ بـادان و سـەر پـەیـوەسـتە مـان ئـەبروو
تـە دیـداری تـە ڕەفتـاری تـە ئـەلماسـێن شـەکـەربـاری
ب عەینی ڕێ[٢] ل سەر صادان دو نوون ڕەیحان نومان[٣] ئەبروو
(بحمـد اللـه) ب فیـرووزی ل وەجهـێ دلبـەرێ مـن دی
کـو مـاهێ نـەو نـشان مـن دان ل طـاقێ ئاسـمان ئـەبـروو[٤]
(تعـالی اللـه) نـشان دانـە ب حوسـنێ ئـەڤ نـەسـەق دانـە
ژ نەقش وصەنعەتێ حەق ئەڤ نشان چەشم ئەڤ نشان ئـەبروو[٥]
ژ ڕەعنـا نێرگـزێن شـەهـلا مـەجـالێ هـەمقـران بیـنم
هـەزار ڕەمـز و ئـشاراتن ژ وان قـەوسـێن چـەڤـان ئـەبـروو[٦]

---

(١) لێدا (ژڤنگی ، ئامێدی).
(٢) دەھ (عبدالسلام) ب عەینی نێرە ( حەلەب، وەستانی) ڕەھ (ئامەد).
(٣) وەشان (ئامەد).
(٤) د دانەیا (ئامەد) دا ئەڤ مالکە ب ڤی ڕەنگییە:
(بحمد الله) ب فەیرووزی هلالێ عیدێ نەورووزی
ل وەجهێ دلبەرێ مـن دی ژ طـاقێ ئاسمان ئەبروو
(٥) ژ نەقشێ صونعەتێ صانع ل سەر چەشمان نشان ئەبروو (ئامەد).
(٦) د نێڤێ تەرجمان ئەبروو (ئامەد).

مـەلا دل تێـک تـە پـەیکـانن ژ مـەحبووبـان مـە نیـشانن[1]
کـەمانـدارێن[2] د غـەددارن[3] د بورجـا ئـەسـمەران ئـەبـروو

(١) مەلا دلکول ژ تیرانە ژ مەحبووبان کو کێشانە (ئامەد).
(٢) کەماندارن (کۆڤلی).
(٣) دغەددارین (عەمەر، یووسفی، حەلەب، وەستانی).

# وەی سپێدە ژ بورجێ قەوس

وەی[١] سپێدە ژ بورجێ قەوس ئەبروو[٢] نوماندن ماهێ نەو
خوەش ژ قـەوسێ ئـەبرووان ڤێـرا[٣] كشاندن مـاهێ نـەو
گۆشـەیـێن نوونـان ب سـەر بـادان ژ[٤] قـەوسێ بـێ وەتـەر
مثلی ئـەنگوشـتا نـەبی سـەد سـەر بـەیانـدن مـاهێ نـەو
كـەشـشفی بـەدرا تـەمـام ئـەحـسەن ژ بـالا طـەلعـەتـێ
ژ ئـستوا دا گـەزمـەیـان چـەرخـێ ڕەشـاندن مـاهێ نـەو
وێ ل وەجهـێ ئافتـابێ گـاهێ كفـش[٥] وگـاهێ خـەف[٦]
عـارفێن صـاحب[٧] بـەصـارەت حـەیيرانـدن مـاهێ نـەو
مــل دزانــم دانــە بــەر قــەوســێ هلالــی گۆشــەزەر
لــەو ژ بــالا گۆشــەیــێن نوونــان لڤانــدن مــاهێ نــەو
ئـەز دبێـژم دێ[٨] ل مـن دیـسا جـەگـەر سـەد پـارەكـن[٩]
وێ ب میـزان هـەر دو شـیرازی چـەڤانـدن مـاهێ نـەو

(١) وێ (ئامەد، كۆڤلی).
(٢) ئیرۆ (كۆڤلی).
(٣) خەط لێ (پاشا) یەنگی (كۆڤلی).
(٤) ب سەر دان وێ ژ (ئامەد).
(٥) كەشف (كۆڤلی).
(٦) خەسف (كۆڤلی).
(٧) ئەهلێ (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام).
(٨) وێ (پاشا، یووسفی، عەمەر).
(٩) كر (پاشا).

داخلـی مـەجلـس بـوویی ئیـشەڤ نـشانی لـەو کـو خـەف
جـامێ ڕووحـانی ل ئـەهلـێ دل نـشاندن[1] مـاهێ نـەو

(١) نەشاندن (هەژار) [ ئیسماعیل ].

# هێ د بەر (قالوا: بلێ)یێ

هێ د بـەر (قـالوا: بلـی)یـێ بـەلـکـوو ئـەڤ عالـەم نـەبـوو
چـەرخـێ دەوران دەورێ گـەردوون گونبـەدێ مینـا نـەبـوو
عەرش و کورسی هێژ د مـەخفـی بـوون د کـەنـزا قـودرەتـێ
حوسـنـێ حـەق بـوو د ئـستوائێ لامعـا عـشقـێ هـەبـوو
نــەهتبــوو حــوکمێ صــفاتان ئــەو ژ ذاتــێ (لــم یــزل)
عاشق و مەعشووق یەک بوون شەمع و هەم پەروانە بوو
حوسن و حـوب ذاتـێ قـەدیمن لـێ جودابـوون ئـەو ژ یـەک
لێ نها ئسمێ حودووثێ حکمەت و تەفصیل[1] وە بـوو
یـەک د ذاتـێ سوڕشـرینان بـوو جـەمـال و حوسـن و سـوڕ
یـەک د قـەلبـێ ئـەهلـێ دل نـار و جـەلال و جـەذبـە بـوو
حوسنێ حوب ئانی ظـوهـوورێ عـشقە ئـەصلێ عالـەمـێ
ئەصلێ ئەشیا دا بزانـی وان چ ئـەصـل و مـادده بـوو[2]
عاشـق و مـەعـشووقـێ ئـەلحـەق هـەردو مرئـاتـێ یـەکـن
بوو د عـەینـی[3] جـەمعێدا ئـەصلێ قـەدیم ئاییـنـە بـوو
جـەذبــە و ســەیــرا ســولووکێ بــێ مــەحــەببــەت نــابتن
جەهدەیا بێ عشق و حوب چەندی کو کر بێ فەیدە بـوو

(١) حوکمێ تەفصیلێ (ئامەد).
(٢) ئەڤ مالکە ل نک (عەمەر ، یووسفی ، ئامێدی) نینە ، و (زڤنگی) د ناڤ شەرحێ دا ئینایە.
(٣) لەو د ئەصلێ (زڤنگی، ئامێدی) لەو د عەینێ (ئامەد).

سـالکێن عـشقێ یـەکایـەک حـەوجـە نیـنن ئـەز ببـێم
جامـەیا پیـرێ طـەریقـێ سـەر ژ نـک شـەهزادە بـوو
ڕەنـگ ڕەنـگ ئەهلێ مـەقامـاتێ طـەریقـێ چوونـە سـەیر
هن جەلال و هـن جـەمـال و سـەرمـەیان ئـەڤ بادە بـوو
ئـێ بـری عـەینـی بـەقـایێ بـادەنووشـێ عـشقێ بـوو
ئـێ بـوویی مـەحـوێ فـەنـایێ عاشـقێ بـێ چارە بـوو
ئێک ژ وان پەروانە بـوو سوهت و فـەغانـەک ژێ نـەهات
ئێـک ژ وان تـەشبیهی گـۆیینێ ب ئاهـ و نالـە بـوو
ئـاوڕێن ئـەسـوەد عوبوونـان عـاقلان سـەودا دکـن
گەزمەیا عاشق ڤ دل کـەفتی ژ چەهڤێن شەهلە بـوو
عاشـق و مـەعـشووق دا واصـل ب یـەک بـن بـێ حجـاب
مەحوو بـوو (بالـذات) عاشق لـەو د عـشقێ پـەردەبـوو
لـەو د عـشقێ دا فـەنـابوو دا ببـت بـاقی ب دۆسـت
عاشـقێ فـانی نـەبـوو واصـل حـەتـا بـاقی نـەبـوو[1]
نوقطـە و علـم و سـەوادێ حـەرف و نـەقـشێ عالـەمـێ
سـەر ددن مـەعنایـەکـێ ئـەصـلێ سـەوادێ نوقطـە بـوو
هـەر یـەکـە و دێ یـەک بمینـت ئـەووەل و ئـاخر یـەکـە
(لا جرم) نابـت دو بـن ئـێ دێ بمینـت هـەر هـەبـوو
هـەر چ دەعـوایێ د عـشقێ دا مـەلـێ ثابـت کـری
عەینی دەعوایێ د (نفس الأمر) دیسا شەهدە بـوو[2]

---

(١) عاشقێ صادق نەبوو باقی حەتا فانی نەبوو (ئامەد).
(٢) ئەڤ شعرە ل نک هەژاری نینە [ئیسماعیل تاها شاهین].

# کەس نەدییە سەحەرگەهـ

کـەس نـەدییـە سـەحـەرگـەهـ کـو چ نـازک وەرەسـی تـو
مـە ژ بـەلگـێ گـول و نێرگـزێ سـەرمـەست بـەسـی تـو

زانـــم نـــە تنـــێ کـــو یـــەدێ بـــەیـــضا تـــو ددیـــری
وەر خـوەش کـە شـەهیـدێن خـوە کـو عیـسا نـەفـەسـی تـو

رووحـــی و نـــە جـــسمی ژ جـــەمـــالێ ب چ ئـــسمی
ڕەنگ ڕەنگ دبی[1] کەشف و شوهوودێ چ کەسی تـو؟

ڕۆژی تـــو ل شـــەرقـــی ب جـــەمـــالا خـــوە و[2] بـــەرقـــی
(باللە) نە[3] ژ سەرچەشمەیێ ئەقدەس قەبەسی تو؟!

(باللـــە) ژ چ نـــووری و تـــەجـــەلـــلا ل چ طـــووری؟
گـەهـ گـەهـ ل سـەراپـەردەیـێ جـان مولـتـەمـەسـی تـو

شـــەمـــسا فـــەلـــەکـــی؟ یـــا مـــەلـــەکـــی؟ هێـــژ نـــزانم!
حـووری و پـەری؟ یـا ب خـوە (روح القـدس)ی تـو؟

جانـــا! جـــەرەس و ڕەهبـــەرێ عـــشقا تـــە ئـــەزم قـــەط
ئاگـــەهـــ ب فـــەغـــان و حـــەرەکـــاتێ جـــەرەســـی تـــو!

مـا یـەک نـەفـەسـەک مـن دبـتن بـێ تـو ووجـوودەک؟
دێ بـێ تـە چ بـم؟ هـەم تـو ڕوحـی هـەم نـەفـەسـی تـو!

---

(١) تییە (عەمەر) بوتی (کۆڤلی) تەبی (یووسفی، وەستانی) تبی (عبدالسلام، زڤنگی، حەلەب) ب ڤێ (ئامەد).
(٢) دە (کۆڤلی).
(٣) کو (زڤنگی، ئامێدی).

عـشقا تـه مـەگـەر[1] زێـڕ صـفەت زەر دکـرین، گـۆ: [2]
ئکـسیره ئـەڤینـا مـە ب عـەینـی و مـەسـی تـو
مـن گـۆ: ژ نگـاران تـو گـولی بـەس ب شوکووهـ[3] بـه
زانـم نـه موحـب هـەر نـه کـەس و خـار و خـەسی تـو
وەی[4] حوورسرشـتێ ل مـه خـوەش میـوه تـه[5] بـەرکـر
جـەنناتـه د وەصـلا تـه و ئاتـەش پـەرەسـی تـو
مـن گـۆ: د شـەڤـان شـوبهی نوجوومـان ب طـەوافـین
گـۆ: عـشوه دزانـن ب چ قـەسـت و هـەوەسـی تـو
مـن گـۆ: مـه ب تیغـان[6] قـەدی نـاکن ژ دەرێ تـه
گـۆ: ئـەم ژ نـەبـاتین و ل طـەبعـێ مـەگـەسی تـو
مـن گـۆ: ژ کـەمـەنـدا سـەرێ زولفـا تـه ڤـەڕەستم
پـەروازێ لـەبـێ لـەعلـێ مـه، گـۆ: گـەر ڤـەڕەسی تـو!
یـەک دەم ڤـەنـەهـشتین تـه د هـامونێ فراقـێ
بـێ هـەمـدەمـێ دەردان کـو چ فـەریـادرەسی تـو؟
مـن گـۆ: ژ مـه دل شـوبهی بخـوور خـوەش تـه بکـەر کـر
کـەرکـر! ب دو لـەعلێن خوه شـەکـەر گـۆ: عـەدەسی تـو!!
مـن گـۆ: ل روخـانین نـه کـو کـەج رەو وەکـوو فـەرزیـن

(١) مه گۆ (زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام).
(٢) کو (کۆڤلی، حەلەب، وەستانی) عشقا ته صفەت زێڕی د فرقێ ده حەلاندم (ئامەد).
(٣) بشکڤه (ئامەد).
(٤) وەی (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٥) ب (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٦) پەیغام (یووسفی، عەمەر).

شاهـ گۆتـە مـە: کـش مـات! ل بـازێ[1] فـەرەسـی تـو

مـــن گـــۆ: تـــە دڤـــێ ســـەر ژ رەقیبـــی ببـــڕم ئـــەز

گـــۆ: مـــن دییـــە زانـــم دبـــڕی ژێ مـــەقـــەســـی تـــو

تـا چـەنـد ب خـەف بـادە بنووشـی وە نـەفـەس[2] دا

ئیجـا[3] ب دەف و نـەی وەرە میـرێ عـەسـەسـی[4] تـو

مـن گـۆ: ژ قـەدیـم ئـەم مـەیـێ عـشقا تـە دنووشـین

گـۆ: مـن ژ عوشـاقان نـە تنـێ مـەی پـەڕەسـی تـو[5]

مـــن گـــۆ: د شـــەڤـــان شـــوبهی شـــەمـــالان وە دســـوژین

پـەروانـە صـفەت جـا هـەڕە بـێ صـەوت و حـەسـی تـو

مـن گـۆ: بـەصـەر و قـووەتـێ سـەمعـا مـە تـویی، گـۆ:

زانـــین تـــە ئـــەمـــین ڕووح و موجـــەررەد قـــەفـــەســـی تـــو

مـــن گـــۆ: دل و جـــانێ خـــوە ژ زولفـــا تـــە رەهـــا کـــم

خـــوەش گـــۆ: چ نـــەزانـــی و مـــەلا گـــەربـــرەســـی تـــو[6]

تـە ژ زولفـێ بوتـان صـەفحـە[7] مـەلا ڕەشـترە طـالع

یـارێ تـە سـەحـەر بێـت و بـرەت پـێ نـەحـەسـی تـو[8]

---

(١) شەهـ گۆ مە بکن ماتێ ب بازی (ئامەد).

(٢) نەقش (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی، وەستانی) د قەفەس دا (عبدالسلام).

(٣) ئەی جان (ئامەد).

(٤) نەی سپەسی (پاشا) مەی پەرەسی (یووسفی) نێز بەسی (کۆڤلی) مەی ب بەسی (عەمەر).

(٥) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هەیە.

(٦) ئەڤ مالکە د دانەیا (ئامەد) ب تنێ دا هەیە.

(٧) صحەحەت (کۆڤلی تێ بت) سەختە (ئامەد).

(٨) هـەژار ل وێ بـاوەرییـێ یـە کـو ئـەڤ شعرە نـە یـا جزیرییـە، وبێـنـا شعرا (جانـان ژ جـەمـالا تـە) ژێ دئێـت [ئیسماعیل تاها شاهین].

# قافییا ( ێ )

## نێرگزا مەست و خەرامان[1]

نێرگزا مەست وخەرامان د سەحەرگەهـ کو مەشی
بشکفت صەفەت غونچە ژ چارا ئەرەشی
شمشاد ب مەش سووسن و سونبول ب سەما تێن
ئەی سەروێ خەرامان کو تو جارەک بمەشی
ڕۆم و عەجەمێ گرتییە ئۆغلمە ب صەف صەف
جوهتێ موغولان هاتنە جەنگێ حەبەشی
وەک ذەررە هەرێ سینە ژ مهرا تە شەفەق دا
بوو شوهرەیێ ئافاقێ ب خورشیدێ وەشی
کی دەستە[2] ژ قودرەت وە کشاندی وە ڕەشاندی
قەوسێ دو هلالان ل بەیاضێ ب ڕەشی؟
چەندان[3] تە بوت ولاتێ نشارێ قەدەمینە
ئعجاز مەکە ڤێ کو تو ژ نەسلێ قورەشی[4]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە یا هاتییە تەخمیسکرن ژ لایێ (لاغەر)ی ڤە ، و د دەستنڤیسێن دیوانا جزیری دا یێن کەڤن تەخمیس ژی هەیە.

(٢) کەی دەستێ (ئامەد).

(٣) چەندی (زڤنگی، ئامێدی).

(٤) ئاشکەرایە کو کەسێ جزیری ئەڤ هەلبەستە پێ ڤەهاندی ژ سلسلا قورەیشییانە، ژ وانە یێن د گۆتن عەسلێ مە ژ قورەیشییانە .. ڤێجا چ حوسەینی بن، یان عەبباسی، یان خالدی! وبەلکی ئەڤ چەندە د پاشەڕۆژێ دا سیناهییەکێ بدەتە سەر چیرۆکا ئەڤینداریا جزیری ئەگەر پتر دەلیلێن دیرۆکی پەیدابوون.

ئـەی دل ژ کـەڤـانێ هـەلـەک ئـەختـەرمـە شـەهیـدی
مننـەت کـو تـو ئـەختـەرمـەیـێ قـەوسـێ ب وەشـی
دەربـا جـەگـەرێ بـوو کـو مـە ئـەڤ نالـە ژ دل هـات
مـا ئاهــ و فـەغانـان دکـرت کـەس ژ خـوەشـی؟
وەک توولـە ل پـەی مووچـە[1] ل دۆرێ چـەرخیم ئـەز
چـخ کـر مـە حـەبیبـێ گـۆ: تـو نـاری بقـەشـی!
(اللـە) چ طـەبیعـەت بـەشـەری خـوە نـە مـەلایـی
ڤـێ جـەور و جـەفـایێ تـو پـەیاپـەی دکـەشـی

(١) چووم و (ئامەد).

## بـ حوسنا (أحسن التقويم)

ب حوسنا (أحسن التقـويم) و[1] ظـاهر صـوورەتـێ ذاتـی
نەظـەر دی[2] (علم الأسماء) و[3] باطـن عـەینـی مرئـاتی
د پابووسـا سـەمـەن سـایێ م نێـری بـەژن و بـالایێ
(العلـي أبلـغ الأسـباب، أسـباب الـسموات)
ژ ڤـی تـەقـویمێ ئنسانی نـەظـەر دا[4] سـررێ سـوبحانی
(فهـذا الوجـه مـن أجلـى بـراهين و آيـات)
کو نوورێ عشقێ لامع دت ل طـوورێ قەلبێ[5] جامع دت
د سـەيـرا (بـرزخ الأسـماء، نهايـات بـداياتي)
نـشانێن طـورره طوغرایـان د وەصـفێن زوهـره سـیمایان
(العنـوان التجلـي مـن براعـات العبـارات)
دلـۆ وەر سـەیـرێ بالایـان د گـولزارا سـەمـەن سـایان
(بهـا تهتـز بانـات لنـا مـن مـيس قامـات)
سەمایا جوملە دێم دورِ تێ ب ئعجاز ئـەهلێ سورِ پورِ تێ
(بهـا تـصطف قامـات بعيـدان و نايـات)

(١) ب (ئامەد).
(٢) دا (ئامەد).
(٣) د (بەغدا).
(٤) دی (بەغدا) دە (ئامەد).
(٥) ل قەلبێ طوور (بەغدا).

سـەمـایێ ڕاست و چەپ تینن شـەمـالێن خاصـه هلتینـن
(فیـــا للـــه فـــي میلاتهـــا مـــن عطـــف بانـــات)
ببێـژن[1] غـەمـزە ئـەلماسـێ: ب زمـزم بینـه[2] شـەهکاسـێ
کـو حـەل کت مـەعنـەیێن ئاسـێ (فیـا هیـا لنـا هـات)
د بینـی نـەغمـەیـا چـەنگـێ دەمـا ئاڤێتـە ئاهـەنگـێ
ب قـــانوون وێ دخوونـــت مـــە (لمیعـــاد و میقـــات)
نـەوایـا مـوطرب و نـایێ فـەغـان ئاڤێتـە جـەوزایـێ
(فیـــا هیـــا بکاســـات، ویـــا هیـــا بطاســـات)[3]
ژ ڕەمـــزێن غـــەمـــزە چـالاکێ ب دل دێ بێنـــە ئـــدراکێ
(معـان لـم یـسعها اللفـظ مـن ضـیق العبـارات)
ژ نـازەک نێرگـزا[4] نـازک د سـەهمـێ دی مـە ئعجـازک
(وکـم مـن خـشف غـزلان أهابـت لیـث غابـاتي!)
نـە تـەنهـا پێشبەرێ یـارین ژ ئـەمرێ (کـن) خـەبـەردارین
(ومـــن أهـــواه ســـار فـــي مـــسار کـــل ذرات)
(هـــو الأول، هـــو الآخـــر، هـــو الظـــاهر، هـــو البـــاطن
هـــو المعبـــود والمـــشهود فـــي کـــل الهویـــات)
ژ لاشـەیئـی ژ مـەعـدوومی مـە ناسـی سـرڕێ قـەییـوومی
(سـجودي فـي تـراب المحـو مـن أعلـی المقامـات)
ب حـەق ڕنـدێ خـەرابـاتم ژ دێـرێ ڤـی دەمـی هـاتم
چ هێڤـی هـوون دکـن ئیـرۆ ژ ڤـی ڕنـدێ خـەرابـاتی؟

---

(١) ب بەژنێ (یووسفی، عەمەر) ب شیرین (کۆڤلی).
(٢) بێته (بەغدا، یووسفی، عەمەر) بێنه (کۆڤلی).
(٣) ئەڤ مالکە ل نک (عەمەر، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب) نینە.
(٤) دلبەرا (زڤنگی، ئامێدی) و د شەرحێ دا زڤنگی نێرگز نڤیسییە، ژ نازێن نێرگزا (کۆڤلی).

د عـشقێ شـەیخـێ (ثـاني) مـە ب دل بـەحـرێ مـەعانیمـە
(الــذي حجــر و ذي قلــب شــفاء فــي إشــاراتي)
د ئقلیمــێ ســوخەن میــرم د شــعرێ دا جــەهــانگیرم
(و یعلــو موکــب العــشاق أعلامــي و رایــاتي)
چ خـوەش نـوورەک زەلالـی تـو د قـەلبێ مـن شـەمـالی تـو
(وقلبــي حیــث فیــه الحــب مــصباح بمــشکاة[1])
تـەقاضا وە دکـر حکمـەت کـو چـەرخ و لـەولـەب و بـابن[2]
(هـــو الفعـــال لا تغتـــر بأســـباب و آلات)
ئـەزەل عـەینی ئـەبـەد یـەک ئانـە[3] دەییـوومی وقـەییـوومی
تــەنــەززول تێتــە تــەفــصیلێ (بآنــات و أوقــات)
(تعــالی اللــە) ژ ئحــسانی ب دلــداری ب دلــدانی[4]
مـەلا ئیـرۆ تـە کـر پاشا، ل سـەر چـەهڤێن مـەلـێ هاتی

---

(١) ومشکاة (بەغدا).
(٢) بـایین (پاشا، یووسفی، عـەمـەر) بـابین (عبدالـسلام، حەلـەب، وەسـتانی) تـەقاضی وە دکت حکمـەت کـو چەرخ و لەولەبان با کت (ئامەد).
(٣) ئان د (زڤنگی، ئامێدی) بوو (ئامەد).
(٤) رەها کر ئەم هجرانێ (ئامەد).

# لاتێ حوسنێ

لاتـــێ حوســـنی و شـــەهــێ خووبـــانی
ب خـــوە هـــەم خـــانی و هـــەم خاقـــانی
یووســـــفێ پـــانی تـــو ئیـــرۆ خـــانم
کـــو ب حوســـنا خـــوە نـــەدیـــری پـــانی
ب سـورِ و هـەیبـەت و سـەهمێ خـوە پـەری[١]
ب تـــە شـــێتن[٢] ل بوتـــان ســـولطانی
ب طـــەبلخانـــەیـــێ شـــاهی[٣] وەرە تـــەخـــت
کـــو تـــو ئیـــرۆ شـــەهـــێ کوردســـتانی
کـــاکولێ بـــەردە ب ســـەر خـــال و خـــەطـــان
کـــو موســـەلـــسەل بنومـــت رِەیحـــانی
ئـــسمێ ئـــەعظـــەم مـــە[٤] دڤـــێ چـــل ئـــسمی
ژ دو حـــەرفـــان ب موعـــەممـــا زانـــی
چ بـــەرات بـــوو وە ب ســـەر[٥] دا کـــاکول
چـین ب چـین مـەست ب طـوغرا رِانـی[٦]

---

(١) پورِی (عبدالسلام).
(٢) شین (زڤنگی، ئامێدی) شێنە (ئامەد).
(٣) ب طەبلێ خانی و شاهی (ئامەد).
(٤) تە (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) ب سرِ (عبدالسلام).
(٦) زانی (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی، حەلەب، وەستانی) شانی (ئامەد).

تـە چ حاجـەت ب سـولەیمـانییێ حوسـنێ[1]
خاتـەمـەک لـەعلـە ب[2] گـەوهـەر ئـانی

چ خـەط ئـشکەسـتە موسـەلـسەل یـا رەب
کـو تـە پـێ نـەسـخ کـری دیـوانی

گـەر چ پـورِ خـال و نـشانی ئـەمما
ب[3] نـشانی کـو تـو بـێ نـشانی

ئـەی پـەری حـووری سرشـتێ هـەر چـەنـد
ب بـەشـەر ئـادەمـی و ئنـسانی

سـورێ سـوبحان تـە ژ حوسـنێ دنومـت
(أحـسن اللـە) ژ سـورا سـوبحانی

چ حـەدێ عـەقلـە قیاسـێ تـە کـرت؟!
ئـەڤـە بورهـان کـو تـو بـێ بورهـانی

مـە تـەمـەننـا ژ نـەسیم خـاکێ رەهـێ[4] کـر
پـێ بکـین دیـدە و دل نـوورانی

نـەفـەسـەک بـێ تـە مـە نـایێ (باللـە)
نـە تنـێ رووحـی تـو رووح و جـانی

سـەد هـەزاران ژ تـە پـەیکـان د دلـن
لـێ ل سـەر وێ مـە[5] تنـێ دەرمـانی

---

(١) ب سولەیمانییێ حوسنێ ژێرا (پاشا، کۆڤلی) تویی ئیرۆ ب سولەیمانییێ حوسنێ (یووسفی، عەمەر).
(٢) ل (پاشا، ئیسماعیل، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٣) نە (حەلەب، وەستانی).
(٤) خاکێ تە (ئامەد).
(٥) لێ ل دەردێ مە (ئامەد).

تـــە بـــرینێن مـــە کـــەوانـــدن[1] دیـــسا
ژ نـــوو ئـــاگر تـــە ل داغـــان دانـــی
تــە مــەلا پــوڕ د جــەگــەر گــەزمــەنــە لــەو
وە پــــەریـــــشانی و پــــوڕ ئێــــشانی

(١) کەواند (زڤنگی، ئامێدی).

## ئەێ شەهەنشاهێ موعەظظەم

ئـەی شـەهـەنـشاهێ موعـەظـظـەم حـەق نگـەهـدارێ تـە بـی
سـووورەیـێ (إنـا فتحنـا) دۆر ومـاادارێ[1] تـە بـی
هـەر کنـارێ پێڤـە وەرگێـڕی عنـانێ هممـەتـێ
زوهـرە بـی پـەیکـێ[2] تـە و کـەیـوان رکێبـدارێ تـە بـی
دائمـا مـەنزلگـەهـا سـوورا تـە بـت بورجـا شـەرەف[3]
طـالعێ فـەرخونـدە و بـەختـێ[4] سـەعید یـارێ تـە بـی
سـەبعـەیـێ سـەییـارە و نـەهـ چـەرخـێ سـەرگـەردان بڤـێ
گـەردش و دەورێ عـەجـەب دەر خدمـەت و کـارێ تـە بـی
ماهتابـا دەولـەتـێ یـەک پـەرتـەوەک شـەمعـا تـەبـت
ئافتابـا رەفعـەتـێ بـەرقـەک ژ ئـەنـوارێ تـە بـی
لامعـێ فـەتحـا ئـەزەل بـەرقـێ ژ بـەر تـاجێ تـە دت
کـەوکـەبـا سـەعـدا ئـەبـەد نـەجمـەک ژ سـەییـارێ تـە بـی
بـەرقـێ سـوبحی کـو ئـشراقێ[5] ل سـەد جانـان ددت
ئـەو کـو کـەشـفا دل دکـت ڕەمـزەک ژ ئـەسـرارێ تـە بـی

---

(١) حافظ و یارێ تە بی (ئامەد).
(٢) پەیکێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) ئـەز دویـر نـابینم مـەبـەستا جزیـری ل ڤێـرێ ب بورجا شـەرەف بورجا بـەلـەک بت ، چونکی بورجا بـەلـەک جهنشینا میرێن بۆتان میر شەرەفێ کورێ میر بـەدرێ ئـازیزانی ئاڤاکربوو، ووی ژ سالا (٩٠٤ ک ١٤٩٨ ز) هەتا (٩١٥ ک ١٥٠٩ ز) حوکم کر بوو.. وئاشکەرایە کو وی بەری مرنا خۆ ب نەهـ دەهـ سالـەکان دەست ب ئاڤاکرنا بورجا بەلەک کربـوو. هـەر وەکـی جزیـری دڤێت بێژت: ئـەز دخـوازم شـویرها تـە هـەر دەم ل دۆر بورجا بەلەک بت، وجهێ تە هەر یێ ئاڤا بت!
(٤) تەختێ (پاشا، یووسفی، عەمەر).
(٥) ئەشواقێ (پاشا، کۆڤلی، عەمەر).

رایـەتـا فـەتحـێ ب نـەصـرا (لـم یـزل)[1] مـەنـشوور بـوو
شـەهـسوارێ فـەررێ سـوبحانی عـەلـەمـدارێ تـە بـی
نـەی تنـێ تـەبریـز و کوردسـتان ل بـەر حـوکمێ تـەبـن
سـەد وەکـی شـاهێ خوراسـانێ د فـەروارێ تـە بـی
گـەر چ دەر ئقلیمـێ رابـع هـاتی تـەختـێ سـەلطـەنـەت
پادشـاهێ هـەفـت ئقلیمـان سـەلامکـارێ تـە بـی
چیمـەنـا سـولطانییێ یـەک لالـەیـەک بـاغێ تـەبـت
گولـشەنـا خاقـانییێ خـارەک ژ گـولزارێ تـە بـی
ئێ ژ ئەمرێ تەی موکەررەم سەرکەشی کت شوبهی شەمع
بـەر سـەرێ[2] تیغـێ تـە و مـەقتـوولێ مووکـارێ تـە بی
شـاهباز ئـەر چـەنـد پـەروازێ ب بـالا بێـت و ڕەت
دێ د نێـڤ تـۆڕا تـە بێـت و صـەیـدێ شـونقارێ تـە بـی
شـاهێ پـوڕ هـەیبـەت ددێـرت لـێ ب سـەهمـێ زێـدەها[3]
ساعەتا غـەفلـەت خویا بـی کـووز[4] د بـن بـارێ تـە بی
هـەر سـەرێ دەولـەت هـەبت دێ هـەر د نێـڤ بـەندا تـە بت
هـەر کـەسـێ عاقـل بـتن دێ هـەر د چووکـارێ[5] تـە بـی
ئـێ دڤـێ ئـازادە بـت دێ چـەهڤـەنێـر لوطـفـا تـە بـت
هـەر چ ئـستغنا د دل بـەر مننـەت و پـارێ[6] تـە بـی

(١) تە کو هەر (یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب) تە هەر (ئامەد).
(٢) سەر ل بەر (ئامەد).
(٣) زێدەیی (یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) دیدەئێ (عبدالسلام، وەستانی، حەلەب) زێدەبی (ئامەد).
(٤) کو (یووسفی، کۆڤلی) کۆر (پاشا، ئامەد، عەمەر، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).
(٥) رجوکارێ (ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، کۆڤلی) دجوکارێ (عەمەر).
(٦) بارێ (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).

هـەر کـەسـێ قـەسـتەک د دل دێ قـەسـتێ دەرگـاهێ تـە کـت
ئـێ د خـاطـر ئـەرجـوو کـت دێ هـەر ڕەجاکـارێ تـە بـی
ئـێ نـە دەولـەتخـواهێ حـەضـرەت بـت ژ نیڤـا جـان و دل
شـوبهەتـی ئـەهلـێ شـەقـا بـەر قـەهـر و[1] ئـازارێ تـە بـی
مە[2] ب عەیش و نووش و شاهی ئەو فدا[3] عومرێ تـەبت
چـەنـدەکـێ سـالـەک موجـەددەد بێـت و بـێ زارێ تـە بـی
هـەر کـەسـێ نـە ژ جـان دوعـاگۆ و ثـەنـاخوانێ تـە بـت
گرتییـێ قـەیـدا تـە و ئامـانجێ نووبـارێ تـە بـی
مـەدرەکـێ علمـێ ضـەمیـری شـەممـەیـەک وەصـفا تـە هـات
وەر نـە کـی عـالـم ب شـەئنـێ[4] قـەدر و مقـدارێ تـە بـی
قـەسـت و داخـوازا مـەلـێ دائـم ژ جـان و دل ئـەڤـە
هـەر د بـەنـدا خدمـەتـێ پێـشدەسـتێ دیـدارا تـە بـی

(١) شەقاوەت قەهرێ (ئامەد).
(٢) ما (کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام) هەر (ئامەد).
(٣) فەدی (پاشا) قەدەر (ئامەد، کۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی).
(٤) نشان (پاشا، عەمەر، کۆڤلی) نێ چ مومکن هەر ب شەئن و (ئامەد).

# خانێ خانان

خانێ خانان[1] لامعێ نەجما تە هەر پورِ نـوور[2] بی
کـەشـتییا بـەختـێ تـە (أز) بـایێ موخـالف دوور بـی
کەوکەبا سـەعـدا شـەرەف طـالع د نێڤ بورجا تـە بت
دا تنێ ژ چەرخێ بەلا شوبهی مـەهـێ مـەنظـوور بی
ئەنجومێ چەرخێ موحەددەب هەر ژ ذاتێ تەی شـەریف
کـەسبێ ئـەنـواری بکـن حـەتتـا کـو نـەفخـا صـوور بـی
لــەو زیــارەت ئاســتانێ تێــت شــەمــسا دەولــەتــێ
دا[3] سـەحـەرگاهـان ژ دیـدارا شـەریـف پـورِ نـوور بـی
ئـەختـەرا تـە ژ پـەردەیا غـەیبـێ ئـەگـەر بێـتن ظـوهـوور
دێ بـتن (نـصف النهـار)ە وەر شـەبـێ دەیجـوور بـی
(آیـة الکرسـي) و (أنعـام) هـەیکـەلا تۆخـا تـەبـن
بێ نهایـەت پورِ مـوراد و بـێ عـەدەد مـەنـصوور بـی
هــەر کنــارێ وەرگــەڕینــی پێڤــە عــەزم وهممــەتــێ
ڕایـەتـا فـەتحێ ب نـەصرا (لـم یـزل) مـەنـشوور بـی
خـەیمـەتـا نـوورا عنایـەت ظللێ مـەمـدوودێ تـە بـت
سوورەیێ (أم الکتاب) ماداریێ حەضرەت سوور بی

(١) جانێ جانان (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٢) حەرفا (ر) دهەمی قافییێن ڤێ هەلبەستێ دا دڤێت بێتە کێشان، دا کێش لەنگ نەبت.
(٣) تا (ئیسماعیل، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).

پاشی نـەوشـیروان دبـێم دێ[1] حـاکمێ عـادل تـوبی[2]
مثلی حاتەم دێ ب دانێ[3] دەر جەهان مەشهوور بی
مـا جزیـرێ شـوبهی دارێ تـەختـێ هـەفـت ئقلـیم بـت
هەم[4] ب حوکم و سەلطـەنەت ئەسکەندەر و فەغفـوور بی
مثلی جـەم جامـا زەریـن خـالی نـەبـت تـە ژ بـادەیـێ
دا ژ خـەمـرا شـادمانی دائمـەن مـەخمـوور بـی
ما د باغێ عەیش ونووشێ هەر ب ساز و ئەرغەوان
کـامران و کـام بـەخش و دلخـوەش و مـەسروور بی
چـەنـدەکی شیرین پسەر[5] دەربـەنـدێ دیوانـا تـە بـن
بـەنـدێ شـاپوورێ تـە بـن تـا خوسرەو و شـاپوور بی
هندەکی ڕۆژ و شـەڤـن تێـک عید و (لیـل القدر) بـن
جام مەدام پوڕ بادە بت لێ نـە ژ مـەیا ئـەنگوور بی
شـوبهەتـی (روح القـدس) عـەردێ تـو پـێ لـێ داینـی
سـەبزە و ڕەیحـان و نـەسرین و گـولێ مـەنقـوور بی
هەر دەرێ نەعلێ فـەرەس شوبهەت بوراقی ڤـێ کـەڤت
چەشمەیێ حەیوان ژ ئـەو عـەردێ موبـارەک فـوور بی
ما تە عومرێ خضر و نووح وەمولکێ ذولقەرنـەین بـتن
گونبەدا چەرخێ مولەممەع هەر ب تـە مـەعموور بی
خاصـێ تـەشـریفێ تـە بـن دەریـا و دەربـەنـدێ عـەجـەم

---

(١) تێ هەیە د بنیات دە (نێ) بت هاتبتە تەصحیف کرن [ئیسماعیل تاها شاهین].
(٢) توبی (حەلەب).
(٣) بزانی (پاشا کۆڤلی) دا ب دانێ (ئیسماعیل، ئامەد، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).
(٤) ما (پاشا، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٥) هەبن (ئامەد).

دا خەلاتێن هەر سەحەر سەد زەرکەش و مەخموور بی
گەر چ دەر دیوانێ حەضرەت پورِ حەقیرین شوبهی موور
چەشمێ تە چەشمێ سولەیمانی ب حالێ موور بی
ئێ نە وەک گۆ بێ سەر وپا بێت د بەندا خدمەتێ
ما د چەوگانا تە هەر پەرکەندە ومەقهووربی
ما لسانێ من دوعاگوویێ ل دەر حەق وەصفێ خان
مەظهەرێ سررا کەلامی وەک درەختا طوور بی
هەر د مەدحێ تە وثەنائێ سینە و قەلبێ مەلێ
بێ تەفاوت قولزوما پورِ لوئلوئێ مەنثوور بی
ژ ئاستانێ دەولەتێ غائب نەبی جارەک مەلا
دا ژ فەرمانێ موکەررەم دەم ب دەم مەئموور بی

# یا رامێ قلبێ

[ ب زمانێ عەرەبی]

یـا رامــي قلبــي بــسهام اللأهــات[1]     هيهـات نجـاتي
مـا زال فــداء لــک روحــي ولاحيــاتي     من قبـل مماتي

نمقـت إلـى بابـک يـا قـره عينـي     بالــــدمع كتابــــا[2]
أشهدت على الوجد مدادي و دواتي     ســـل مـــن عبراتـــي
مـــذ زينـــک الـــدهر بأزهـــار جمـــال     يـا روضـة حسن
أخجلــت طــل الــورد بحــب الوجنــات     بين العرمات[3]

جلباب دجی صدغک إلهاب فؤادي     يحكيـــــک عيانـــــا
نيران جحيمي حجبت بالـشهوات[4]     مـــن كـــل جهـــات
في ظلمه أصداغک مذ أصبح مسكا[5]     يـا ظبـي حـريم
قد أحرق فـي الـصين[6] قلـوب الظبيـات     نــار الحــسرات

(١) اللأهات، جمع لأهه وهي اللحاظه .. وەکی دفەرۆزا دەستنڤیسا (عەمەر) دا هاتی ، و ژ بەر کو (ژڤنگی) مەعنا وێ نەزانییە کرییە (اللحظات).
(٢) کتابي (یووسفی، عەمەر).
(٣) بجبل الوجنات بين العزماتي (پاشا) العزمات (عبدالسلام، حەلەب، وەستانی) الغرمات (ئیسماعیل).
(٤) بالشبهات (کۆڤلی).
(٥) مسک (ژڤنگی، ئامێدی).
(٦) الطين (پاشا، عەمەر، یووسفی).

كم تحرق أحشاي و في فيک زلال و الـــــشارب منـــــه
يحكـي خـضرا مـورده مـاء حيـاة لا فـــــي الظلمــــات
مــن أحمــد فــي ليلــه أصــداغ مــلاح لاحــت كلمــات
مــن يــسمعها فــاح بمــسک الــدعوات جيــب الغــدوات

# قافییا ( ێ )

## ژ مابەینا دو ئەبروویان

ژ مابـەینـا دو ئـەبروویـان دبیـنم قابـە قـەوسـەینـێ
(تعـالی اللـه) بنـێ ڕەمـزێ چ ڕەنـگ ئاڤێهتـە مابـەینـێ
ژ قـەوسـەینـان دبـارن تیـر د جـەنگـێ دا موهـەییانـە
صـولحچینە بنـێ ئیـرۆ خـەطـێ نـازک ل مابـەینـێ[1]
بنـێ نـوونێن ل سـەر صـادان کـو کاتـب گۆشـە لـێ بـادان
سـەراسـەر قـاف تـا قافـە رومـووزا (حکمـە العـین)ێ
بـەقـا نیـنن ل بـۆ تـشتی حـەتـا کـەنگـێ بکـین پشتی
د عـشقا وان پـەریڕوویـان وەرن دونیـایێ دا دەینـێ[2]
ب بـەرقـا شـیر و ئـەلماسـان ب تیرێـژێن د شـەهکاسـان
سـەراسـەر ئـەهلـێ دونیـایێ دسـۆژی (طـرفـة العـین)ێ
مەلا (باللە) د ڤی دەوری ب ڤی ڕەنگی ب ڤی طـەوری
نشان دا وەک نـشانی کـەس دەرانـین[3] دوڕ ژ بـەحرەینـێ

---

(١) ئەڤ مالکە ب تنێ د ڤان دانەیان دا هەیە: (عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).
(٢) کو عشقا ڤان پەریروویان دبن دنیا و هەم دینێ (ئامەد).
(٣) نەدی من کەس ب مثلی تە دەرانی (ئامەد).

# هێڤێ و تەوقە دکم

هێڤــی و تــەوقــە دکــم ئــەز ژ خودانــا حــەشــەمــێ
وێ نگــار و صــەنــەم وپادشــەهــ و موحتــەشــەمــێ
جارنان[1] بەندەیێ دل سوهتییێ مەهجوور ڤە ڤنێر[2]
ب لـەبێ لـەعلێ شـەکـەربـار و ژ عـەینی کـەرەمـێ
پرسـیارێ[3] ل مــە جـارەک بکـە شـیرین دەهـەنـێ[4]
کـو پـەریهتینـە فراقـا تـە ل سـەر دەرد و غـەمـێ
ئـەر نـە هودهـود ژ سـەبـا بێـت و وەکـی بـایێ صـەبـا
دێ ژ هر کوو بگەهت دەستی ڤ پـەیکـێ[5] حـەرەمـێ
پرسیارێ ل مـە بت وەر نـە خـوە مـەهجـووری غـەریب
دێ ل کێ عەرض بکم ڤێ غـەم و دەرد و ئـەلـەمـێ؟
(حاش للە) کو بکم ئەشکەرە ڤان غوصصە و دەردان
وەر بـسوژم ژ غـەمـێ عـشقێ تـو سـەر تـا قـەدەمـێ
مـە ب صـەحرایـێ وصـالا خـوە دەریـن تـو ژ خـودێ ڕا
وەر نـە وەقتـە کـو ببین غـەرقـەیـێ بـەحـرا عـەدەمـێ
ژ گولـستانێ جـەمـالا تــە گولـەک بێتــە ظـوهــوورێ
ژ دنـــێ دێ بچـــتن نـــاڤێ بهـــشتا ئـــرەمـــێ

---

(١) جارەکێ (کۆڤلی).
(٢) مەهجوور ڤەنێر (ئیسماعیل) مەهجوور ڤەخوین (ئامەد).
(٣) پورسێ یارێ (یووسفی).
(٤) دەهەنا من (کۆڤلی تێ نەبت).
(٥) دێ کو هەر وێ بگەهت دەستی ڤ پەیکێ (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).

شەرحێ حالێ غـەمێ عـشقا تـە ژ کـوو تێتـە نڤیـسین
مـەدحێ ئـەوصافێ جـەمالا تـە کوجا تـێ ڕەقـەمێ؟
وی مــەجـالێ کــو جــەمـالا خــوە تــەجـەلــلا دکـری
لازمـە سـەجـدە ببـین بـەر تـە د وێ گـاڤ و دەمـێ!
سەجدە بین[١] بەر تە ڕەوایە د حەمی مەذهەب و دینان
کـی دبـت موشـرک و کـافر ژ وی شـیرینە فـەمـێ!
گەر ببم بەر تە سوجوودێ د دەما کەشف و شوهوودێ
مــە ل دل دێ بــدرت پــەرتــەوێ نــوورا قــدەمــێ
(قبلتــي وجهــك فـــي كـــل صـــباح ومـــساء)
ب دو ئـەبروویـێ تـە جانـان دخـورم ئـەز قـەسـەمـێ
موویـەکـێ ئـەز ژ تـە نـادم ب دوسـەد زیـن و شـرینان
چ دبت گەر تو حسێب کی مە ب فـەرهاد و مـەمێ
تـە فـەڕەنـگ و عـەرەبـستان و مـەجـەر تێـک ستاندن
جەلـەوێ خوەش ڤـەگـەڕیـن هاتییـە نـەوبا عـەجـەمێ
ما[٢] ژ دیوانێ سەعادەت سەکری[٣] شوبهی مـەلایـی
تــو ب نــاڤێ م گــەدایــی بکــشینە[٤] قــەلــەمــێ

(١) بن (پاشا، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی).
(٢) مە (پاشا، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر، وەستانی، حەلەب).
(٣) سەیرکر (وەستانی، حەلەب).
(٤) بکشینی (ئیسماعیل، عبدالسلام، وەستانی، حەلەب).

# غەما عشقێ پەرهتم ئەز

غەما عشقێ پەرهتم[1] ئەز　　حەبیبا غەم رەڤین کانێ؟
سەراسەر تێک بهێتم[2] ئەز　　ژ دەردێ فەرق و هجرانێ

فراقا دلبەرا رِندە　　بهێتم[3] هەر وەکی فندە
موسلمانەک د رێ من دە　　خەبەر بت بالی سولطانێ

خەبەر بت بال شەکەرخایێ　　شەپال و خووب و زیبایێ
کو میرە بەلکی بیر نایێ　　ئەسیرەک وێ د زندانێ

ئەسیرم لەرزە و تاڤێ　　م طاقەت ڤێ نە پەروا ڤێ
د حەبسا وێ قە من ناڤێ　　بکم فەریاد و ئەفغانێ

م ناڤێ ئەز ب فەریاد کم　　ل ظولما دلبەرێ داد کم
صەحی دێ شوبهی فەرهاد کم　　بدم رووحێ ژ کۆڤانێ

ژ کۆڤانا تە شیرینێ　　دنالم شوبهی گۆیینێ
درێژم هێسترێن خوینێ　　وەکی طاقێ د بارانێ

وەکی بەرقا بوهاری ئەز　　ژ دەست چەشمێن خوماری ئەز
د کم فەریاد و زاری ئەز　　مەگەر جارەک کی ئحسانێ

---

(١) پەریتم (بەغدا).
(٢) بوهیتم (بەغدا).
(٣) بوهیتم (بەغدا).

تو پورِ ئحسان خوەی[1] ڕەحمی ل دەروێشان ئا[2] بێ خەشمی
چ بیتن گەر ب نێڤ چەشمی نەظەرکی تو ل ئاستانێ

ل من پورسەک ب[3] دلداری دبت[4] هەمتایێ دیداری
ڤەوەستایم د فەرواری ل عەبدێ خوە کە فەرمانێ

د فەرمانێ ڤەوەستایم د بەندا خدمەتێ دایم[5]
وەکی گۆی بێ سەر و پایم هەمان لێ دی تو چەوگانێ

ل بەر چەوگان و کاشوویان ژ دەربا تورک و هندوویان
دبازم هەر وەکی گۆیان دەما ئەو تێنە[6] مەیدانێ

دەما ئەو تێن ب بازی تێن د گەل قەوسێن شیرازی تێن
چ مووکارن د تازی تێن ب دەعوا تێنە لێکدانێ

ب دەعوا تێن مە یەغما کن د عامێ شوور و غەوغا کن
سەواش و فتنەیان ڕاکن ب شیر ئەو تێنە تالانێ[7]

دو تالانچی د[8] مەشهوور تێ ژ مەعدەن عەینی کافوور تێ
د تێکل ظولمەت ونوور تێ مە کوفری دی د ئیمانێ

---

(١) خوەش (پاشا، ئیسماعیل، کۆڤلی) ژ بەر ئحسان و خوەش (بەغدا).
(٢) تو (یووسفی) یە (کۆڤلی).
(٣) د (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی) ژ (بەغدا، ئامەد).
(٤) نە بت (پاشا) دبت هەمپایێ (ئیسماعیل، ئامەد).
(٥) مایم (بەغدا).
(٦) تێتە (ئامەد).
(٧) شەریکن ئەو د تالانێ (بەغدا).
(٨) د تالان چ (بەغدا).

مە کوفری دی د ئسلام بێ[1] ژ شەرقێ ظولمەت و شام بێ[2]
ژ زولفان عەنبەرێ خام بێ[3] کنارێ خال و نیشانێ

دو زولفێ عەنبەرئەفشانن دو لەعلێ شەککەرستانن
دو چەشمێ سحرێ فەتتانن دلێ من وان خەدەنگ دانێ[4]

دلێ من وان خەدەنگ لێدا د بورجا رووز و شەب تێدا
ل سەلوا مار لڤین پێدا ب مەستی هاتە سەیرانێ

ل سەلوێ مار ب لەف[5] هاتن د بورجا تیپ[6] ب صەف هاتن
ژ باطن تیر ب خەف هاتن ژ بەر بەندا گریبانێ

ژ بەر بەندا نقابا وێ ل بەر فەتلا عصابا وێ
جەمالا ماهتابا وێ مە بەدرەک دی د سەیوانێ

هەییڤ بوو ئەو د ظولماتێ دخوم سووندێ ب ئایاتێ
کو نوورێ دا سەماواتێ ئەسەد هات ڕاستی میزانێ

قەمەر[7] هات ڕاستی پەروینان ژ بۆ خەملێ شەمال ئینان
مە نێرگز دین د نەسرینان د نێڤ باغێ گولستانێ

---

(١) د ئیسلامێ (بەغدا) و ئیسلامی (ئامەد).
(٢) ظولمەتا شامێ (بەغدا).
(٣) عەنبەرین خامێ (بەغدا).
(٤) ئەڤ چارینە ل نک (یووسفی) ب ڤی ڕەنگییە: دو زولفێ زەر تە لێدانێ دو لەعلێ شوبهی مەرجانێ
طلسماتەک تە لێدانێ وەرە جانم تو سولطانی
(٥) ب کەیف (بەغدا).
(٦) تیر (کۆڤلی).
(٧) ئەسەد (بەغدا).

د بــاغێ مــن مــەدام دل تــێ
جنـەسـری و سووســن و گــول تــێ
بـەنـەفـش و طـەرح و سـونبول تـێ
چــەڤــین ســەر شــوبهی رەیحــانێ

ل دێمـــی ســـونبولان ســـەر دان
چــەڤــین ســەر سووســن و وەردان
ل مــاهێ عــەقــرەبــان گــەڕ دان
د ســـەردا[1] ئـــابێ حـــەیـــوانێ

ژ عــشقێ لــەو مــەلا خــەســتە
ژ حــەرفــا[2] بــادەیــێ مــەســتە
ژ هـــووش و عـــاقلی ڕەســـتە
ل دەر[3] گۆشـــێن د مـــەیخـــانێ

(١) دو سەر دان (ئامەد) ڤ سەردان (بەغدا).
(٢) صرفا (عبدالسلام، وەستانی).
(٣) دەور (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی) دۆر (بەغدا، ئامەد، عبدالسلام، وەستانی).

# ئەێ نەسيمێ سەحەرێ

ئـەی نـەسـيمێ سـەحـەرێ مـا د مـەجـالا صـوبەهـێ
سـەد سـەلامـان بگـەهينـی[1] ژ مـە وێ پادشـەهـێ
عەرعـەرا قامـەت ئـەلـف نـەيشـەككـەرا شۆخ و شـەپال
نازكـا سـيمين تـەن و خوسـرەو و زەررين كولـەهـێ
د بـەری دا[2] تـو ببووسـی ب دوسـەد زاری و لوطـف
ئاســتان و دەر و ديــوار و شــوباكێن قــەلــەهــێ
نامـەيـا جـەور و جـەفـا و ئـەلـەم و دەرد و غـەمـان
دی ب دەستێ زەرييێ[3] موحتەشـەمێ سـەرو سەهێ
بـەلكـوو دلبـەر ژ ڕوويـێ عـادلی و مـەرحـەمـەتـێ
ڕەحمــەكـێ كـت ب فــەقيـران و بپرسـت گلـەهـێ
مـا ژ بـەر ضـەرب و فراقـا تـە سوكوونەک مـە هـەيـە؟
جەرگ و دل هەردو ب نالينە وەكی چەنگ و ژەهێ
حـەق دزانـت[4] د شـەڤـان شـوبهەتـی ئـاڤێن د ڕەوان
مــە ب دل زاری و كالينــە حــەتـا صــوبحگەهــێ
(حجــر أســود) بــدرت دەســت زيــارەت بكــرم
نـەذر مـن بـت بگـرم خـواس طـەريقـا مـەكـەهـێ

---

(١) بگەهينە (ئامەد).
(٢) دلبەری (ئيسماعيل) د بەرێ دا (ئامەد).
(٣) صەنەم و (پاشا) دە ب دەست وێ صەنەمێ (كۆڤلی).
(٤) كو (پاشا، كۆڤلی، عەمەر).

دیـن ئـەگـەر بێتـە بـەهـا جـان ددرم لـێ ئـەمما[1]
مـە[2] هـەزار جـانێ عـەزیـزی دهلێـتن د بـەهـێ
پـەردەیـا خێلـی و چـارێ تـو ژ سـەر دێمـی هلـین
دا ژ شەوقا تە ب خەف بت شەفەقا مهر و مەهێ
قـەط دبت وەک تـە شـەپالێ نـە د شام ونـە د شـەرق
کێ نشان دا د جەهان مثلی تـە خوندکار و شەهێ؟
عالـەمـەک شـەهـدەییـا حوسـن و جـەمـالا تـە ددت
تـو زولـەیخایـا[3] زەمـانی و چ حاجـەت مـەدەهـێ
حـەق نگـەهـدارێ تـەبـت پادشـەهـا (سـەرو قـەدان
ب کنـارێ مـە فـەقیـران بکـە جـارەک نگـەهـێ
خـووبی و دلبـەری و نـاز وتـەلـەطـوف ب تـە شێن
خوســرەوا پادشــەهــانی وە خودانــا جــەبــەهــێ
ژ ئـەزەل حـەق ب مـەلـێ دایـە ژ عـشقێ قـەدەحـەک
تا ئەبەد مـەست و خەرابین ژ مـەیا وێ قـەدەهێ[4]

(١) لێ کو ئەما (ئامەد).
(٢) ما (عبدالسلام) سەد هەزار (ئیسماعیل).
(٣) زولەیخایی (کۆڤلی تێ نە بت) زولەیخا د زەمانی (ئامەد).
(٤) ل نک (زڤنگی) پێشخستن وپاشخستن د مالکێن ڤێ هەلبەستێ دا هەیە.

# ئەی نەسیمێ صبەهێ

ئـەی نـەسـیمێ صـبەهـێ مـا د مـەجـالا سـەحـەرێ
سـەد سـەلامـان بگـەهینـی[1] ژ مـە وێ لـەب شـەکـەرێ
نێرگـزا نـازک و تـەڕ نـەیـشەکـەرا مـەسـت و خومـار
دێـم دوڕ و لـەعـل لـەب و موحتـەشـەم و موعتـەبـەرێ
ئاســتانی و شــوباک و کولــەک و پــەنجــەرەیــان
دا ب مــسکینی و زاری تــو ببووســی د بــەرێ
ئـەز ب وێ قامـەت و بـەژنـێ ل تـە سـوندێ دخـورم
بـەسـکە ئـەی پادشـەهـا مـن ل ئـەسـیران غـەدەرێ
تـۆزەکـێ بـین ب خـوە ڕا تـا بکـرین کـوحلێ بـەصـەر
ل طــەریقــا قــەدەمــا دلبــەرێ وێ ڕەهگــوذەرێ
دێمـێ بـەدر و ئـەنییـی[2] زولـف ل سـەر بوونـە هـەلـەک
ئـەرقـەمـان حـەلقـە و گـەڕ دانـە ل دەورا قـەمـەرێ
نـە بووینـە و نـە دبـن وەک تـە شـەپـالێ د جـەهـان
کـێ دیـین[3] مثلی تـە سیمین تـەن وزەررین کـەمـەرێ
ژ بـەر ئـاهێن مـە دنـێ[4] ئـاگر و دوود بـت[5] نـە عـەجـەب
مـە د دل دا هـەیـە نـارەک کـو دسـۆژت سـەقـەرێ!

---

(١) بگەهینە (ئامەد).
(٢) ئایینە (یووسفی) دێمێ دوڕ وئانی زولف (دەستنڤیسا دیوانا لجەیی).
(٣) کەی دبن (ئامەد).
(٤) مە د دەڤ (دەستنڤیسا دیوانا لجەیی).
(٥) پێت (یووسفی).

دا ببینـی صـەنـەمـا مـن تـو[۱] بگـین خـوە بـدە خـەت[۲]
بکـە تـەلخیـصێ جـەوابـێ مـە ژ ڤـێ موختـەصـەرێ[۳]
قـەدەرەک شـەفقـە ژ لوطفـا تـە تـەمـەننـا دکـرین
دا مـە مـەحـرووم نـەدیـری تـو ژ لوطـف و نـەظـەرێ
مـا ب زەهـرێ شـەکـەری دۆسـت بخوونـت جـارەکـێ
عـەرضـحالا کـو نڤیـسی مـە ب خوونـا جـەگـەرێ
لـەو کـو پـوڕ شـەفقـە ددیـرت کـەرەم و لـوطـف و کـەمـال
ئاه ژ دەست رەمز و سوڕێن وێ دوڕ و گەوهەر خەبەرێ
ب خـودێ قـەط تـە د دل دا ژ خـودێ تـرس نـەهـن
دکـری ظـولم و جـەفـایێ تـو ل مـن ڤـێ قـەدەرێ
بـسک و گیـسوو ژ حـەریـرن قـەصـەبـن طـوررە و زولـف
تـە[٤] ژ کـافوورە بـەدەن، خـال ژ مـسکێ تـەتـەرێ
پاشـی وان گـەزمـەیـێ چـەهڤـێن تـە مـەلا پـێ کوشـتی[٥]
ما خەدەنگ دێ بکرن[٦] قـەط ل مـە ئێدی ئـەثـەرێ؟![٧]

---

(۱) نە ب کین خوەندییە (پاشا) تە (ئامێدی).
(۲) خەندەیە خەط (کۆڤلی) خوە نە دە نەخت (یووسفی) خوە بدە بەخت (عەمەر، لجەیی) نە بکین خوەندیە قەط (ئامەد).
(۳) (التلخیص) ناڤێ کتێبەکا (الخطیب الدشتي)یە ل سەر (مختصر المطول) یا (التفتزاني).
(٤) نە (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) مەلا پێ کو دکوشت (ئامەد).
(٦) ما خەدەنگن د کرن (پاشا، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی) ما خەدەنگێن (یووسفی).
(۷) زڤنگی مالکێن ڤێ شعرێ پێش وپاش کرینە. [ هەژار ل وێ باوەرییێ یە کو ئەڤ شعرە نە یا جزیرییە. ئیسماعیل تاها شاهین].

# ئەێ شاهدێ قودسێ

ئـەی شـاهدێ قودسـی ڤـەکـە بـەنـدێ ژ نقـابێ
تـا چـەنـدی وە سـەرگـەشـتە بمینـین د حجـابێ
بـسکێن ژ حـەریـری تـو ژ نـوو مـاوەرێ لێکـە
زولفـێن ژ عـەبیـری شـەکـە بـاڤێ خـەم و تـابێ
قشتێن د خوە چین چین بدە بەر مسک و زەبادێ
تـایێن د عـصابێ بـڕەشـینە[(١)] ب گـولابێ
هەر یەک ب هەزار ڕەنگ ل بەژنا تە سەما تێن
خـەمـری و لـەف و شـەتـری و تـایێن د عـصابێ
مـن جـان یـەدێ بـەیـضایە ژ عیـسا چ خـەبـەر دم؟
مـن ئاتـەشـێ مووسـا دییـە گولنـارێ[(٢)] شـەرابـێ
مننـەت کـو ژ بـەختـێ خـوە و طـالع ب نـەصـیبم
حوسـنا تـەیـە ئیـرۆ ژ مـە ڕا چوویـە نـصابێ
عـشقا مـە ژ بـەر مـەوج و عـەجـاجێ بوویـە دەریـا
دێ زیـر و زەبـەر کـت مـە ب دەست هندوو غـورابێ
نـەهـ چـەرخـێ سـپهرێ ژ هـەوایـا تـە و مهـرێ
سەرگەشتەنە ئەو تێک ڤ مە ڕا شوبهی حەبابێ

(١) بڕەشینن (کۆڤلی تێ نە بت) بڕەشینینی (ئامەد).
(٢) گەل نارێ (عبدالسلام) نێڤ جامێ (ئامەد).

وەک بـا دلـەزینـی تـو کومـەیـدی دبـەزینـی

عـومرێ مـە عـەزیـزێ! ب خـودێ بـەسـکە شـتابێ

یا پێ ب زیارەت ب مە دە، یا سەرێ ئەنگوشت[1]

دەسـتێ خـوە مـە ئاڤێتییـە بـێ چـارە رکـابێ

مـن رێ ژ سـەرابـێ[2] ب شـەرابـێ بـر و مـونکر

حـەتتـا ب ئـەبـەد تـشنەجـەگـەر مـا د سـەرابـێ

سـەرپـووش و قبابـا مـەیـە تـەسـبیح و موصـەلـلا

وەر دا بـدرینین ل خـوە ڤـێ پـەردە قبـابێ[3]

(للـە) وەرە سـاقی ب دو جامـان مـە جـوان کـە

مـوطرب ب دەفـێ را بـدە سێگاهـ و شـەبـابێ

وەر گوهـ بـدە نـایێ کـو شـرین قـەد د سـەمـایێ

پـور حـەلکرنـە مـەسئەلـە ڤـی فـەصلێ[4] خطـابێ

جاما نـە شـەکـەرلـەب ب مـە دت عـەینـی حـەرامـە

فـەتـوا وە نوما حاشـییەیـا شـەرحـا لوبـابێ[5]

مـوفتی مـە نـەی و نایـە و نـەی قـەولـێ قـەدیمـە

بـاوەر تـە نـەهـن گوهـ بـدە بـەر چـەنـگ و رەبـابێ

نـەردا مـە چ بـازی بنـومیتن مـە ژ سـازێ[6]

---

(١) شیری (وەستانی).

(٢) شەرابێ ب سەرابێ (بەغدا) سرابێ (عبدالسلام).

(٣) پەردە ونقابێ (ئامەد، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی، حەلەب، وەستانی) پەردە نقابێ (عبدالسلام).

(٤) فەصل و (بەغدا، ئامێدی، حەلەب، وەستانی، عبدالسلام).

(٥) (اللباب) کتێبەکا فقهێ شافعییە ژ دانانا (أبو الحسن المحاملي)یە، و(شرح اللباب) شەرحا وێیە ژ دانانا (إمام الحرمین الجویني) یە، ودیارە موفتییێ حاشییێ جزیری ب خوەیە!.

(٦) یا رەببی چ رازان کو بهیستن مە ژ سازێ (حەلەب).

بـــەنــــدین د ســـــوئالێ وە گوشــــادین د جــــەوابــــێ

ئـەز چوومــە سـەرایـێ کـو شـرین قـەد[1] د سـەمـایێ

گـۆ: ئـەڤ نـە[2] مـەلایـێ مـەیـە؟ بـێ پـەردە بـلا بـێ!

(١) قەد (ئامەد).

(٢) ئەو نە (بەغدا) ئەو نێ (کۆڤلی).

## مە ب دل

مــە ب دل نێرگــزبیێن خاصــصە دڤــێن ... سـەمــەن و یاســەمینــێن تــازە دڤــێن
نــازک و نــەیــشەکــەرێــن توحفــە دڤێن ... سووســنێن نــازک و تــەروەنــدە دڤــێن
دلبــەرێــن دێــم دوڕ و دوڕدانــە دڤــێن ... کەوکەبێن شەوق و شەفەق زوهرە دڤێن
نازپــــەروەردە وشـــــەهـــــزادە دڤـــــێن ... سـایەپـەروەردە مــە بــێ پــەردە دڤــێن
سرو قد دێم گول و لـەب غونچە دڤێن ... (آیــە اللــە)ێ شــەریــف نوسـخە دڤـێن
لـێ ب ئعـراب وخـەط و جـەزمـە دڤێن ... دلروبایــان نــە تنــێ غــەمــزە دڤــێن
ب مــەســیحا صــفەتــێ عــشوە دڤــێن ... ســامری ســحر صــفەت شــیوە دڤــێن
صەنەمێن سوڕ ژ صەمەد هەر مە دڤێن ... ژ مـە ئـەسـوەد حـەجـەران سـەجـدە دڤێن
ب زیــارەت مــە ژ وان بووســە دڤــێن ... طــوررەیـا شـەنـگ دل ئاشـوفتە دڤـێن
مهـــردارێن خـــوە د پژمـــوردە دڤـــێن ... پێشکێـشا تـە مـە دوسـەد نافـە د ڤـێن
سەد هەزار ئەطلەس و هەم خارە دڤێن ... هـەر ل بـۆ زینـەت و خـەمـلا تـە دڤـێن

تــەختــەبـەنـد و صـفەتـێن قــەیـصەرییــێ
دینبـــەرێ حـــووری مثـــالێ زەرییـــێ
نــازکێ نــەیــشەکــەرێ ســوڕپەرییــێ

پـــوڕ ژ دینـــا تـــە غـــەریـــبم خـــانم ... ژ تــە ســەر تــا ب قــەدەم حـەیــرانم
هــەر ب جـان تـشنەلـەبـێ لـەعلانـم ... دل د بـــــەنـــــدا گرهـــــا زولفـــــانم
یووســفێ جــەرعــەکــەشــێ هجــرانم ... نوقطـــــەیـــــێ دائـــــرەیـــــێ زنـــــدانم
لــەو شــوبی دائــرەیــێ ســەرگــەردانــم ... بـــادەنووشـــێ قـــەدەحـــێ حرمـــانم
ب دل ئاتـــەش ژ جـــەگـــەر بریـــانم ... لـــەو پـــەریـــشان و پـــوڕ ئێـــشانم
عاشـــقێ نـــازک و مـــەحبووبـــانم ... تــو نــەبـین بـێ سـەر و بـێ سـامانم

گــولێ بــاغێ ئــرەمــێ بوهتــانم
شــەبچراغــێ شــەبــێ كوردســتانم
چ طــەبيعــەت بــەشــەر و ئنــسانم
(اللــه الحمــد) چ عــالى شــانم
د رِييــا يــارێ ل رِێــزا صــانم
لــەو د ئقليمــێ ســوخەن خاقــانم
صــبەهــى عيــده و ئــەز پــێ زانــم
كــو ب كێــرا تــە[1] ســەحــەر قوربــانم
خــوەش برينــدارەكــى بــێ دەرمــانم
جـارەكــێ شــەفقــەكــە رووحــم وجــانم

ژ خــودێ رِا ڤــەكــە بــەنــدا بــەرييــێ
دينبــەرێ حــووری مثــالێ زەرييــێ
نــازكێ نــەيــشەكــەرێ ســورِپەرييــێ

سووســنێن تــازه و مــشكين دالان[2]
بەس پەريشان كە ل سەر سەر[3] مـالان
ڤــەده[4] جــارەک تــو ژ دۆرا خــالان
ژ دل ئــەم داييـنــە بــەر چــەنگــالان
خــەنجــەر و رِم و شــيرێن قــەتتــالان
نــەظــەرێ وەر بــده صــاحب حــالان
دەمەكێ[5] دا بسەيرين[6] سەد سالان[7]
لـەو ئـەلـف تێن مـە د حـەرفێن فـالان[8]
كــو ل شــەكلــێ رِەقــەمــێ ســەرسـالان
تــوى مــورادا مــە ژ عــەرعــەر بــالان

(١) لەو مە سەرژێكە (وەستانى).
(٢) والان (زڤنگى، ئامێدى).
(٣) ل سەراسەر (يووسفى).
(٤) ڤەكە (يووسفى، عەمەر، زڤنگى، ئامێدى).
(٥) دامەكى (پاشا، عەمەر).
(٦) ب سەرێن (پاشا، عەمەر).
(٧) ل شوينا ڤێ رێزكێ ل نک (زڤنگى، ئامێدى) ئەڤ رێزكە هاتييە: كو چ ئێسيرين د دەست حەييالان.
(٨) ئەڤە ئيشارەتە بۆ دەمێ ڤەهاندنا ڤێ شعرێ، جزيرى دبێژت : دەمێ ئەم ل سەد سالێ د گەريێين ئەم دبينين دو ئـەليـف (ا / ا) بـۆ مـە تـێن وەكـى كـو د حـەرفـێن پـەيڤا (فـالان) دا د ئـێن.. ئـانكو ل ئێكـى هـەيڤا موحەررەمێ (هەيڤا ئێكێ) و ئەگەر ئەم حسێبا ئەبجەدييا (شكل رقم سرسال) دەربێخين دێ بتـە ١٠٤١. و هـێــژاى گۆتنێيە (١٠٤١/١/١ک) دكەفتە بەرانبەر (١٦٣١/٧/٢٩ز)، وئەو رِۆژ رِۆژا سێ شەنبێ بوو. ل ڤێ رِۆژێ جزيرى ئەڤ هەلبەستە دانايە و ژ بەر كو ئەڤ هەلبەستە د گەلەک دەستنڤيسان دا هەلبەستا دويماهييێيە ژ ديوانێ لەو دل د چيتێ بێژين: ل ڤێ ديرۆكێ جزيرى ديوانا خۆ دانايە.

زمـــــزم و دەنـــــگ و زمهنــــا لالان
جــەژبــە دا مــە ب هــەزار ئــەحــوالان

لــەو دنــالم[1] ژ نــەســەق عــەبــدالان
كــو ب مــەســتى ددرن يــەک پــالان

عـەنبـەرێـن خـەمـرى و سووسـن ئـالان[2]
سـوهر و زەر شـەتـرى و چيچـەک والان[3]

مــــصرييێ وان ژ مـــە دل كــر كـــالان
تـــە ژ قـــەوس و قـــوزەحـــێن خلخـــالان

كــو بـــوويين دائــرە شـــوبهەت هـــالان[4]
خــەمــرييێن خــەمــزەدە نــسبەت دالان

كـــو چـــەڤاندينـــە ژ ڕەنـــگ كۆپـــالان
مــــصرييان وەر بـــدە بـــەر ســـيقالان

زوهــرە ڕەنگــێ و شــەفــەق موشــتــەرييــێ
دينبـــەرێ حـــوورى مشـــالێ زەرييـــێ
نـــازكێ نـــەى شـــەكـــەرێ ســـورپەرييـــێ

ســـونبولان تـــازە موڤـــەننــا نـــەكـــرى
طـوررهيــا شـەنـگ موطـەررا نـەكـرى

خــەمرييـــان شـــيفتە طـــوغرا نـــەكـــرى
عـــەرعـــەرێ خـــارە و ديبــا نـــەكـــرى

دل و ديـــن غــارەت و يـــەغمــا نـــەكـــرى
ســـەرێ ســـەودا زەدە ســـەودا نـــەكـــرى

دلـێ غـەمديـدەيـێ مـا شـا[5] نـەكـرى[6]
كوشـتييێ خـەنجـەرێ بـڕڕا نـە[7] كـرى

گـــوهرێ[8] نـــەرگـــسێ شـــەهلانـــە كـــرى
ل مــە بـێ پـەردە تـەجـەلـلا نـەكـرى

مــە ژ قــەيــدا خــوە تــەســەلــلا نــەكــرى
ســاعەتــێ ڤــێ ســەعــەتــێ ڕانــەكــرى

دەعـــوەيـــێ دلبـــەرييـــێ تـــا[9] نـــەكـــرى
مــە دڤــێ عــەنبــەرييــان شــانەكــرى

---

(١) دناليـن (زڤنگى، ئاميدى).

(٢) كالان (پاشا، عەمەر، يووسفى، وەستانى) خالان (عبدالسلام، حەلەب).

(٣) ئالان (پاشا، ئيسماعيل، ئامەد، يووسفى، زڤنگى، ئاميدى، عبدالسلام، وەستانى، حەلەب).

(٤) بالان (پاشا، ئيسماعيل، ئامەد، عەمەر، يووسفى).

(٥) شا ئانكو : شاد، كەيفخۆش.

(٦) ل نک (زڤنگى، ئاميدى) پێشخستن وپاشخستن) د ڕێزكێن ڤێ پارچەيێ دا هەيە.

(٧) بوررانە (پاشا، يووسفى، عەمەر، كۆڤلى).

(٨) گوهرييێ ئانەكو گۆرييێ، قوربانێ، و ل نک (ئامەد) گەوهەرێ، هاتييە.

(٩) ڕا (وەستانى).

جلــوەیــەک میــری و شــاهانە کــری لــێ خـەرامـیٚ ل مـە مـەسـتانە کـری
ژ مــە دل کــەعبــە و بوتخانــە کــری پێـشی شـەمعـا خـوە مـە پـەروانـە کـری
وەهــە جـارەک مـە تـەوەلـلا نـەکـری غـەنجـەکـی قـەنـج ل مـەلـلا نـەکـری
جـەگـەریٚ ریـش مـوداوا نـەکـری بکـوژی عاشـق وپـەروا نـەکـری
قـەط برینـیٚ مـە تـە دەرمـان نـەکـری[1] ل شـەهیـدێن خـوە تـەماشـا نـەکـری

مــا وە دلبــەر دکــرن دلبــەرییــیٚ!؟
دینبــەریٚ حــووری مثــالیٚ زەرییــیٚ
نــازکیٚ نــەی شــەکــەریٚ سـورپەرییــیٚ

هەردو قەوسێن تە ژ قودرەت نـە ژ یـەنـگ ژیٚ ب میـزان بـڕەشینن[2] مـە خـەدەنـگ
بـدەرن سـینە ب سـەر پـەنجـە پـەلـەنـگ ڕۆم پشت دت عـەجـەمـیٚ بێتـە فـەڕەنـگ
لـیٚ نـە وەک واقعـەیـا گیـو و پـەشـەنـگ هلبـتن قـەنـج ژ نێـڤ ئاتـەشـیٚ جـەنـگ
بێن سەواشیٚ حـەبـەش و نـووبی و زەنـگ تـو دزانـی چ نـەهـەنگـن چ نـەهـەنـگ!
ڤەکە لەعلان تو ژ سەر شەککەریٚ تـەنـگ کـو چ مـورادا تـە بـوویین پێت وپـەڕەنـگ
مـەستیٚ جەورا تـە مـە بیٚ بادە وبـەنـگ بیٚ تـە جانـا ل مـە عالـەم بوویـە تـەنـگ
ژ جـەفایـا تـە نـەمـا قـەط ل مـە ڕەنـگ تـو دزانـی چ دبێـژت نـەی و چـەنـگ
ژ چ پـەیـوەسـتە د نـالن سـەریٚ زەنـگ[3] مـە دخوونن قـەد و بـەژنا تـەیـە شـەنـگ
نێرگـزێن مـەسـتیٚ ب نـاز و نـەیـڕەنـگ لیٚ تو طووبا و ئـەزیٚ خـەستـەییٚ لـەنـگ
چ بکـم فـەیـدە کـو ئێڤـارە دەرەنـگ موطربـان دا نـەکـەڤـن چـەنگیٚ ژ چـەنـگ
دا نـەدت پـەردەیـیٚ ئاییـنـەیـیٚ زەنـگ وەک مـەلایـی ب هـەزار ڕەنـگ ئاهـەنـگ
کـو ژ چـەنگـا مـە بنالـت خـەرچـەنـگ ب فەغان بێت و ژ بـەر سـەد فـەرسـەنـگ

---

(١) ئەڤ ڕێزکە ل نک (ئامەد) ب تنیٚ هەیە.
(٢) درەشینن (کۆڤلی).
(٣) سەرا دەنگ (زڤنگی، ئامێدی).

چ خـەبـەر دم ژ دلـێ تـەی وەکـی سـەنـگ دکـوژی عاشـقێ مـسکین ب تڤـەنـگ

نــەکــری تــەرک تــو ڤــێ کــافرییێ
دینبـــەرێ حـــووری مثـــالێ زەرییـــێ
نـــازکێ نـــەی شـــەکـــەرێ ســـورپەرییـــێ

ب قـــــەدێ نێرگـــــزا بوهتـــــانی نازکـەک شـەنـگ شـوبی رەیحـانی
چ خـەط ئـشکەسـتە شـرین رەیحـانی کـو تـە پـێ نـەسـخ کـری دیـوانی
(اللـــه اللـــه) ژ چ ڕەنـــگ ئنـسانی یووسـفێ لـەب شـەکـەرێ عبرانـی
بـەسـە گـەر وەک تـە بـدیرت ثـانی حـووربیێن رووح صـفەت رووحـانی
وەک تـە سـەر تـا ب قـەدەم نـوورانی وەک تـە حاشـا هـەبـتن شـیرانی
(أحـسن اللـــه) ژ ســـررا ســـوبحانی کـو جـەمالـەک وە مونـەززەهـ ئـانی
د مثالـــەک بـــەشـــەری دا دانـــی مـــە ب ئلهـــامێ ئیلاهـــی زانـــی
ب نـــشانێ قـــودرەت بـــێ نیـــشانی چ نـشان ظـولمـەتـێ نـوور ئـەفـشانی
ل جـــەمـــالا صـــەمـــەدی بورهـــانی تـو ل دەرحـەق مـە چـڕا ئـەرزانـی؟
کـو سـەحـەرگـەه بمـەشـی سـەیرانـی تـە مـەلایـێ خـوە قـە جـارەک نـانی
ب ســـەرئـــەفـــرازی و عـــالی شـــانی سـەجـدە بـت بـەر قـەدەمـا سـولطانی
نـــە تنـــێ رووحـــی تـــو رووح و جـــانی زینـەتـا حوسـن و سـوڕا خووبـانی
تـــاجێ فـــەرقـــێ ســـەرێ مـــەحبووبـــانی تـــو ل ســـەر دلبـــەران خاقـــانی[1]

تــو ب شـیرانی و لــەب شـەککـەرییـێ
دینبـــەرێ حـــووری مثـــالێ زەرییـــێ
نـــازکێ نـــەی شـــەکـــەرێ ســـورپەرییـــێ

(١) ئەڤ ڕێزکە ل نک (ئامەد) ب تنێ هاتییە.

# صباح الخير

(صـــباح الخيـــر) خـــانێ مـــن　　شـــەهـــێ شـــيرين زەبـــانێ مـــن
تـــويى ڕووح و ڕەوانـــــێ مـــن　　ببـــت قوربـــان تـــە جـــانێ مـــن
(تعـــالی اللـــه) چ ذاتـــی تـــو　　چ وێ شـــــيرين صــــفاتی تـــو!
نـــە وەک قـــەنـــد و نـــەبـــاتی تـــو　　يـــەقـــين ڕووح و حـــەيـــاتی تـــو

حـــەيـــات و راحـــەتـــا جـــانم
(صـــباح الخيـــر يـــا خـــانم)
وەرە بيناهييـــــا چـــــەهڤـــــان
ببيـــــنم بـــــەژن و بـــــالايێ

(صـــباح الخيـــر) مـــەســـتا مـــن　　لـــەطيفـــا جـــام ب دەســـتا مـــن
خومـــار و مـــەی پـــەرەســـتا مـــن　　تـــويى مـــەقـــصوود و قـــەســـتا مـــن
ژ مـــەقـــصوودان تـــويى بـــەس مـــن　　بـــبن بـــەر چـــەرخـــێ ئـــەطلـــەس مـــن
ژ غـــەيـــری تـــە نـــەڤێـــت كـــەس مـــن　　ب ڕەشـــتۆزێن[1] موقـــەووەس مـــن

د بـــەنـــدا زولفـــێ چـــەوگـــانم
(صـــباح الخيـــر يـــا خـــانم)
وەرە بيناهييـــــا چـــــەهڤـــــان
ببيـــــنم بـــــەژن و بـــــالايێ

ژ وێ زولفـــــێ ژ وێ بـــــەنـــــدێ　　ڕەهـــا بـــم لـــێ[2] ژ پـــەيـــوەنـــدێ
ســـيەهـــ چـــەشـــمێ ســـپی زەنـــدێ　　تـــە ســـوهتم شـــوبهەتـــی فـــەنـــدێ

(١) ب وان طـاقێن (ئامەد).
(٢) كەی (ئامەد، كۆڤلی).

شـوبی شـەمـع و شـەمـالم ئـەز ژ بـەر حوبـا تـە لالـم ئـەز
ضـەعـیفم وەک هلالـم ئـەز صـفەت گـۆیین دکـالم ئـەز
ڤ بولبـول ڕا ب ئـەفغـانم
(صـباح الخیـر یـا خـانم)
وەرە بیناهییـا چـەهڤـان
ببیـنم بـەژن وبـالایێ

ڤ بولبـول ڕا شـەڤ وڕۆژێ ل سـەر وێ تـەرح وبـشکۆژێ
ئـەنـی مـاهێ شـەفـەق ڕۆژێ تـە سـوهتم شـوبهەتـی دۆژێ
کـو دوورم ئـەز ژ وێ حـوورێ تنـێ جـارەک ل سـەر سـوورێ
ژ وادی ئـەیمـەنـا طـوورێ تـەجـەلـلا کـر د نێـڤ نـوورێ
ژ وێ سـوهتی دل وجـانم
(صـباح الخیـر یـا خـانم)
وەرە بیناهییـا چـەهڤـان
ببیـنم بـەژن وبـالایێ

ژ حوسـنا وێ تـەجـەللایـێ یـەدێ بـەیـضاء و بـالایێ
چ وەصـفان بـێم[١] خـەبـەر نـایێ وەلـێ دل جـەذبـەیـێ دایـێ
نـەهـشیارم ژ وێ بـەرقـێ ژ زەرتـاجێ ل سـەر فـەرقـێ
سـپێدە دا[٢] هـەتـا شـەرقـێ بـەلـێ نـائێخمێ فـەرقـێ[٣]
ژ ضـەربـێ عـشقێ نـالانم[٤]

---

(١) دم (ئامەد).
(٢) شەفەق دابوو (ئامەد).
(٣) جهان من دی د وێ غەرقێ (ئامەد).
(٤) نادانم (ئیسماعیل) ژ وێ شەوقێ ب کۆڤانم (ئامەد).

(صـــباح الخیــــر یـــا خـــانم)
وەرە بیناهییـــــا چـــــەهڤـــــان
ببیـــــــنم بـــــەژن وبـــــالایێ

ظـــەریفـــی نـــازکی شـــەنگـــی     صـــفەت حـــووری پـــەری ڕەنگـــی
ب ڕۆژێ ڕا تـــو هـــەڤـــدەنگـــی     دو ڕەشـــتۆزێن ســیەهــ یــەنگــی[1]
کـــشاندن لـــێ نـــە وەک جـــاران     خـــەدەنگـــێن قـــەوســـێ نووبـــاران
ژ ڕەنگـــێ شـــیر و مووکـــاران     ڕەشـــاندن ســـینە وەک بـــاران
ژ وێ ضـــەربـــێ ب ئێـــشانم[2]
(صـــباح الخیــــر یـــا خـــانم)
وەرە بیناهییـــــا چـــــەهڤـــــان
ببیـــــــنم بـــــەژن و بـــــالایێ

ڤـــەکـــە جـــارەک خـــەط و خـــالان     ل ســـەر وان مـــەســـنەد و پـــالان
بخوونـــە لـــێ مـــە عـــەبـــدالان     ببینـــین عیـــد و ســـەرســـالان
ئجـــازەت دی مـــە دەســـتووری     پـــەری ڕەنگـــێ صـــفەت حـــووری[3]
د نێڤـــا ظولـمـــەت ونـــووری     بنووشـــین مـــەی د فـــەرفـــووری
ژ دل تـــــالانێ خـــــالانم
(صـــباح الخیــــر یـــا خـــانم)
وەرە بیناهییـــــا چـــــەهڤـــــان
ببیـــــــنم بـــــەژن وبـــــالایێ

ژ شـــەهکاســـا کـــو قـــەرقـــەف تـــێ     مـــەیـــا نـــوورین موشـــەررەف تـــێ

---

(١) ژ وان قەوسێن سیەهـ زەنگی (ئامەد).
(٢) پەریشانم (ئامەد).
(٣) طـەوافێ کین د وێ طـووری (ئامەد).

نشانەک دلبەرێ کەفتێ ژ[1] بۆ من هەر سەحەر خەف تێ
ژ وێ جامێ دنووشم ئەز سەحەر لەو نەی ل هووشم ئەز
ژ عامێ لێ دپووشم ئەز ب جان هەر لێ دکووشم ئەز
کو غالب مەست و سەکرانم
(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەڤان
ببینم بەژن و بالایێ

وەرە پێشبەر مەلایێ خوە شەهید و موبتەلایێ خوە
ب شەفقەت کە لقایێ خوە مەلا[2] نەمرت ب دایێ خوە
مەسیحایی ل بیماران کەسێ گەزتی دو ڕەشماران
شەهیدێن شیر و مووکاران کری ئامانجێ نووباران[3]
ل دیدارا تە حەیرانم
(صباح الخیر یا خانم)
وەرە بیناهییا چەڤان
ببینم بەژن و بالایێ

(١) ل (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٢) بلا (ئامەد).
(٣) دبن خوەش ئەو ب دیداران (ئامەد).

# صەنەما سورِ ژ صەمەد أ

غـەرق بـووم ئـەز د غـەما عـشقێ د وەقتـێ سـەحـەری بـوو
کـو تـەجـەللايـێ جـەمـالێ ژ مثـالێ بـەشـەری بـوو
نـە ژ لـەونـێ بـەشـەران مـن دييـە لـێ دێـم زەری بـوو
ئەز دبێم رووحێ قودس بوو ب خوە يا حوور و پەری بوو
لەو ب حوسن ونـەظـەرێ رەمـزەک[1] ژ سرِا قـەدەری بـوو
خـەمـرييێن سـەيـر ل دێـم حـەلقـە ل دۆرا قـەمـەری بـوو
سەد خەدەنگ دانە جەگەر سينە ژ ضـەربێ ب کـەری بـوو
ل مـە ئـێش و ئـەلـەمـان زێـدە ژ تيـرا قـەجـەری بـوو
دل ژ مە بوويە پەلەک جان و جەسەد تێک سەقەری بوو[2]

لەو مە شەب تا ب سەحەر نالـەيە وەک مـوغنی وعـوودێ
صـەنـەمـا سـورِ ژ صـەمـەد شـەوق ژ حـەق دايـە ووجـوودێ
گـەر عـەزازيلـی بـديتا نـەدبـر غـەيـری سـوجوودێ
نـەظـەرەک وێ بـەشـەرێ لـەب شـەکـەرێ حوورسرشـتێ
نـادرم ئـەز ب مـەی و کـەوثـەر و حـوورێن د بهـشتێ
ئێ دييی ئەو ب خوە جارەک د عـەجيبم کو ب هش تێ
تـە ژ وان قـەوس و کـەڤانـان چ خـەدەنگـن د ب وەش تـێ
ئـەوە مـن شـافييێ دەردان مـە چ حاجـەت ب نڤـشتێ

---

(١) رەمزێ (پاشا، ئيسماعيل، ئامەد، يووسفی، کۆڤلی، عەمەر).
(٢) ئەڤ رێزکە ل نک (پاشا، کۆڤلی، يووسفی، عـەمـەر) نينـە ، و د دەستنڤيـسا سـەيفييـێ شۆشی دا (ئـەوا ل سالا ١١٩٥ک ١٧٨٩ز هاتيية نڤيسين) ب ڤی رەنگی يە: خەمرييا شيوە ت کر عشوە ژ لـەعلێ شـەکـەری بوو. و د دانەيا (ئامەد) دا ب ڤی رەنگييە: ئاه و نالێن د مە دائيمی ژ ئێشا جەگەری بوو.

گـەر بكـت حوسـن و جـەمـالا خـوە تـەجـەلـلا د كنـشتێ
دبـتن بـەیتـێ قـودوس ئـەهلـێ زیـارەت ژ حـەبـەش تـێ
سـینە بوتخانـەیـە[1] ئیـرۆ مـە ژ دێـم و قـەد و قـشتێ
ب دلـێ سـادە چ كـم ئـەز كـو تـەجـەلـلا نـەگهـشتێ!؟
ئـەوە مـن قبلـەیـێ جـەبهـەت د قیـام و د قوعـوودێ
صـەنـەمـا سورِ ژ صـەمـەد شەوق ژ حەق دایـە ووجـوودێ
گـەر عـەزازیلـی بـدیتا نـەدبـر غـەیـری سـوجوودێ
قبلـەیـا ئـەهلـێ دلان گـەر بكـتن[2] كـەشـف جـەمـالێ
یـا تـەجـەلـلا كـە ژ بـەر[3] تـاج و پـەڕان قـەوسێ هلالـێ
كـی ب دل كـافرە ئـێ سـەجدە نـەبـت جـەبهـەت و خـالێ
یـا نـەدت شـەهـدە ب ئایـات د وێ وەقـت و مـەجـالێ
(لیلـە القـدر)ە ب مـن ئـەو سـەعـەت، و عیـدە د سـالێ
شـەفقـە كـر پـەردە هلانـی سـەحـەرێ شـۆخ و شـەپـالێ
ئـەییـسی دێـم[4] ژ ئـەنـوار و سـورێ شـوبهی شـەمـالێ
مەششها مەست و شەكـەرلـەب ب مـە دا مـەی ژ پـەیالێ
نـەگهـام سـەجـدە بـبم پـورِ خـەجلـیم ئـەز ژ وصـالێ
هـادری بـەرقـێ ل دل دا ژ تـەجـەلـلا و شـوهوودێ
صەنەما سورِ ژ صـەمـەد شەوق ژ حەق دایـە ووجـوودێ
گـەر عـەزازیلـی بـدیتا نـەدبـر غـەیـری سـوجوودێ

(١) سینە بت خائیفە ئیرۆ (ئامەد).
(٢) ئەر بكرت (سەیفی).
(٣) زێر (كۆڤلی).
(٤) ئەییسان دیم (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، زڤنگی، ئامێدی).

ڕوهنییــا چــەشــم و چرایــا مــە نــزام هێــژ د بیــرم
کــو د زنــدان وحــەبــسخانەیــێ وێ بــەنــد و ئــەســیرم
ژ خــەدەنگــێن قــەجــەری[1] ســینە تــەژی گــەزمــە وتیــرم
دل د نێــڤ حــەلقــەیــێ زولفــا ســیەهــا بــوو ژ عــەبیــرم
تێــک پــەریــشانێ لــەف و شــەتــری و تــاییێن ژ حــەریــرم
تــو هــەیــی مــن د دنــێ لــەو د دنــێ بــەگلــەر و میــرم
زێــر و مــال ئــەر چ نــەدیــرم تــە ددیــرم نــە فــەقیــرم
ژ ئــەڤینــا تــە شــەپــالێ د شــەڤــان شــوبهی نــەدیــرم
ژ لــەبێ لــەعلێ شــەکــەربــارێ تــە وەک شــەککــەر و شیرم
مە ژ سەر تا ب قەدەم سوهتنە وەک ئاتەش و عــوودێ
صەنەما سوڕ ژ صەمــەد شەوق ژ حەق دایە ووجــوودێ
گــەر عــەزازیلــی بــدیتا نــەدبــر غــەیــری ســوجوودێ
بێ حساب شۆخ و شەپالێ ل مەلێ قەهر و غەدەر کر
نــە ئــەم ئانینــە خــەیــالێ نــە ل حــالێ مــە نــەظــەر کــر
قــەط نــەکــر شــەفقــە، لباسێ غــەضــەبێ زێدە د بــەر کــر
عللــەتــا جــەور و جــەفا و ئــەلــەمێ جهــ ل[2] جــەگــەر کــر
عــەللانــدین د فراقــێ ســتەمــێ ســینە بکــەر کــر
ئاهــ حــەتتــا مرنــێ ئــەڤ ژ مــە ڕا داغ و کــەســەر کــر
ســەفــەرا شــام و عراقــێ ل مــە خــوەش لازم وفــەر کــر
ب مــە دا ژەهــر ورەقیبــان د دەڤــی شــەهــد و شــەکــەر کــر
ئەم بووین پێت و پەڕەنگ لــەو ژ وصالێ مــە حەذەر کر

(١) مەجەری (سەیفی).
(٢) ب (عەمەر، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام).

نازک و نەیشەکەر و خووب و شرین قەدد و خودوودێ
صەنەما سورِ ژ صەمەد شەوق ژ حەق دایە ووجوودێ
گـەر عـەزازیلـی بـدیتا نـەدبـر غـەیـری سـوجوودێ

## صەنەما سورٍ ژ صەمەد ب‍[1]

ئـــەنـــوەرا ڕەنـــگ فرشـــتە بـــەشـــەرا حوورسرشـــت
يـا ژ مـسكێ خـەتـەنـێ خـال و خـەط و كـاكول و قشت
گـەر خـوە نيـشان سـەقـەرێ دت دكـرت حـوور بهـشت
كـەعبـەيـا تـێ نـەبـت ئـەو بوتكـەدەيـە و دێـر و كنشت
كـو نـەصـيب دان ژ ئـەزەل حـەق ژ مـە ڕا عـشق نوشت
فـەيـدە نـاكن ل مـە ئـسم و نـە طـلـسم و نـە نقـشت
ظـاهرى دا مـە عـەذابـەک وەە كـو بـاطـن ڤـە بهـشت
ســوهتنێ دايــە هناڤــان و جــەگــەر تێــک برشــت
قەصدێ وەصلێ مە ب جان كر كو ڤەدايين[2] ونەهشت

دەست نەهلين ژ طـەلـەب ئەر مە د ڕێ چت سەر و تشت
پـشت نـادين دو هـەزار خـەنجـەر و تيـر و ڕم و خـشت
مـە سـەرێ دانييـە ڕێ و ب خـودێ بـەسـتييە پـشت
ئـەوە مـن رووح و حـەيات و ئـەوە مـن قبلـەيـێ ذات
صەنەمـا سورٍ ژ صـەمـەد نـەيـشەكـەرا لـەب ژ نـەبات
(أحـسن اللـه، تبـارک) ژ سـوڕا وێ صـەنـەمـێ
زەرييـا دێـم ژ دورٍ ولــەب شـەكـەرا عـشوە پـەرى
يـا ژ سـەر تـا ب قـەدەم تێـک ژ عـەيبانـە بـەرى

(١) هەژار ل وێ باوەرييێ يە كو ئەڤ شعرە نە يا جزيرييە، چاڤلێكرنا شعرا وى يا بۆرييە [ئيسماعيل تاها شاهين].
(٢) فداپين (پاشا، ئيسماعيل، يووسفى، عەمەر) فدابين (ئامەد، كۆڤلى، عبدالسلام).

ژ سـەراپـەردەیـێ لاهـووت ب سـەد شـیوە کـەری
بێتـە بـەر عـەینـی شـوهوودێ د لباسـێ بـەشـەری
(حـاش للـە) تـو کـەسـان دیبـتن ئـەڤ ڕەنگـە زەری
دایـە بـەر قـەنـد و نـەبـاتێ ژ دو لـەعلـێن شـەکـەری
بێ تـو یا لـەب شەکەری، یا تـو نەباتا ب تـەڕی؟(١)
(اللـە اللـە) چ تـەجـەللایـە ژ سـرڕا قـەدەری!
حاجبـان(٢) سلـسله بـەسـتینه ل دۆرا قـەمـەری
ب بێ موروووەت کو دو میران ژ سوڕێ مەی د سەری
دەورێ بـەیتـێ ژ صـەفـا تێنـە سـەمایـا سـەحـەری
نـەهـێلن چینـە طـەوافـێ وزیـارەت حـەجـەری(٣)

زەمـزەم و غولغولـە و عـومرە و عیـد و عـەرەفـات
صەنەما سوڕ ژ صەمەد نەیشەکەرا لەب ژ نەبات
(أحـسن اللـە، تبـارک) ژ سـوڕا وێ صـەنـەمـێ

مـن ب دل صـوورەتـێ جـان دی ژ بوتـان ئـەو ب تنـێ
ئـەو تنـێ سـرو رەوان دی ژ ظـەریفـێن چـەمـەنـێ
خـەمرییـان حـەلقـە و چـین دانـە ژ مـسکا خـەتـەنـێ
سـەر ددن چـەشـمەیـێ حـەیـوان و ب زمـزم درەنـێ
لـێ چ شـیرانییە (اللـە) تـە ژ وێ کـەفـت و چـەنـێ(٤)
ئـەز دبـێم بـەدرە ب دێم لـێ دکـتن گوفـت و کـەنـێ(٥)

(١) تەبەری (ئیسماعیل، ئامەد) پتری (عبدالسلام).
(٢) حاجبیان (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) د ڤێ پارچەیێ دا پاشخستن وپێشخستن ل نک (پاشایی) هەیە.
(٤) گوفت وکەنێ (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی) رەخت وچەنێ (عبدالسلام).
(٥) دکەنی کفت وچەنێ (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).

یـا یـەقـین ڕۆژە ل شـەرقـێ و شـەفـەق دایـە دنـێ
غـەلـەطـم رووحـێ قـودوس هاتییـە نێـڤ وێ بـەدەنـێ
دکـت ئحیـایێ مـەواتـان ب سـوڕ و رەفـت و چـونێ
تـە نـەهـن بـاوەر و ئیمـان نـەظـەرێ دێ و بنـێ
چ تـەجـەللایـە بـوویی قبلـە مـەلـەک ڕوو ددنـێ
سووسن و سونبول و گول چەرخە ل دۆرا سەمەنێ[1]

ئـازەری گـەر بـدیا هـوور دکـرن لات و مـەنـات
صەنەما سوڕ ژ صەمەد نەی شەکەرا لەب ژ نەبات
(أحسن اللـه، تبـارک) ژ سـوڕا وێ صـەنـەمـێ

نێرگزا مـەست و شیرین و گـول و نـەسرینە ژ ڕەنـگ
شەکەر و لوئلوئێ مەنشوور و ب دل[2] ئاهەن و سەنگ
مـە ژ بـەر ضـەربێ ئـەڤینـێ بـووە دل پێت و پـەڕەنـگ
لەو مە شەب تا ب سەحەر نالەیە وەک موغنی و چەنگ
دا مە سەد ڕەنگێ عەذابێ و نەهات دەر ژ مە دەنگ
هەستییان گرتییە ناسوور و مەژی دا هەیە ژەنگ[3]
لەو نەهشیار و خومارین مە نە خواری مەی و بەنگ
ل مـە ئیـرۆ دو کـەمانـدارێ حـەبـەش هاتنـە جـەنـگ
تێنە قەتلا مە د دەستان دو سیەهـ قەوسێ ژ یەنگ
دڕەشـینن مـە و تـێن مـە دو هـەزار تیـر و خـەدەنـگ
جـەگـەرێ کـون دکـن و تـێ دبـەیـین مثلـی تڤـەنـگ

(١) ئەڤ ڕێزکە تنێ ل نک (زڤنگی، ئامێدی) هەیە، د ڤێ پارچەیێ دا پاشخستن وپێشخستن ل نک (زڤنگی، ئامێدی) هەیە.
(٢) بەدەن (پاشا، عەمەر) قەلب (کۆڤلی).
(٣) دایە هەژەنگ (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).

مثلی وێ کافر و ظالم قه دیین کەس د فەرەنگ؟

نازک و خووب و شەکەرخەندە و شیرین حەرەکات
صەنەما سوڕ ژ صەمەد نەی شەکەرا لەب ژ نەبات
(أحسن اللـه، تبارک) ژ سوڕا وێ صەنەمێ

د ڕییا دۆستێ مەلا یەک جهەت و سادە دلین
مە حەتا جان هەیە حاشا ژ طەلەب دەست بهلین
یا د ڕێ سەر بدەرین یا ب موورادێ وەصلین
مە چ پەروایێ ڕمێن پەڕوەش و شیرین قزلین
تا ئەبەد مەست و هەلاکین ژ شەرابا ئەزەلین
ژ جەفا و ستەما وێ ژ جەگەر پوڕ د کولین
پەردەیا گۆشە قەصەب بێ تو ژ سەر دێمی هلین
کو د شەرقێ مەهـ و خورشید ژ شەوقێ بەططلین
لەو ژ سوڕ سورمە ددیرین و نە موحتاجی کلین
مەست د نێڤ تۆڕ و لەفان مار ل سەلوێ فتتلین
سورمەدارین ژ سوڕێ مەستێ ژ قودرەت کەملین
مە ژ غەفلەت دوژها[1] دین و ژ سەهمێ خەجلین

عشوەگەر شیوە نومایا مە ژ وێ ڕووح و حەیات
صەنەما سوڕ ژ صەمەد نەی شەکەرا لەب ژ نەبات
(أحسن اللـه، تبارک) ژ سوڕا وێ صەنەمێ

(١) زەری (کۆڤلی).

## ئیرۆ م دێ[1]

ئیــرۆ م[2] دی وەقتـــێ ســەحـــەر　　　ئـــەو دلبـــەرا ســـوندوس د بـــەر
دیـــسا د لبـــسێ ســـۆر وزەر　　　نـــوورەک مونــەززەهـ بـــوو بـەشـــەر
بـــسکێن سیاهــ خـــالێن د قـــەر　　　ڕەش کـاکولێ زولـف چوونـە سـەر
ئـەسـوەد بـوو دائـم سـەجـدە بـەر　　　مـن بـەسـتی عـەقـدا نییـەتـێ
غـەفلـەت ب سـڕ دا مـن نـەظـەر　　　میـــران ب قـــەتلـــێ کـــر غـــەدەر
تیـــر دانـــە دل شـــاهێ مـــەجـــەر　　　بـێ مـروەت ئامـانج کـر[3] جـەگـەر
فـەریـاد و ئـەفغـان سـەد کـەسـەر　　　وەصـفان نـەشـێم لـێ ئـەو قـەدەر
زانـــم کـــو ڕۆژ بـــوو هاتـــە دەر
ســـوبحان ژ شـــاهێ قـــودرەتـــێ

ســـوبحان ژ تـــە شـــاهێ جـــەلال　　　هۆســـتایێ پـــوڕ قـــودرەت ل بـــال
خاصـا تـە دایـی ئـەڤ جـەمـال　　　دێمـێ ژ عـەنبـەر خـەط و خـال
کفـش بـوو د قـەوسـێ دا هـلال　　　ڤێـــڕا مـــە دی بـــەدرا کـــەمـــال
لـێ بـوون نقـاب چـەوگـان و دال　　　وان یـەک ب مـەسـتی دایـە پـال
لـــێ سـەیبـری بـایێ شـەمـال　　　پێچانـــە ســـەر نـــوورا زەلال
قـەط کـەس دیین ئـەڤ ڕەنـگ مثـال　　　مـوطرب وەرە وەقتـە و مـەجـال
زازا ب نـــــایێ ڕا بنـــــال　　　سـاقی وەریـن خـەمـرا حـەلال
جـارەک ژ سـەر دێمـی ڤـەمـال
زولفـێن ل دۆرا جـەبهـەتـێ

---

(١) هەژار ل وێ باوەرییێ یە کو ئەڤ شعرە نە یا جزیری یە [ئیسماعیل تاها شاهین].
(٢) مە (ئامەد، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر).
(٣) بێ مروەتێ کەرکر (ئامەد).

زولفـــێن موعـــەنبـــەر کـــاکولین		بـسکێن سیاهـ ڕەنـگ سـونبولین
تاتـــا ب داڤ داڤ فـــەتلـــین		چـین چـین ب مـەستی سلسلین
بـایێ[1] نـەسـیم تێـک مـەییلـین		وی قـــەســـتە خـــالا فلفلـــین
ئــەبلــەق ژ قــودرەت خــەملــین		وێ بوغچــەیــێ گــول کــەملـین
تــێ عــەنــدەلیــب و بولبــولین		ڕۆژ هاتـــە بورجـــا ســـونبولین
غـەفلـەت مـە دی لـەو خـەجلـین		مـەحرووم و مـەهجـوور دل کـولین
مـــەجرووحـــێ تیـــرێن قـــزلین[2]		ڕەحمـــێ کـــە پـــوڕ ســـۆتی دلـــین
ڤــێ پــەردەیــێ جــارەک هلــین
بـــاڤێ نقابـــا ظولمـــەتـــێ
پورســـێ ل مهـــرداریێ خـــوە کـــە		ل مـەجـذووب و حالـداریێ خـوە کـە
بـەس قــەهـر و ئـازاریێ خـوە کـە		قـــەســـتا برینـــداریێ خـــوە کـــە
شــەفقــێ ب دیــداریێ خــوە کــە		تێـک غـەرقـێ ئـەنـواریێ خـوە کـە
لــێ ئـەمـر و فـەرواریێ خـوە کـە		شـــەهیـــدێ نووبـــاریێ خـــوە کـــە
گـــەزتییـــێ ڕەشـــماریێ خـــوە کـــە		لــەعلـێ شـەکـەربـاریێ خـوە کـە
ب لـــەفـــڤ وگوفتـــاریێ خـــوە کـــە		دەرمـــانێ کولـــداریێ[3] خـــوە کـــە
لـێ کـەشـفێ ئـەسـراریێ خـوە کـە		مـەخمـووریێ خـەمماریێ خوە کـە
حـــەیرانـــێ ڕەفتـــاریێ خـــوە کـــە
کوشـــتینە تیـــرا موجبـــەتـــێ
وەر ســـەردە جـــارەک کوشـــتییان		ئـەختـەرمـەیێن خوە[4] ب یـەنگییـان
بـــەردە ب مـــل دا خـــەمرییـــان		بـــادت ســـەحـــەر ڕەیحانییـــان

(١) دایێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٢) ئەڤ ڕێزکە ب تنێ ل نک (زڤنگی، ئامێدی) هەیە..
(٣) دەرمان ژ گولزاریێ (ئامەد).
(٤) وان (ئامەد، کۆڤلی).

داغـــێن شـــەهیـــد و ســـوهتییان　　　دانینــــــە لــــــێ وان تللییـــــــان
کـــــو ژ مــــــوعجزا خومماریيـــــان　　　رووح بێتـــە دیـــسا ســـەر گیـــان
هێـــــژ نــــابرِم قـــەط هێڤییـــــان　　　ژ وان شــــەفقــــە و دلـــــدارییان
(باللــــــه) ژ نــــال و زارییـــــــان　　　ظـــەربـــا فـــراق و بهرییــــان[1]
تـــەشـــبیهی تووتـــاکێن چیـــان　　　خـــەو نــــاکرین شـــەڤتارییـــان

لـــێ هێـــژ دخـــوازین شـــوکربیان
چـەنـدی کـو رِوو دیـن[2] قبلـەتـێ

چـەنـدی دنـێ بـت[3] هـەر هـەبـی　　　عالـــەم د بـــەر حـــوکمێ تــە بـــی
هـــەرچـی دڤـێ تـــە هـــەر وەبـــی　　　لبـسێ تـە کـەمخـە و خـاره بـی
دائـــم ب رِەمـــز و عـــشوه بـــی　　　شـوبهەت گـولا هـەر غونچـە بـی
وێ بـەغچـەیـێ خـار تـێ نـەبـی　　　ئاگـەهــ ژ عوشـشاقێن خـوه بـی
چـەشـمەک ل ئـەحـوالێ مـە بـی　　　دەر حـەق مـەلـێ بـێ پـەردەبـی
سـاغەر مــەدام پـورِ بـاده بـی　　　پـورِ شـەفقـە و خـوەش مـەعـده بی
بهتـــر ب رِەحـــم و شـــەفقـــە بـــی　　　ب شـــیرێ تـــە دا پـــەروانـــە بـــی

مـەخمـوورێ چـەهڤـێن شـەهلـە بـی
ســــۆتینه نـــارێ فورقـــەتـــێ

دەردێ غـــەدار بـــێم فورقـــەتـــە　　　فورقـــەت ژ جـــان پـــورِ زەحمـــەتـــە
عاشـــق مـــرن هـــەر ســـاعەتـــە　　　یـا سـەهلـە جـارەک[4] رووح دەتـە
لـێ دلبـەر ئـەڤ رِەنـگ عـادەتـە　　　هـــەرچـــی د بـــەنـدێ دا کـــەتـــە
ئـــەووەل ددت پـــێ ئولفـــەتـــە　　　ذەوق وصـــەفـــاء و صـــوحبەتـــە

(١) فراقێ بوهریان (ئامەد).
(٢) رِۆژ بێت (ئامەد).
(٣) دلی پێت (کۆڤلی).
(٤) عاشق (زڤنگی، ئامێدی).

گاڤەک کو ئەو ڤێرا رەتە     ئانجا ژ ناگەهـ غەفلەتە
شیرێ جەفایێ لێ دەتە     (اللە) چ وێ بێ مروەتە!
ڕەحمێ ب عاشق نابەتە     وێ قەستە جان یەغما کەتە[١]
حەتتا کو دل قەنج ژێ بەتە
ئنصاف ژ مەهڕوویان مە تێ

یار قەستە جان یەغما کرت     دا موعجزێ پەیدا کرت
ڕەمزەک ژ ڕەنگ عیسا کرت     یا سحرێ بووسینا کرت
ژ ئەو لەعلێ شەککەرخا کرت     دیسا شەهیدان ڕاکرت
ڤان کۆلەیان ئازا کرت[٢]     جارەک غەریبان شا کرت
ڕاستی یەدێ بەیضا کرت     مسکێ د جەرحان داگرت
دێ خوەش بکت ئحیا[٣] کرت     شەفقێ کە یا رەب دا کرت
ڕەش کاکولان تاتا کرت     سەد حەلقە چین چین باکرت
هەمیان ل دێم طوغرا کرت
ئەمرێ هومایوون سەر مە تێ

عاشق ژ وێ دێ سادە[٤] بت     خاکا ڕییا یارێ خوە بت
سەد داغ د دل وەک لالە بت     خوونێ بخوت ڕەنگ غونچە بت
وی[٥] جانفدا شوبهەت مە بت     جانێ عەزیز نەقدانە بت[٦]
دائم ب سەعی و جەهدە بت     طەبعێ کو یار لێ ئەو وە بت

---

(١) وێ قەستە جان کت غارەتە (پاشا، ئیسماعیل، ئامەد، ئامێدی).
(٢) دەولەت ژ کوولان نا کرت (پاشا، ئامەد، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی) ژ کۆلی ناکرت (ئیسماعیل).
(٣) حەبیا (پاشا، یووسفی، عەمەر).
(٤) شاد (یووسفی) عاشق دڤێ دل سادە (زڤنگی، ئامێدی).
(٥) دێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٦) لێ ژ ئەمرێ یار غال نە بت (زڤنگی، ئامێدی) نەقدا تە بت (عبدالسلام).

یـار ژی د گـەل بـێ پـەردە بـت[١]　　ڤێـرا ب رەحـم و شـەفقـە بـت

وەک غونچـە عاشـق دل ڤـەبـت　　دل شـوبهەتـی ئایینـە بـت

عـشق و جـەمالـەک[٢] زێـدە بـت　　خـال ئـەسـوەد و دێـم قبلـە بـت

پـێش هـەردو نوونـان سەجدە بـت

ڤێکـرا بـوێرن صـوحبەتـێ

ئـێ گـۆیێ مـەیـدانێ تـە بـت　　وەک مـن د زنـدانێ تـە بـت

سـەربـەنـدێ چـەوگـانێ تـە بـت　　مـەجرووحـێ پـەیکـانێ تـە بـت

یـەغمـا و تـالانێ تـە بـت　　هـەر رۆژ ژی قوربـانێ تـە بـت

بیمـارێ موژگـانێ تـە بـت　　دائـم د فـەرمـانێ تـە بـت

حـەبـسی د زنـدانێ تـە بـت　　موشـتاق و حـەیرانـێ تـە بـت

سـوهتی ژ هجرانـێ تـە بـت　　دێ مـەسـتێ فنجـانێ تـە بـت

وی بـەهـر د نیـشانێ[٣] تـە بـت　　مووچـە ژ بـەر خـوانێ تـە بـت

لـێ لوطـف و ئحسـانێ تـە بـت

هـەر دەم بخـوونی حـەضـرەتـێ

جامـان ب ئـەغیـاران نـەدی　　خـەمـرێ ب خوونخـواران نـەدی

وەردان ب مـورداران نـەدی[٤]　　وان رێ د گـولزاران نـەدی

رەیحـان وگولنـاران نـەدی　　بـۆ وان دژەن[٥] خـاران نـەدی

تـو رەمـز و ئـەسـراران نـەدی　　کـۆران[٦] تـو ئـەنـواران نـەدی

(١) یاری ژ کول پێ پەردە بت (پاشا، یووسفی، عەمەر).
(٢) جەمال ژێک (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) بەهر ونیشانێ (پاشا) مهر ونیشانێ (کۆڤلی) بەهرێ نیشانێ (عەمەر).
(٤) دووران ب مرواران نە دی (کۆڤلی).
(٥) ژ ژەین (زڤنگی، ئامێدی)، وەر دو زەرین (کۆڤلی)
(٦) گەر وان (کۆڤلی).

ئـــــازارێ مهـــــرداران نــــــەدی　　لــێ دەســـتێ بـــەدکـــاران نـــەدی
ب نوونـــــەکــــێ یـــاران نـــــەدی　　نێـڤ مـە و خـوە ئـەسـتاران نـەدی
تیـــــران ژ نووبــــــاران نـــــــەدی　　وەردان[1] ب بیمــــــاران نـــــــەدی

ژ غــەیـری سـێ جـاران نــەدی
ڕیـــشن نـــەدیـــرن طاقـــەتـــێ

بـەس عاشـقان مــەهجـوور بکـی　　شـوبهەت مـەلـێ ڕەنجـوور بکـی
قـەلبـێ شـکەسـتی هـوور بکـی　　شـــوونا برینـــان کـــوور بکـــی
شـەمعا مـە ژێ[2] پوڕ نـوور بکـی　　ب زەهـرێ خـوە مـەئمـوور بکـی
تـەنها مـە بـێ دەسـتوور بکـی　　مـەحـرەم سـەرایـێ[3] حـوور بکـی
ب وەصلا خـوە دا فـەغفـوور بکـی　　ژ وێ بـادەیـێ مـەخمـوور بکـی
نێـڤ کاسـەیـا فـەرفـوور بکـی　　دالان ژ خـــالان دوور بکـــــی
دێمـی ژ ڕەنـگ کـافوور بکـی　　فـەیـضێ ل دل دا فـوور بکـی

بـەس عالـەمـێ مـەقهـوور بکـی
وەقتـێ سـەحـەرگـەهـ بـا دەتـێ

(١) دەردان (ژڤنگی، ئامێدی).
(٢) شەمعێن تو دێ (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی)، پێ (ژڤنگی، ئامێدی).
(٣) ب دیتنا من ئەڤ نیڤ مالکە هۆسا بێتە خواندن: " مە حەرەمسەرایێ حوور بکی " دورستترە؛ چونکوو (حەرەمسەرا) د فارسی دە حەرەمخانەیە کو ئەم دبێژنێ: (ملێ مالێ) جهێ ژن لێ ژ مالێ. ئەڤە ژ ئێکا ڕامانێ ڤە موکومترە وچێتر دکەفتە نەقلا مالک ونیڤ مالکێن بەری خوە ژی [ئیسماعیل تاها شاهین].

## ئیرۆ ژ نوو پوڕ ئاتەشم

ئیرۆ ژ نوو پوڕ ئاتەشم          دیسا ژ ڕەمزا دلبەرێ
مەجرووحێ قەوسێ پوڕ وەشم[1]          تیر دانە نیڤا جەگەرێ

تیر دان ژ قەوسێ ئەسوەدە          شەهزادەیا شیرین قەدە
کوشتینە وەک من دەه[2] سەدە          وێ پادشاه و بەگلەرێ

وێ بەگلەرێ پوڕ کوشتنە          ئەنگوشت ب خوونێ ڕشتنە
ما ئەهلی دل قەط هشتنە؟!          سوهتینە مثلی مەجمەرێ

لێ ئەز تنێ[3] سەر تا قەدەم          یەکسەر دسوژم دەم ب دەم
وەصفێن د عشقێ[4] ئەز چ دەم؟          نایێن حساب و دەفتەرێ

وەصفێن ئەڤین و عشقەهێ          حوسن و جەمالا وێ شەهێ
نایێنە شەرح و مەدەهێ          ئەحسەن ژ نەقشێ بەششەرێ

ئەحسن ژ حوسنا دێم دوڕێ          شیرینی و[5] گوفت و سوڕێ
سەد زاهد ئێخستن ژ ڕێ          وێ نازک و لەب شەککەرێ

شەککەر د نێڤ لێڤانە وێ          ڕەیحان ل دۆر سێڤانە وێ
مەشعەل د نێڤ شێڤانە وێ          تەیسی ژ ڕەنگێ فەنەرێ

---

(١) پەڕوەشم (ئامەد).
(٢) چەند (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) من جان هەمی (کۆڤلی).
(٤) وەصفێن ئەڤینێ (ئامەد).
(٥) شێرینییا ( عبدالسلام).

فـــەنـــەر نیـــە نـــوورا حـــەقـــە حوســـن و جـــەمـــالا موطلـــەقـــە
بـــەرقـــا ســـپێدە و شـــەفـــەقـــە زوهـــــرە و شـــــەمـــــسا خـــــاوەرێ

زوهـــــرە و ماهـــــ و مـــوشتـــــەری مـــن دیـــن ل دێمـــێ ئـــەنـــوەری
زولفـــا موســـەلـــسەل عـــەنبـــەری ســـەر دایـــە حـــەوضـــا کـــەوثـــەرێ

حـــەوضـــا ژ کـــەوثـــەر چـــەشـــمە تـــێ یـــا جهـــ د رەوضـــا قـــودرەتـــێ[1]
هـــەردەم ژ نـــوورێ[2] ســـەر دەتـــێ[3] خـــەمـــری وتـــاییێن عـــەرعـــەرێ

خـــەمـــری ب ڕەش بـــسکا[4] حـــەریـــر وەربـــــوون ل دۆر بـــــەدرا مـــــونیر
بورجـــا کـــو حـــاکم لـــێ دو میـــر مـــن دیـــن ل تـــەختـــێ کـــشوەرێ

تـــەختـــێ دو[5] میـــر و بـــەگلـــەران مـــەیـــدانێ جۆقـــا گـــۆی گـــەڕان[6]
ئـــەصـــلان و جـــۆتێ مـــەی خـــوەران مـــەی دان[7] شـــەرابـــا ســـاغەرێ

ساغەر ب دەست سەرخوەش و مەست وەقتێ سەحەرگەهـ دەست ب دەست
غەفلەت دو بەگلەر مەی پەرەست کوشـــتم ب دەربـــا خـــەنجـــەرێ

کوشـــــتم ب دەربـــــا کـــــەیبـــــڕان گـــەزمـــە و خـــەدەنگـــا ئـــاوڕان[8]
رەمـــــز و ئـــــشارات و ســـــوڕان دان دل ژ نێڤـــــا پـــــەنجـــــەرێ

---

(١) نەقشێ ژ صونعێ قودرەتێ (ئامەد).
(٢) نوو وێ (زڤنگی، ئامێدی).
(٣) سدرەتێ (کۆڤلی).
(٤) زولفا (زڤنگی، ئامێدی) خەمری و ڕەش بسکا (ئامەد).
(٥) د (حەلەب، هەژار).
(٦) گۆ گەڕان (ئیسماعیل، ئامەد، عبدالسلام، حەلەب).
(٧) دادەران (حەلەب) من دی د شوربا ساغەری (ئامەد).
(٨) وان (حەلەب) دا (عبدالسلام).

دان[1] دل ژ بـەر حوسـنا ب نـوور
لـەو سـوهتيەم وەک كـووهێ طـوور

بـەرقـا تـەجـەللايـا صـودوور
حوبـب و ئـەڤينـا ئـەنـوەرێ[2]

حوبـا تـە مـا خـوەش هـشتمە
يـەكـسەر ژ خـوونێ رشـتمە

هـەر رۆژ ژ نـوو ئـەز كوشـتمە
تيـر و خـەدەنگـێن مـەجـەرێ[3]

گـەزمـێن د شـيرين نـازكێ
چووينـە نێـڤ دل گـازكێ

دەربـێن د وێ رمبـازكێ
مـن داد ژ ظـولمـا دلبـەرێ

دلبـەر چ بـێ حـەد ظالمـە
لازم ب حـالى عالمـە

جـارەک نـەكـت[4] پورسـێ ل مـە
لـێ پـور ددیـرت غـەدەرێ

لازم ب قـەتـلا مـن دڤـى
پـەيكـان د جـەرگـى دا چـەڤـى

هێـژ ئـەڤ د دل مـارێ شـەڤـى
بـەنـدكر ب شـەوكـا عـەنبـەرێ

بـەنـدكر كـولاب و پـەنجـەيـان
مـن ئاهـ ژ دەسـت وان غـەنجـەيان

دل مـا د نێـڤ ئـشكەنجـەيـان
كـۆک و كوبـارێن دينبـەرێ

رەمـز و سـورێن شـيرين لـەبـان
رێـزا موسـەلـسەل عـەقـرەبـان

تيرێـژ[5] و بـەرقـێن كـەوكـەبـان
گـەر دان ل دۆرا قـەمـەرێ

مـن ديـن ل دۆر بـەدرا تـەمـام
وێ پيـشرەوێ بـاطـن رەڤـام

حـەرفـێن د مـەكتـووب دال و لام
يـەغمـا كـرم سـيمين بـەرێ

(١) وێ زەرێ (هەژار).
(٢) د (پاشا، يووسفى، عەمەر) خەمر و (كۆڤلى).
(٣) قەچچەرێ (ئامەد، كۆڤلى).
(٤) نەكر (ئامەد).
(٥) تيرۆژ (زڤنگى، ئاميّدى).

سـیمین بـەرا نـەیـشەککـەری		ئـەو حووریـیا نـسبەت پـەری
بـەژنـا شـیرین دێمـێ زەری		بـوو ژ گـولاب و مـاوەرێ[1]

بـوو مـاوەر و شـیرین لـەبـێ		وێ خـووب و نـوورین غـەبغـەبـێ
بـەدرا د بورجـا عـەقـرەبـێ		کـەنگـێ ژ بـەر پـەردێ دەرێ

بـەدرا[2] ژ قـودرەت لـێ دو نـوون		ئـەو قـاتلا ئـەسـوەد عویـوون
پـورِ ڕاکـرن وێ قـەتـل و خـوون		عالـەم پـەریـهـت یـەغماکـەرێ

هـەر دەم ب ظـولمێ وە دسـوژی		قـەلبـێ ژ حوبـا تـەی تـەژی
لازم دبـێم مـن دێ کـوژی		کـەس نینـە چیـتن مـەهـدەرێ

کـەس نینـە رەت مـەهـدەر بکـت		بـەس گرتییـان ئـەبتـەر بکـت
خـەملـێ ژ زێـرێ زەر بکـت		شـەفقـەت ل یـەکتـا بـدەرێ[3]

شـەفقـێ ب دیـدارێ خـوە کـت		قـەسـتا برینـدارێ خـوە کـت
شـەهیـدێ ڕەشـمارێ خـوە کـت		ئـێ سـەر ل فـەتـلا پیـشتەرێ[4]

فـەتلـێن سـیەهـ مـارێ شـەڤـین		رەیحـان ب دۆر سـەر وان چـەڤـین
ئـاخر ب سـەلـوێ دا ڕەڤـین		خـەف بـوون د تـایێ چـەنبـەرێ

خـەف بـوون د نێـڤ تـۆرا قـزل		ئـیلان مشـالـن سـەر ل مـل
کوشـتین و ژەهـر ئاڤـهتـە دل		هێـژ کوشـتییێن ڕەمـزا بـەرێ

---

(١) طـەعن دا زەباد و ماوەرێ (ئامەد).

(٢) بەرقا (عبدالسلام، حەلەب، پاشا).

(٣) نەددرێ (پاشا، یووسفی، عەمەر، حەلەب) نەظـەرێ (کۆڤلی).

(٤) شەنپەرێ (کۆڤلی).

کوشـــتینه ئـــەم شـــیرین لـــەبـــێ تـــەحلـــي کـــەشـــین رووز و شـــەبـــێ
گـــەر ئـــەز ببیـــنم ئـــەو ب خـــوه بـــێ نـــــــاکم ژ دل هێـــــــژ بـــــــاوەرێ

ئـــــەو نازکـــــا نـــــسبەت گـــــولێ جامـــەک ژ کـــەوثـــەر دا مـــەلـــێ
مـــەســـتم ژ بـــەر (قـــالوا) بـــەلـــێ حـــــەتتـــــا ب رۆژا مـــــەحـــــشەرێ

## ڤێ فورقەتێ ئەبتەرکرین[1]

ڤــێ[2] فورقــەتــێ ئــەبتــەر کــرین          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ
ژار و ضـــــەعیـــــف و زەر کـــــرین          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

پـــورِ زەرکـــرین وەک زێـــرِ مـــام          چـــەهڤـــێن ب لـــوطفێ پیـــر مـــام
دائـــــم ژ رِێ چـــــاڤنێر مـــــام          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

چـــاڤنێری رِەفتـــارا تـــە بـــووم          موشـــتاقی گـــولزارا تـــە بـــووم
لـــەو دوور ژ دیـــدارا تـــە بـــووم          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

دووربـــووم ژ وێ رەفـــت و چـــونێ          وان عـــشوەیـــان گوفـــت و کـــەنـــێ
نـــایێ ب چـــەهڤـــان مـــن دنـــێ          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

دونیـــا ب مـــن مـــژ بـــوو غـــەمـــام          خـــەو ژی ل چـــەهڤـــان مـــن حـــەرام
عـــومرەک ب ڤـــی حـــالێ هـــە مـــام          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

ســـاعەت ل مـــن تێـــک ســـال بـــوون          دائـــم ل ســـەر دەســـت فـــال بـــوون
حـــەرفـــێن دهـــاتن دال بـــوون          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

ئیـــرۆ تنـــێ دەر هـــات ئـــەلیـــف          مـــەعنـــا دچـــوو بـــەژنـــا شـــەریـــف
یـــا خـــارە لـــێ کـــەمخـــە و قـــەدیـــف          فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

(١) هەژار ل وێ باوەرییێ یە کو ئەڤ شعرە نە یا جزیرییە [ئیسماعیل تاها شاهین].
(٢) وێ (پاشا، ئیسماعیل، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی، عبدالسلام).

ڤـێ فورقـەتـێ پـوڕ دل شـەواند جـەرحـێن قـەدیـم دیسا کـەواند
شیـشێن د سـۆر تاتـا طـەواند فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

داغـێن مـە دیـسا ڕەشـکرن یـەک یـەک ژ نـوو ئاتـەش کـرن
لـێ زێـدە پـەنـج و شـەش کـرن فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

سـەوداء وسـەوس[1] وگێـژ کـرم پـوڕ هـەر د دل خـوونڕێژ کـرم
چـەنـدان وە بـووم لـێ هێـژ کـرم فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

(باللـە) ژ نالـە و زارییـان گـەزمـێن د وان خومارییـان
خـەو نـاکرین شـەڤ تارییـان فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

شەڤ بوو د نێڤ[2] چەشمێن مە دا حـەتتـا بـەشـیر[3] مـزگین ددا
دێ بـێ سـەحـەر شـاهێ گـەدا فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

مـزگین کـو دا مـن ئـەڤ قـەدەر رووحـێ شـرین مـن هاتـە سـەر
خـەیلـەک ل مـن ڕۆن بـوون بـەصـەر فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

ڕۆن بـوو ب دیـدارا تـە دل بـوو غـەرقـێ ئـەنـوارا تـە دل
نـارەت ژ فـەروارا تـە دل فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

مننـەت مـە دلـدارێ خـوە دی دیـسا ژ نـوو یـارێ خـوە دی
سـولطـان و خونـدکارێ خـوە دی فـەریـاد ژ دەسـتێ فورقـەتـێ

ڕەش کـاکولێ سـونبول چـەڤـین مننـەت مـە دیـسا غـەم ڕەڤـین

---

(١) وبێ هۆش (حەلەب) صەوص (عبدالسلام).
(٢) دنێ زڤنگی، ئامێدی).
(٣) ب سەر (پاشا، یووسفی، کۆڤلی، عەمەر).

نوو بوو ل دل حوبب و ئەڤین … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

دەردێ غەدار بێیم فورقەتە … فورقەت ژ جان پورِ زەحمەتە
یا سەهل کو عاشق روح دەتە … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

نارێ فراق وسوهتنێ … ئێشا خەدەنگا نوهتنێ
پورسکن ژ عوششاقان تنێ … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

عاشق ئەون هەر دەم مرن[1] … چەند یەک د رەمزێن دلبەرن
کەیبِر ل دل من بهترن … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

نارێ فراق و سوهتنێ … ئێشا خەدەنگا نوهتنێ
پورِس کن ژ عوششاقان تەنێ … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

شەوقە ب رەمز و ئاورن … عاشق هەرۆ جارەک مرن
لەوا کو ئەو هەر دلگرن … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ[2]

یا رەب ب دیدارا خوە کی … من واصلێ یارا خوە کی
بەس سوهتییێ نارا خوە کی … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

مە ژ دۆستێ ساتەک دوور نەکی … پەرکەندە و مەهجوور نەکی
دیسا ژ نوو دل هوور نەکی … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ

کەیبر دهاتن صەد وەلێ … هاتییە نێڤ ئەحمەد دلێ
لەو کوشتنە سەد وەک مەلێ … فەریاد ژ دەستێ فورقەتێ[3]

(١) هەر دمرن (عەمەر، یووسفی، زڤنگی، ئامێدی، عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٢) ئەڤ چارینە و یا بەری وێ ل نک (ئامەد) ب تنێ هەیە.
(٣) ئەڤ چارینە ل نک (ئامەد) ب تنێ هەیە.

خاکـــا ڕیيـــا دلبـــەر مـــەلا　　　　بکـــشین د چـــەهڤـــان وەک جـــەلا
دیـــدار قـــسمەت بـــوو هـــەلا　　　　فـــەریـــاد ژ دەســـتێ فورقـــەتـــێ

## دەر حەق مە

دەر حـەق مـە ب شـیرێ خـوە مـەکـە تـەقـصیرێ
نابـت[1] د شـوغلا مـە بکـی[2] تـەئخیـرێ
طـوغرایێ هومـایوون کـو دکـن طـوررەیـێ ئـەمـر
زولفـا تـەیـە ئـانین[3] ژ خـەطـا تـەحریـرێ
حوسـنا تـە نـزانم ب چ تـەشبیهـ بکـم؟
(فـي أحـسن تقـويم) لـەو هاتییـە تـەفـسیرێ
سـرا تـە ل دێـم ئایـەتـێ کوبرایـە نـەشـێم
لـێ نـەقـل و روایـەت دکـرم تـەغـسیرێ[4]
گـەر قـەلبـێ حـەقیقـەت نییـە یـەکجـار چـڕا
عـشقا تـە کـرین زیـر و زەبـەر ئکـسیرێ؟[5]
مـا قـودرەتـێ دەفعێ هـەیـە وەر شـێرێ عـەلـی بـت
لامـع کـو بـدت صـاعقەیـا تـەقـدیرێ؟
بـێ قـودرەتـێ تـو قـووەتـێ مـەخلـووقی چ کـت؟
مـەمنووعـە ل نـک عـەقـل کـو بکـت[6] تـەئثیـرێ

(١) بابیت (پاشا، حەلەب، عبدالسلام، وەستانی) یابیت (زڤنگی) بابت (عەمەر) یا بێت (یووسفی).
(٢) بکن (پاشا، کۆڤلی، عەمەر) نەکن (یووسفی).
(٣) ئانی (پاشا، یووسفی، عەمەر، کۆڤلی).
(٤) بێ نەقل وروایەت بگرم تەفسیرێ (کۆڤلی) تەفسیرێ (عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٥) زێرێ ژ بەر ئکسیرێ (ئامەد).
(٦) عەقلێ دکت (پاشا، عەمەر، یووسفی) عەقلی بکت (کۆڤلی).

نـەی[١] بـەسطـێ طلـسمێ مـە[٢] ب سـەد خانـە بـرت
قـــادر هـــەیـــە عـــارف بکـــرت تـــەقریـــرێ !؟
بــەر دلبــەر و لــەب بــەر لــەب و ئــەنــدام ل یــەک
خـــەونـــا مـــە ب یـــارێ بـــدنێ تـــەعبیـــرێ
ذاتـــی ژ ووجـــوودا مـــە ســـەبـــەب وێ تـــو دزانـــی
نائێتـــە حـــسابێ فـــەلـــەکـــێ تـــەدویـــرێ
ئاتـــەش پـــەرەســـێ وادییـــێ عـــشقین و عـــەجـــەب
دیناڕپـــــەرەس[٣] وێ دبـــــرن[٤] تـــــەکفیـــــرێ
محرابـــــێ دو بـــــرهێن تـــــە ببینـــــت عـــــارف
نییـــەت چ ب جهـــ بـــت دەمـــا تـــەکبیـــرێ[٥]
زانـــم تـــە چ مـــزراق ڤ دل کـــەفتییـــە لـــێ
جـــــارەک تـــــو گـــــۆیی د دەربـــــێن تیـــــرێ
تـەقـدیرێ کـو حـوکمی[٦] ل مـەلـێ جـاری کـت[٧]
قـەط کـەس هـەیـە مـومکن بـدتێ تـەغییـرێ؟!

---

(١) بێ (ئامەد).
(٢) تە (عبدالسلام).
(٣) دنیا (عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٤) دکرن (ئامەد).
(٥) تەکثیرێ (پاشا، عەمەر).
(٦) حەکیمی (ئیسماعیل).
(٧) کت جارەک (ئامەد).

# مزگین ژ مەڕا بێت

مـــــزگین ژ مـــــەڕا بێـــــت ژ ســـــوڕ شـــــرینێ
جـــانێ خـــوە یـــێ شـــیرین ددرم مزگینـــێ
سـەد چـین د خـوە دا گرتییـە زولفـا تـە ب چـین[1]
شـعرا مـە[2]وە حـەق لـەو چـوو حـەتـا مـاچینێ
نـەقـشێن فـەلـەکـان[3] گوهـ ددرن ڤـێ نـەظـمـێ
تـەنهـا نـە بـەشـەر هـەر دکـرن تـەحـسینێ[4]
عـــشقێ ژ خـــودێ دا تـــو بخـــوازی ژێـــڕا
گـــەر دێ ل نـــەیـــارەک[5] خـــوە بکـــی نفرینـــێ
یـەک سـەجـدە تنـێ فـەرضـە د دینـێ عـشقێ
بـــن بـــەر قـــەدێ یـــارێ د مـــەجـــالێ دینـــێ
عاشـــق کـــو ب دل فاتحـــەیـــا عـــشقێ خوانـــد
ئایـــات یـــەکـــا یـــەک دکـــرن ئـــامینێ
مـە ژ لـەعلێ لـەبێ یـارێ[6] ڤـەخوار ئـاڤێ حەیات
ئـــەغیـــار بـــلا تێـــک بچـــن دارینـــێ[7]

(١) چینا یەکێ وەلاتێ چینێیە ، و چینا دووێ خەلەکێن زولفانە.
(٢) د (حەلەب، عبدالسلام، وەستانی).
(٣) نەفسێن مەلەکان (کۆڤلی).
(٤) خەلکێ جزیرێ دگۆتن : مەلایێ جزیری سەد دیوان هەبوون، ئێک یا مایی و نۆت و نەهـ ملیاکەتان یێن برینە عەسمانان!!
(٥) تو ل یارەک (عبدالسلام، وەستانی، حەلەب، کۆڤلی، پاشا).
(٦) یارێ خوە (زڤنگی، ئامێدی).
(٧) ضالینێ (ئامەد).

لازم ب خـــوە ئايينـــەيـــێ (روح القـــدس)ى تـــو
لـــەو كـــەس نـــەديـــين حـــووری ب ڤـــێ ئـــايينێ
جـــائز ب تـــە (مـــن حيـــث البـــشر) نـــسبەت دان[1]
بهـــن و شـــەفـــەق و نازكييـــا نـــەســـرينێ
ئـەڤ ڕەنگـە فـەصـاحەت ژ بـەشـەر سـحرێ حـەلال
ئعجـــازێ بـــەيـــان ئانييـــە بـــەر تـــەدوينـــێ
دا نالـــە و ئـــاهێن مـــە ژ دل صـــەح[2] بكـــری
وەر گوهـــ بـــدە هنـــداڤی ســـەرێ بـــالينێ
فـــەرهـــاد دزانـــت تـــو ژ پـــەرويـــز مـــە پـــورس
ئـــەطـــوارێ غـــەمـــێ عـــشق و ســـوڕا شـــيرينێ
بـــێ[3] نوقطـــە نـــەهـــن دائـــرە ئحـــسان كـــە مـــەلا
دەووار چ كـــت دائـــــرەيـــــا تـــــەكـــــوينێ!

(١) من حيپ بشر دێ بتە نزبەت بدرن (كۆڤلی).
(٢) سەە (عبدالسلام، حەلەب، وەستانی).
(٣) لێ (پاشا، يووسفی، عەمەر، كۆڤلی).

# چارینە

قـەوسـێ تـە[1] هلالـی ب دەلالـی کـەشـها
بـەژنـا تـە ژ شـەنگـی ب دەرەنگـی مـەشـها
مـارێ ژ حـەریـرێ د عـەبیـرێ خـوەشـها
مـاوەر بـوو ژ وان زولفـێ د زەنگـی وەشـها[2]

شمـشاد خـەرامـی کـو د جـامێ مـەی دا
جامـا ژ شـەرابـێ ب گـولابێ هـەی دا
سـەد هاتنـە قوربـان و موطـربـان نـەی دا
دۆر هاتـە طـلسمێ مـە ب ئـسمێ حەی دا[3]

سـەردەفتـەرێ وەصـفێن تـەیـە دیباجـەیـێ دل
یەک قەطـرە ژ لوطـفا تـەیە سیراجەیـێ[4] دل
ذکـرێ تـە دکـت دورِ و ضـیا لـەهجـەیـێ دل
طـەیرێ نەفەسا های و هوویا لـەهجـەیـێ دل[5]

---

(١) د (ژڤنگی، ئامێدی).
(٢) عەنبەر تە ژ زولفان مە ژ گەرەفـان وەشـها (کـۆڤلی)، وئـەڤ چارینـە ل نـک (کـۆڤلی، زڤنگی، ئامێدی) ب تنێ هەیە.
(٣) ئەڤ چارینە ل نـک (کـۆڤلی) تنـێ هـەیە، یـەکا وەکـی وێ ل نـک (زڤنگی، ئامێدی) هـەیە لـێ ب چـەند گوهۆرینان ڤە، دەقا وێ ل نک وان ب ڤی رەنگییە:
شمشاد و خەرامەک کو مە دی بوو سەحەرێ جامـەک ژ شـەراب ب مە دا وێ قەمەرێ
تـیـرەک کـو ژ قـەوسێـن دوی دا جەگەرێ قـوربـانێ خوە کر جانێ شیرین روخ فەنەرێ
(٤) (سەراچە) ئەز پتر بەگەم دکم، وسەراچە خانییێ بچووکە، و ل بنێ گوهییـە (سراجەیێ) بت چونکی (ضیا) پشتی هنگی هاتییە [ئیسماعیل تاها شاهین].
(٥) ئەڤ چارینە ل نک (کۆڤلی، ئامێدی) ب تنێ هەیە.

ئامـانجێ خـەدەنگێن تـەيە مـن شيـشـەيێ دل
دائـم ئـەوە هـەر مـن غـەم و ئـەنديـشـەيێ دل[1]
ئاتــەش درەشــينت قــەبــەســى پيــشـەيــێ دل
هنگــى ل خــەيــالێ بــدەرم تيــشـەيــێ دل[2]

پــەردە حــەبــابى ب حجــابێ تــە ڤــەدائــين
سەروى د چـەمـەن دا و د بـەنـدا هـەوە دا ئـين
هەر چەندە تو ميرى مە فەقيـر و مـە گـەدائـين
زانـى ژ گيـانێ خـوە ب جـانێ خـوە فـدائين[3]

خالا تەيە مشكين كو بوويە نوقطـەيێ نوونـان
وەک ئسم وطـلسمان بوويە تەعويذێ عويوونان
چـەشـمێن د سـيەهـ ڕادكـرن فتنـە و خوونـان
لەو خوون ژ دو چەهڤێن مە دزێت[4] شوبهى عويوونان

يـەنگى تـە ژ شـەنگى ب دەرەنگـى[5] وە كـەشـاندن
سەد تير و خەدەنگى ب چ ڕەنگى تە ڕەشـاندن
سەرپەنجە ب ئشكەنجە تە وەک غونچە لڤانـدن[6]
هەستى وە ب مـەستى ل مـە ڤێـڕا هـەڕشـاندن

---

(١) دائم ئەوە هەر موراد وئەنديشەئێ دل (ئامێدى).
(٢) ئەڤ چارينە ل نک (کۆڤلى، ئامێدى) ب تنێ هەيە.
(٣) ئەڤ چارينە ل نک (کۆڤلى، ئامێدى) هەيە.
(٤) درت (ئامێدى) وئەڤ چارينەژى ل نک (کۆڤلى، ئامێدى) هەيە.
(٥) يەنگى قەدى شەنگى بەدر ڕەنگى (ئامێدى).
(٦) ل دل دان (ئامێدى) وئەڤ چارينەيە ل نک (کۆڤلى، ئامێدى) ب تنێ هەيە.

کالان: کاڤلانێ شیری بت یان یێ خەنجەرێ (الغمد).
ئەڤستن: ئەڤەنە.
رەزم: شەڕ ؛ جەنگ.
گەزم: تیر (السهم).
سەرعەسکەر: سەرلەشکەر.
ماهروو: (ف) ڕوو وەکی هەیڤێ ب شەوق و جوان؛ سیما هەیڤ (الوجه القمری).
نەوبەتدار: (ع.ک) نۆبەدار، زێرەڤان.
بیدار: (ف) هشیار.
رەهرەو: (ف) رێبار؛ گەریدە؛ یێ خوە ب رێکا سۆفیاتییێ کری.
سەمەند: (ف) هەسپێ شهزەر (جواد أصفر اللون).
مەشعەلدار: (ع.ف) خەتیرەهلگر.
قەنتار: (ع) دەوارێن د کاروانیدە پێکڤە گرێدایی، کو هەڤسارێ ئێکێ ب پشتا یا دیڤە گرێدایی.
هەلا: (ف) پەیڤەکە بۆ هشیارکرن و گازیکرنێ ل کارە، ڕامانا (هەی، ئەها) ددت.

## دلبەرێ ئیرۆ سەحەر

دۆخ: دۆق.
زۆخ: کێم و عەداب، ئاڤەزۆخ.
عەقیق: (ع) بەرەکی ب ڕوویە، بۆ جوانییێ دئێتە ب کارئینان.
ئەرغەوان: (ف) سۆرێ بەنەفشییە، د بنیاتدە دارە.
شەپال: شەنگ و شۆخ، باراپتر د گەل (شۆخ و شەنگ) ل کارە.
ئێدەک: د بنیاتدە هەسپەکی زێدەیە، بەرێ خوندکار و مەزنان د ڕێبارانده ددانە دوو هەسپێ لێ سوار، دا ئەگەر هەسپێ وان وەستیا ل وی سوار ببن (الجواد الاحتیاطی). ل ئێرە ب ڕامانەکا مەجازی هاتییە کارئینان. زڤنگی دبێژت: جوونە خشرەکی ژنان یێ زەمانێ جزیرییە و مە نەدیتییە. هەژار مەخسەدا جزیری، ب ئێلەک و زەخمە تێ دگەهت.
یۆخ: (ت) نینە.
سەهل: ئەردێ ڕۆخ و هەرِفتەک.
پلۆخ: پەلێ مەزنێ ئاگری.
کلۆخ: سەر یان کلۆخێ سەری ب خوە (الرأس أو الجمجمة).

## هەیْ هەیا رەقص وسەمایا تە / ٣٥

هەی هەی: قەرەبالغا کەیف و خوەشییێ.
نەرخ: (ف) بها(ثمن، قیمة) د کرمانجییا ژێریدە (نرخ)ە.
کەرخین: تەزتەزینککرتن، رەقبوون (تخدیر).
مەرخ: (ف) [مەرغ] گیایێ تەرش و دەوار دخون. زڤنگی ب (شیفک و کەند و کۆرێن ل سەر لێڤا ڕۆباری چێ دبن ژ بەر ڕابوونا ئاڤێ) مەعنە دکت.
شەععار: (ع) تێرشعر و سەرهۆستایێ شعرێ.
شال: شووتکەکە ژ هرییێ، حەژخوەکری ژ ژن و زەلامان دئاڤێنە پشتا خوە. پتر ل بەهدینان [ڕەخێ زاخۆ] و هەکارێ و بۆتان بەلاڤە.

## سرڕێ وەحدەت

رسد: (ف) گەهشت.
گوفت و گووی: (ف) دان وستاندن؛ گەنگەشە.
خرەد: (ف) ئەقل، هش.

## عیدە وهەر کەس

پەرەنگ: پەل (جمرة).
پیرەمەرد: (ف) پیرەمێر.
جەرید: (ع) پەلەندار. ئەو دارە ئەوێ سوار ل سەر پشتا هەسپان د یارییا جەریدێدە د ئێکدو وەردکن.
نەینک: عەینە، ئایینە، قۆتیکا ڕۆناهییێ.
موعەمما: (ع) مەتەل، مامک (لغز).
ئەر: (ف) سڤککرن و کورتکرنا (ئەگەر)ە.
وەر: (ف) سڤککرن و کورتکرنا (ئەگەر)ە.
هشتن: هێلان.

## نەیشەککەرا گەردەن ژ عاج

ئەفراسیاب: خوندکار و قەڕالێ ترکستانێ بوو.

ڕۆستەم: ناڤێ قارەمانەکێیە د شاهنامەیا فردەوسیدە هاتییە. چیرۆکا ڕۆستەمێ زال د ناڤ کوردانده ژی پڕ ناڤدێرە.
سروقد: (ف) بەژنکێل، کەسێ بەژنا وی وەکی یا دارا سەروێ.
زەباد: (ع) بێن زەباد. زەباد ماددەیەکا بێنخوەشا ڕەشە وەکی ڕوونییە، ژ جانەوەرەکی وەکی کتکێ دەردئێخن، ب عەرەبی دبێژنە ڤی جانەوەری (سنور الزباد، رباح).
چەنبەر: (ف) چنبل (عروة).
جادوو: (ف) سێرەکەر، سێرەبەند (ساحر). کنایەتە بۆ چاڤێن دلبەرێ.
ئەبروو: (ف) بروو، برھ (حاجب العین).
قاف: چیایەکی ئەفسانەییە د دەریاییێدە، ل دۆر هەمی دنیایێ وەرهاتییە (جبل خرافی).

## ئاهـ ژ دەستێ وێ سورێ

نەستەرەن: (ف) گولنەسرین.
ژاله: (ف) خوناڤ.
لف: دەرسۆکا ل سەری گرێددن.
شەتری: زڤنگی دبێژت: چەکەکی جوانییێیە بۆ سەرێ ژنان.
کەسک و سوهر: کەسک و ئالا، کەسک و سۆر (قوس قزح).
سەفینە: هەژار دبێژت: د زاراڤێ مەیخوەرانده پەرداغا تەژییە ژ مەی.
قولزوم: (ف) دەریا (بحر).
قەبالە: (ع) تفاقەکە د ناڤبەرا دو کەسان یان پتر دئێتە کرن، ژ بۆ ب سەرێکڤەئینانا کارەکێ بەرانبەری پارەیەکی ڤەبری (قبالة).
دەنگز: (ت) دەریا؛ بەحر.
سڕ: (ع) سوڕ ژی ل کارە. ڕامانا جوانی و خشکۆکییێ ددت.

## دەرێ مەیخانەیا عشقێ

ماهێ نەو: (ف) هەیڤە د چەند ڕۆژەکێن پێشییێدە وەکی دەڤێ داسێ دیارە (الهلال).
چەرخ: ئەسمان، فەلەک.
خوان: سفرە؛ سمات (المائدة).
رووزەهـ: (ف) ڕۆژی (صیام).

دەلق: (ف) جلکەکی تەژی پینە و پەرۆیە، دەرویش و سۆفی دکنە بەر خوە (خرقة الزهاد).

## خەلقۆ ل من کن شیـرەتێ

جانەوەر: هەر تشتەکی خودان روح. باراپتر بۆ حەیوانان (بچووک و مەزن) ل کارە.
خومار: (ع) سەرخوەش (سكران).
سپاه: (ف) لەشکەر (جیش).
غەبغەب: (ع) بەرکور، بەرچێلک. غەبەب ژی ل کارە.
زیر و زەبەر: (ف) سەرێک و بنێک؛ سەرابن (المقلوب رأساً علی عقب).

## ئەێ مەلا نامێ تەیە

سەمت: (ع) رەخ؛ ئالی؛ هێل (جهة، جانب، طرف).
بطـاط: (ع) دەرەو، د عەرەبیدە (بطـط) رامانا نەشیا و پێ چێ نەبوو یان پێڤە وەستیا ددت.
پا: (ف) پێ.
سپەر: (ف) مەرتال (التـرس).

## جانا ژ جەمالا تە

یەغما: (ت) تالان (غارة، سلب).
چاشنی: (ف) جوون؛ تەخلیت؛ رەنگ. شرینی.
تەلەس: (ت) ڤەهەرفتی و خاڤ.
مەگەس: (ف) مێش.

## طوورم بـ دل

پەیرەو: (ف) ئەو کەسە ئەوێ ل دوو یەکی دی دچت و دەوسا وی دگرت (المقتدی).
ئاتەش پەرەس: (ف) ئاگرپەرێس.
فەروار: فەرمان؛ ئەمر. پەیڤا فەروار ب رامانا فەرمان مشە د قەول و سەبەقێن ئێزدییانده هاتییە.
شیش: بست، شیشا ئاسنی.
سەودا: (ع) [سوداء] ئاشق، هەواسەر.

## عاشق ئەر جارەك

ئەیاز: ناڤێ خولامەکی سولتان مەحموود غەزنەوی بوو، ئەڤینا سولتان مەحموود لێ کەڤتبوو.
جان گداز: (ف) جان حەلین؛ روح حەلین.
کەبووتەر: (ف) کۆتر؛ کەڤۆک.
شاهباز: (ف) بازێ سپی.
سایبان: (ف) سهوانەیەکا مەزن بوو، ل هنداڤی سەرێ مەزنان دهاتە ڤەگرتن ژ بەر هەتاڤی. زڤنگی ب (خودانا سیبەرێ) مەعنە دکت.
سرِشرین: (ع.ک) جوانی شرین.
سرو بالا: (ف) بەژنکێل و ڕاست وەکی بەژنا دارا سەروێ.
گول نشان: نیشان شرین یان جوانییا نیشانان ل جوانی و ڕەوشا گولان.
غونچەباز: بشکۆژ و سۆلینا دەڤ ڤەکرییە. کنایەتە بۆ دەڤێ ڤەکری یێ دلبەرێ.
سی: تەیرەکە هەژار ب (قولنگ) ڕاڤە دکت.
عاشق نەواز: (ع.ف) دلبەرا خوە بۆ ئەڤینداری خوە دنازینت.
هنگی: هندی.

## ژ ڕەعنا نێرگزێن تەێ مەست

جەنگ ئەنگیز: (ف) شەڕهلێخ.
جەنگیز: جەنگیزخانێ تەتەرییە (١١٦٧ – ١٢٢٧) ئەوێ ئمپراتۆرییا مەغوولی چێکری. ناڤێ وی یێ دورست (تیمۆجین)بوو. ناڤبەرا چینێ هەتا دەریا ڕەش هەمی ئێخستە د بن لەپێ خوەڤە. ناڤێ وی ب خوونڕێژی و وێرانکرنێ چۆییە.
عەنبەربوو: (ف) بێنعەنبەر.
شەکەرریز: (ع.ف) شەکرڕێژ؛ شەکربار (ناثر السکر).
عەنبەرئامیز: (ع.ف) عەنبەر د ناڤ ڤەدایی و تێکل (مخلوط بالعنبر).
پەرویز: ناڤێ خوسرەوێ دویێ یێ ساسانییە.
نگاهی: (ف) ڕێنان؛ بەرێخوەدان.
مەستێ تەبریز: مەخسەد پێ شێخ شەمسێ تەبریزییە، سۆفییەکی ناڤدێرە، سەیدایێ شێخ جەلالەددینێ رۆمی بوو، ژ بەر غەریبییا بیر و باوەرێن وی، خەلکی بەرگەڕیانا کوشتنا وی کر و ئەوی خوە

ڤەشارت و غەواره بوو.. ل دەڤ کوردێن ئێزدی ژی گەلەک ب قەدر و ڕوویە، ل مەرتەبە و پەییسکا ئیلاهانە دبێژنێ: شێشمسێ تەبریزی، ئێزدی دبێژن: ڕۆژ چاڤێ شێشمسە. (شێشم) ژی ل کارە.

بەدخواه: (ف) خرابی خواز. دلپیس.

بەلازیز: گولەکا جوانە بهاران ل ئەردێن بلند شین دبت. نهۆ هندەک دبێژنێ: بابەلیسک، و هندەک دبێژنێ: بەلالیسک. ئەڤ گولە گەلەک ژیکورتە، ژ بەر هندێ ئەگەر ب نفرین داخوازا ژیکورتییێ بۆ یەکی بێتەکرن، دبێژنێ: (هەیلا عەمرێ تە بوویە عەمرێ بەلالیسکێ).

فتنە ئەنگیز: (ع.ف) فتنەهلێخ (مثير الفتنة).

سگ سرشت: (ف) تبعەت سە (كلبى الطباع والطينة).

بیز: نەفرەت.

دل ئاویز: (ف) دل پێڤەهلاویستی (المعلق به القلب).

ئێگر: ئاگر.

## تو دزانێ ب خودێ

سەرنخوون: سەر ب ژێر.

گەه: جارنا؛ جانا (أحيانا).

شبی: (ع) کورتکرنا (شوبهی)یە، کو ژ عەرەبی هاتییە وەرگرتن و ڕامانا (وەکی) ددت.

## چوومە تەماشا چەمەن

سەمەن: (ف) ئەسمین، گولەکا بێنخوەشە (یاسمین).

غونجە: (ف) خڕ؛ گرۆڤر (مدور، محلق).

سەبەق: (ع) دەرس. (سەبەق) د زاراڤێ ئێزدییاندە، پرتەکە ژ قەولەکێ باراپتر سێ ڕێزکن.

غەنج: (ف) نازدار.

شکەنج: (ف) ئێش و ئازار و ئیزا.

گیسوو: (ف) کەزی (ضفيرة).

گەڕ: خەلەک؛ گەڕی (حلقة).

گولشەن: (ف) باخچەیێ تێرگول.

زەمزەم: (ف) تمتماندن و مەدحکرنا خودێ ب دوعا و درۆزان. دوعایا د مەدحکرنا خودێدە دئێتە خواندن.

یاسەمەن: (ف) سەمەن؛ ئەسمین (یاسمین).
دلنەواز: (ف) دلکێش؛ خوەشڤی (جاذب القلب، محبوب).
ئاسک: خەزال؛ مامز.
چهرە گوشا: (ف) دێمگەش؛ دێمڤەکری.
قبلەنما: (ع.ف) ئالاڤێ (قبلە) جهێ بەرێخوەدانا نڤێژێ، پێ دئێتە دەستنیشانکرن (البوصلة).

## شاهدێ جەلوە نوما

جەلوە نوما: (ع.ف) پێشچاڤ (المتجلی؛ الظاهر).
فیرووزە: (ف) ڕەنگ فیرووزە، ڕەنگ تەبەسی، (فیرووزە لباس) ئانکوو جلک ئەسمانی و تەبەسی.
نەمەک: (ف) خوێ (ملح).
ئەیاس: ئەیاز. ل [عاشق ئەر جارەک] بزڤڕە.
غەراب: (ع) پەرداغا زیڤینا مەیخوەران یان مەشک. د بنیاتدە (غرب)ە ب ڕامانا (الدلو العظیمة) و ل بنێ گوهییە (غوراب)بت ب ڕامانا گەمی (سفینة).
نەهەنگ: حووت، ماسییێ زێدەزێدە مەزن.
حەریف: (ع) هەڤکار؛ هەڤپیشە. ل ئێرە (عاشق)ە.
دەستگیر: هاریکار؛ ڕێبەر.
غەمزە: (ع) ئیشارەتە ب چاڤی یان ب بروویان دئێتە دان (الغمزة).

## دل یەکە

چەلیپا: (ف) خاچ، د بنیاتدە ئارامییە.
والا گەوهەر: (ف) گەوهەرا پڕ بها و گەلەک ب ڕوو.
پەریروخسار: (ف) دێمپەری.
چەشم بەند: (ف) چاڤ دەینانە سەرێک.
تشنە: (ف) تێنی.
ئامورزگار: (ف) لێنەگر؛ گونەهژێبر. ناڤەکە ژ ناڤێن خودایێ مەزن کو ب عەرەبی دبێژنێ: (الغفور).
پشتەمیر: پشتەڤان (الظهیر والمعین).

## ئیرۆ مەلا سەراپا

سەراپا: ژ سەری هەتا پێیان.
خەرامان: (ف) ڕێڤەچۆنا نازداری د گەل.
طورفە: (ع) جوان (طریف).
دل گەشتە: (ف) کەسێ دلێ وی ژ تشتەکێ سار، دلسار.
عشقبازی: (ع.ف) ئەشق و ئەڤینییا ژ دەرەو.
بێز: نەفرەت (الاشمئزاز؛ الاعراض).
کەربەش: کەلەندۆر:، کیڤار (الشوک المقدس).
زوهرەسیما: (ع) دێم وەکی دێمێ زوهرە، زوهرە هەسارەیەکە ب فارسی دبێژنێ: ناهید، گەلەک ب شەوق و ڕۆناهییە ل دەڤ مە دەمێ هلاتنا وێ دکەڤتە بەرێ سپێدەیێ یان سپێدەیێ بەری هلاتنا ڕۆژێ دبێژنێ (ستێرا سوبێ).
کەشاکەش: (ف) ڕاکێشان، کێشانا ل سەر ئێک. ل ئێرە پتر ڕامانا (جرەبرێ؛ کێش ڤەکێشێ) ددت.
یەنگی: جوونە تیرەکە دبت ژ ڕەخێ (یەنگ)ڤە ـ کو دەڤەرەک بوو ـ دهاتن لەو دگۆتنێ: یەنگی.

## شەبێ قەدرێ

کەماندار: (ف) کڤاندار؛ خودانکڤان.
توندی: (ف) تیژی، تامتیژی.
مەردوم: (ف) نەینکا چاڤی.
سورمەپووش: (ف) چاڤکلدایی.

## سەلوا سەهێ قەد

سەهی قەد: (ف.ع) بەژنکێل، بەژنڕاست.
شاهانە: (ف) تشتێ هەژی شاهی، یێ شاهی (ملکی، کل ما هو لائق بالملک).
کەشتی: (ف) گەمی (مرکب).
گرامی: (ف) ب بها و عەزیز، د کرمانجییا ژۆریدە جهایی گرامی (گراڤی) ل کارە. (عزیز، مکرم).
کرشمە: (ف) ناز و نازداری (دلال).
ئەصلان: (ت) [ آسلان ] شێر (الأسد).

شەكەرخەند: (ف) كەنیشەكر، شرینكەن.

## شیوەیێ دلبەرێ بزان

شوست و شوو: (ف) [ شست وشوی ] بالاڤ (غسیل).
مەیكەدە: (ف) مەیخانە (حانة، خمارة).

## مە ژ بل حوسن وجەمالـێ

شەرمەندە: (ف) شەرمین (خجول).

## وەللاهـ ژ هەردو عالەمان

هەمنەشین: (ف) هەڤال؛ هەڤنشین؛ پێكڤەروونشتی.

## دیسا ل بەدرێ كاتبێ

گەردش: (ف) گەڕیان؛ زڤڕین (دوران).
قودرەت نەموون: (ع.ف) قودرەت پێشچاڤكەر (مظهر القدرة).
زەنگار: (ف) ژەنگار؛ ژەنگ (زنجار؛ الصدأ).
فەرخار: (ف) نەخشاندی و جوان. بوتخانە.
قەنتار: كێشەكە د حسێبا كوردانده (٢٠) خوندكارینە. د بنیاتدە پەیڤەكا یەونانییە. (قنطار: یعادل ٤٠٠,٢٥٦ كغم).
زەرباف: (ف) پاتە و پەڕۆكێ ب زێڕی نەخشاندییە. ل دەڤ زڤنگی و هەژار (زەرباڤ)ە، هەژار ب (زركێتك) ڕاڤە دكت.
زەرفەشان: (ف) زێڕڕەشین. (زەرئەفشان) ژی ل كارە.
عەنبەربار: (ع.ف) بێنخوەش وەكی عەنبەری (معطر كالعنبر).
همایوون: (ف) پیرۆز.

## خوون كو ژ دل

ڕەوان: (ف) ڕوح؛ گیان.

سەرخەط: سەرسینۆر. نوکە (سەرخەت) ل کارە.
ئەرزەن: ئەرزنک (الحنک).
فەشاند: (ف) بەلاڤکر (بعثر).
فرشتە: (ف) ملیاکەت (ملاک).
نەموونە: نموونە (نموذج). د کرمانجییا ژۆریدە (نەموونە) ل کارە، و د کرمانجییا ژێریدە (نموونە)یە.
ئەرغەوان: (ف) سۆرشەکر. سۆرێ ب سەر ڕەنگێ (بەنەفشی)ڤە.

## مەیێ نەنووشێ

شەیخێ صەنعانی: شێخەکی تێر مورید و دەروێش بوو. ڕۆژەکێ ڕێیا خوە ب (ئەرمەنستانێ) ئێخستییە، چاڤێ وی ب کچکەکا ئەرمەنی کەڤتییە، لێ ئاشق دبت. کچک دبێژتێ ئەزێ هنگێ دلێ خوە دمە تە، هەتا تو پشتا خوە ددییە دینێ ئیسلامێ و قورئانێ بسۆژی و زوننارێ باڤێیە پشتا خوە، و ببییە بەرازڤان. شێخێ ئاشق و ئەڤیندار هەمی مەرجێن دلبەرا خوە ب جهـ دکت. ڕۆژ دچن و ڕۆژ دئێن، ڕۆناهییا ئیمانێ جارەکا دی تارییا دلێ ئەڤیندار ڤەدرەڤینت، بێرییا دینداریا خوە یا بۆری دکت، بەرازان دهێلت و دزڤرتە سەر نەقلا خوە یا شێخاتییێ، ل ئێرە کچک خوە د داڤکێن ئەڤینا شێخیدە دبینت و نەشێت پشتا خوە بدتێ پشتی ل موسلمانەتییێ زڤڕییەڤە، ب دوو شێخی دکەڤت و دکەڤتە داڤا ئەڤینا خودایی و خوە دکتە خداما شێخی.
تەپاند: هەڤتووش کر. ئێخستە د بەلایێدە.
بیابان: (ف) خیزگەهـ، بەڕیستان، چۆلەمە (صحراء).
شەهـ نشین: دۆشک و تەختێ پاشایی (عرش الملک).
هەمقران: (ف.ع) پێکڤە یان نێزیکی ئێک و بەربەندی ئێک (متقارنین).
وەر نە: ئەگەر نە (وإلا).
تشنەلەب: (ف) لێڤهشک، لێڤتێنی (ضمآن).

## بێ لەبێ لەعلێ مەلا

موژ: مژوولانک.
قەووال: (ع) ئاوازخوون، کەسێ د جڤاتاندە ب ئاوازەکی خوەش شعران دخوونت (قوّال).
ڕەوان بەخش: (ف) یێ ڕوحێ ددت (واهب الروح).

## سەر ددت ئابێ کەوثەرێ

دوو: دووکێل (دخان).
زۆر: خەمگین. نەقایل؛ نەڕازی.

## ئیرۆ ژ شەهکاسا سورێ

زاغ: (ف) قرەڕەشک (غراب الزرع، زاغ).
تەیمووریٚ لەنگ: خونکارەکە ژ خونکارێن تەتاران، د ناڤبەرا (٧٣٦ – ٨٠٧)ی مشەختیدە ژیاییە، یێ لەنگ بوو، ب سەر وەلاتێن موسلماناندە گرت، وێران کرن و گەلەک خوون ڕێت. سالا (١٣٨٦)ی ز بەغدا وێران کر. (١٤٠٢)ز، سولتان بایەزیدێ دویێ یێ ئۆسمانی، نێزیکی ئەنقەرە ب دیلی گرت.
ئەفغان: (ف) نالین، ئاخ و ئۆف (تأوه، أنین).
کولاب: کەلابە، بستەکا ئاسنی یا سەر ب چەنگالە، پەنجە (مخلب، مهماز).
نهین: نەپەنی، خەف (مخفی).

## نازکا من د سەمایێ

جان بەخش: (ف) یێ ژین و ژیانێ ددت.
چەسپان: (ف) پێڤەنووسیایی. (ل جەگەر چەسپان کر) ئانکوو پێڤە نووساند (لصق، ربط).

## من دێ ژ غەفلەت

یەقەق: (ع) گەلەک سپی، سیس (شدید البیاض).
بهری: بێری (الاشتیاق، الحنین).
تیرئاور: کچ یان ژنا ئاور وەکی تیران.
کاشۆ: دارێ د یاریا کاشۆکانێدە یاریکەر پێ ل گۆکێ ددت، سەرێ وی یێ چەلاکییە (الصولجان).

## دلبەرێ من سەحەرێ

یەدەک: ل ئێدەک [دلبەرێ ئیرۆ سەحەر/٣٤] بزڤرە.
سنجاب: (ف) سڤۆرە.

وەشەک: جانەوەرەکی وەکی کتکانە، کوری قوتە، کویڤی و دوڕندەیە (الوشق).
زەغەل: ب تەشقەلە؛ ب حیلە (مغشوش).
ژێک ڤەدی: جودا بکی.

## تعالى الله

عذار: (ع) د بنیاتدە (ئالەک)ە زڤنگی ب (دەڤ و تیژاتییا تیرێ و شیری و کێرێ) ڕاڤە دکت.

## نازکەك من سەحەرێ دێ

چاهـ: (ف) چال. (چاها ذەقەنێ) ئانکو چالکا ئەرزنکێ، د فارسیدە (چاه)، (بیر = بئر)ە.

## کو ئشارەت ب بشارەت

کووتاهـ: (ف) کورت (قصیر).
موژگان: (ف) مژوولانک (أهداب).
نووبی: خەلکێ دەڤەرا نووبە، دەڤەرەکە د ناڤبەرا (مسر) و (سۆدانێ)دەیە. کنایەتە بۆ پەرچەم و تەمەرییان.
موغول: مللەتێ جەنگیزخانە، ئەو ژی ژ نفشێ تورکانە.
دوگووش: (ت) شەڕ و لێکدان.
غونجە گوشا: (ف) گول بشکێڤ. یێ سۆلین پێ دبشکڤن.
دورج: (ع) سندۆقەکا بچووکە ژن چەک و خشر و ئالاڤێن جوانی و بێنخوەشییێ دکنە تێدە.

## گەر بدیا ئەو صەنەما

ئەنگوور: (ف) تری.
کجا: (ف) کیڤە، ل کیرێ. چاوا.
شەکەرخا: (ف) شەکرکڕین. شەکرخوەر. کنایەتە بۆ ئاخڤتنا خوەش.

## شاهدێ قودسێ نشان

ساغەر: (ف) پەرداغ، ترار، د زاراڤێ سۆفییاندە دلێ خودێناسییە یان ئەو تشتە ئەوێ سۆفی تێدە ڕۆناهی و شەوقا غەیبێ دبینت.

رەوان: (ف) ڕەهوان. خوەش.

## ئیرۆ ژ رەمزا دێم دورێ

هەڤۆت: زڤنگی دبێژت: ئەز ب سەر ڕامانا ڤێ پەیڤێ هلنەبووم و من د زمانێ مە یێ کوردیدە نەبهیستییە، بەلێ ل گۆر جهێ وێ، ئەز هزر دکەم، ڕامانا (گڤاشتن) ددت. هەژار ب ڕامانا (فێرکر) مەعنە کرییە.

ئەرغەنوون: (یەو)هالەتەکا مۆسیقییە بەرێ د دێراندە دهاتە لێدان. کنایەتە بۆ دلێ ئەڤینداران. د بنیاتدە (organon)ە.

ئیسایە: تەیسییە. ژ (ئیساندن) ب ڕامانا تەییساندن هاتییە.

کوور: کوورهە (کیر الحداد).

فەغفوور: (ف) ژ (فەغ) ئانکوو (خودێ) یان (بوت)، و(پور) ئانکوو (کوڕ) پێکهاتییە، کو د کەڤندە ناڤ بوو بۆ پاشا و خوندکارێن چینێ. (فەغپوور) و(بەغپوور) ژی د فارسیدە ل کارن.

رەنجوور: (ف) خەمگین؛ دامایی؛ مەلوول؛ نەخوەش.

## شەربەتا لام وبێیان

هەم ئاغووش: (ف) دەستگەردەن (معانق).

پەیک: (پەیادە)یە د یارییا شەترنجێدە ئەو پوولە ئەوێ بازا وی گاڤەک ب تەنێ. د فارسی و کوردیدە (پەیک) ب ڕامانا (ئێلچی) و (قازد) ل کارە.

روخ: (ف) بەرەکی یارییا شەترنجێیە ل سەر ڕەنگێ کەلهە و کەلاتێیە.

شەه مات: (ف) گۆتنەکە ڕامان ژێ ئەوە کو شاهێ شەترنجێ مر و ژ کار کەڤت.

## عیدە و دا عالەمێ

دیدار: (ف) دیتن (رؤیة، ملاقاة).

## دانەیێن عەنبەر ل نەسرینان / ٧٤

دانە: (ف) دندک (حبة، بذر النبات).

خام: (ف) خاڤ؛ بێ ڕێز و تەرتیب.

چەڤاندن: چەماندن.
سوندوس: (یەو)دیبا. پاتەیەکە ژ ئارمیشێ زێڕین (الدیباج اللطیف والثمین).
قوندوس: (ع) تارییا تلچاڤ ئەوا تاری تاری (القندز).
زندە: (ف) زێندی؛ ساخ.
زندەگی: (ف) ژین (حیاة).
ناگەهان: (ف) ژ نشکەکێڤە (فجأة).

## رەمزێن تە د جانان

سینەگوداز: (ف) سنگسۆژ، سنگحەلین.
گولشەنێ راز: کتێبەکا شعری یا فارسییە، ل سەر عرفانێیە، شێخ مەحموود شەبستەری سالا (٧١٧)ی مشەختی د هەزار مالکاندە داناییە.
ئالال: هەلال. گولەکا بهاری و چیاییيا سۆرە. (الزنبق)
تەڕازن: مێرگا تێرشینکاتی و هەر تەڕ.
تەماشاگەهـ: (ف) جهێ بەرێخوەدانێ.
دنازن: شانازییێ دکن.
سەراپەردە: (ف) چادرەکا پاشاتییێ یا مەزنە، ل بەر دەرگەهێ خوندکار و سولتانان دئێتە ڤەدان.
نەماز: (ف) نڤێژ.
پەری چهرە: (ف) دێمپەری.

## مەلا مە ل گەردەنا دلبەر

قابەقەوسەین: (ع) [قاب قوسین] تەمەت دو کڤانان، کنایەتە بۆ گەلەک نێزیکاتییێ.
برهـ: بروو (حاجب).
پەیاپەی: ل دوو ئێک (علی التوالی، علی التعاقب).
لەعل: (ع) د بنیاتدە ژ (لال)ا فارسی هاتییە وەرگرتن. بەرەکی ڕەنگسۆری ب بهایە، وەکی یاقووتییە. ژ ڕامانێ وەها دیار دبت کو ل ئێرە لێڤن.
بەخشی: دا (منح) ژێدەرێ وێ (بەخشین)ە ب ڕامانا (دان).

## من د بەر (قالوا بلێ)

پەركەندە: (ف) پەریشان و بەلاڤ.
مەخمەر (مەخموور): (ع) مەخمەل. پارچەیەک جوانە ژ ئارمیشێ ب پوورت، پێشچاڤ وەكی قەدیفەییە. (مخمل).
گەرد: (ف) تۆز (غبار. تراب).
فەسان: (ف) چیرۆک. سەرهاتی (قصة. حكاية).

## صەنەمێ ژ قەوسێ ئەبروو

نوماندن: دیاركرن. دەرەهیكرن.
فەشاندن: (ف) بەردان، (ژ سینە دەست فەشاندن) ئانكو مە دەست ژێ شووشتن، یان مە دەست ژێ بەردان.
قشت: هندەک تەمەری و پەرچەمن دكەڤنە سەر ئەنییێ.
پەنس: (فەرەنسییە pince) كێلبەتان.

## خەشمێ ل فەقیران مەكە

بەهیتین: ئەم حەلاندن، ژ (بەهیتن) ب رِامانا (حەلاندن) و (هشككرن) هاتییە.
پەرێتین: ئەم پەرِتاندن، ژ (پەریتن) هاتییە ل سەر گۆتنا زڤنگی.
ژەه: ژه (وتر آلة من الآلات الموسيقية الوترية).

## ئەز نزانم سەبەبێ

دەهەن: (ف) دەڤ (فم).
وێرانە: خرابە. كاڤل (خربة).

## ئیرۆ ژ حوسنا دێم دورِێ

هجران كەش: (ع.ف) كەسێ دوور ژ خوەشڤی و دلبەرا خوە، فورقەتكێش (الذي يقاسي الهجران).

## وەرە جانم

وەرەس: (ف) گیا و گولەکا سۆرە بۆ رەنگێ سۆر د رەنگکرنێدە دئێتە کارئینان.
شەهنشاه: (ف) پاشایێ پاشایان (ملک الملوک).
تیغ: (ف) گویزان. شیر. کێر.
مەگەس: (ف) مێش (ذبابة).
نعرە زن: (ع.ف) کەسێ ب دەنگەکێ بلند قێری دکت.
هەم نەفەس: (ف.ع) هەڤالێ نێزیک.
سەنا بەرق: (ع) رۆناهیيا برووسيیێ (ضياء البرق).
داوی بری: بێدووماهی، دووماهیبرِ (الأبتر، مقطوع الذيل).
سیم: (ف) زیڤ.
مەس: (ف) [مِس] سفر (نحاس).
ئوسطوقوس: (یەو)بنستر و رِه و ماکا هەر تشتەکێ. نەژادەکە ژ هەر چار نەژادان، کو د زانینا بەرێدە (ئاخ، ئاڤ، با و ئاگر)ن.

## پەیوەستە دو ئەبروو

خەستە: نەساخ، نەخوەش. نهۆ د کرمانجییا ژۆریدە بۆ خەستەخانەیێ ژی ل کارە.
رەیحانی، دیوانی، پولپ، موسەلسەل: (ع) ئەڤە هەمی رەنگێن خەت و نڤیسینا عەرەبینە.

## شۆخ وشەنگێ

نەدیر: نەدیرە. ئاگرەک بوو، بەرێ ل سەرێ گر و چیایان دهاتە هلکرن بۆ ئاگەهدارکرنێ، بۆ سەرێ رەمەزانێ، بۆ هەردو جەژنان و... هتد.
تاب: (ف) قوژیژک و چەپ و وەرچەپ.
شباب: (ع) یێ ئاگر پێ دئێتە هلکرن وەکی پووشی و وان. ل ئێرە کنایەتە بۆ چاڤی.
طووطی: (ف) طوطیک (ببغاء).
شێرخوو: شێرسرشت؛ تبعەتشێر.
سروناز: (ف) دارا سەروێ یا نیشانێن نازدارییێ پێڤە.
طازی: رِووس.

## ئەێ دل وەرە

عەبدال: (ع) [ عبدل ] کۆلە (مملوک، عبد).
بەندی: کۆلە، خولام (عبد، خادم).
جەسمی: (ف) سترییەکی ب ددانۆکە ب عەرەبی دبێژنێ (شوک الحسک) تێ هەیە ئەڤ پەیڤە د بنیاتدە (جسمی) ژی بت، کو ڕامانا (لەشان) ددت.
دەندان: (ف) ددان، دران، دگان (سن).

## ژ رەمزا دلبەرێ دیسا

فاق: (ف) نیڤەکا ژها کڤانی ئەوا بنێ تیرێ دکەڤتە سەر.
ئەذفەر: (ع) بێنخوەش (قوی العبیر، ذکی الرائحة).
پوولاد: (ف) پیلا؛ پۆلا (فولاذ).
سەراسەر: سەرانسەر؛ هەمی؛ تێکدە (جمیع، کل).
یۆل: (ت) ڕامانا ڕێک ددت، و ل ئێرە (جڤات) ژی دئێت. (ئۆل)ا د کرمانجییا ژۆریدە ل کار، هەر ژ ڤێ (یۆل)ێ هاتییە وەرگرتن. پڕانییا پەیڤێن پێشییا وان (ئۆ) د کرمانجییا ژۆریدە ژ زمانێ تورکی هاتینە وەرگرتن، مینا: ئۆدە، ئۆلداش، ئۆلەگان، ئۆرتە، ئۆغلەمە و... هتد.
زیبایی: (ف) جوانی، شرینی.
تێلی: پاتەیەکە داڤێن زیڤ و زێڕی تێ هاتینە هلکێشان.
ئەرژەنگ: ناڤێ کتێبا (مانی) یا تێر نەخش و نیگارە، و ناڤە بۆ کتێبەکا تێر نەخش و نیگار، و ناڤە بۆ (مانی) ب خوە ژی.
پەروەر: (ف) نازدارکری.
خوەرد: (ف) [ خورد ] خوارن (طعام).

## دلبەرێ سەرداری خووبان

دەرماندە: (ف) دامایی. ژار. بێچارە.
مفتە: (ع) [ مفتاح ] کلیل.
بیڤێر: نەساخ؛ نەخوەش.
هادر: (ع) د جهدە؛ دەملدەست.

مەسیحا (مەسیح): عیساپێغەمبەر (سلاڤێن خودێ لێ بن).
بوو عەلی سینا: (أبو علی بن سینا) ٩٨٠ – ١٠٧٣ی ز فەیلەسووفەکی موسلمانە، پتر د وارێ پزیشکییێدە ناڤدێرە. ل بوخارا ب سەر دنیایێ کەڤتییە و ل هەمەدان مرییە. ژ کتێبێن وی یێن گەلەک ب ناڤ و دەنگ ئەڤەنە: (القانون فی الطب)، (الشفاء)، (الاشارات والتنبیهات)، و (النجاة).
دنووشم: کارە ژ (نووشین) ب رامانا (ڤەخوارن، تامکرن) هاتییە.
کەیل: فەرمانرەوا و خوندکار.

## فەلەکا ئەطلەسێ

کەمەر بەستە: (ف) کارکری، پێکهاتی (مهیأ، مستعد للخدمة).
زوننار پەرەست: (ف) کەسێ شووتکا فەلەیان دپەرێست.
چهرە: (ف) دێم.
کەسک و سۆر: کەسک و ئالا: (قوس قوزح).
کەج کولەهـ: (ف) کولاڤ خوار، کنایەتە بۆ دلبەر و خوەشڤییان.
آن: (ف) ئەو.
گرهدار: (ف) ب گرێک (معقد).
سەرکەشی: (ف) پشتەرێیی (تمرد، عصیان).

## موحبەتێ محنەت د زۆرن

جەفا: (ع) [ جفاء ] بێوەفایی. کەرب. ستەم.
مەفا: فەیدە، مفا.
دلبەند: (ف) دلکێش، دلبەر (جاذب. مەعشوق).
ئەهرمەن: (ف) شەیتان.
مورده: (ف) مری (میت).
دوود: (ف) دوو؛ دووکێل (دخان).
جەوهەر شناس: (ف) گەوهەرناس.
کومەید: کمێت. هەسپێ رەنگێ وی د ناڤبەرا رەشاتی و سۆراتییێدە.
سەرا: ئاڤاهییێ بلند. قەسر.

سیتاب: سیبەر، سیتاڤ.
شەبنەم: (ف) خوناڤ (ندی).
سەبزە: (ف) شینکاتی. مێرگ.
خووب پەرەست: (ف) جوانپەرێس.
زازان: زڤنگی دبێژت: هەڤرامانا (سازان)ە، کو کۆما ئالاڤێن مۆسیقییە.

## دلبەرێ سەردارێ خووبان

ئەختەرمە: ئالا و هەسپ و چەکێن د جەنگێدە ژ دژمنی دئێنە ستاندن. زڤنگی ب (خەتیرە) ڕاڤە دکت دبێژت: ژ (ئەختەر)ا فارسی هاتییە وەرگرتن.
دامەن: (ف) دەهمەن؛ دانگ.
زەنەخدان: (ف) ئەرزنک (ذقن).
جانفدا: (ک.ع) جانگۆریکەر (المفدى بروحه).
بخوور: (ع) هەر ماددەیەکا سەمغی یا بئاڤێژنە د ناڤ ئاگریدە و بێنەکا خوەش بدت. نهۆ دارکن ماددەیەک پێڤە هنوویییە، ئاگری بەرددنێ، هێدی هێدی وەکی جگارێ ئاگر پێڤە دچت و بێنێ ددت.
تەوقە: بێریکرن (الاشتياق). هەژار ب (خوەپارستن) ڕاڤە دکت.
شەفقە خووی: (ع.ف) دلۆڤانی، دلپێڤەیی (الشفقة، الرحمة).
بوتخانە: (ف) جهێ سەنەم لێ دئێنە پەراستن (معبد الأوثان).
خوند: (ف) میر، باخوێ (السيد. الأمير).
لات: (ف) ڕووتەک. هەژار (فقير. معدم).
بێوەری: کورتکرنا (بئێوری)یە، کو ژ (ئێورین) هاتییە و ئێورین ڕامانا ئاکنجیبوون و ڕاوەستیانێ ددت.
مووچە: ئامانێ ژار و خیزانێن دەرۆزەکەر، خوارنا خوە دکنە تێدە. نهۆ د کرمانجییا ژێریدە شوونا (راتب)ی ل کارە.
دینبەر: یا دینی دبت و مرۆڤی بێ دین دکت (الذاهبة بالدين).
موغل: مەغوول، تەتەر.
چەشنە: (ف) ئاوا؛ ڕەنگ؛ جوون.

## طورەیا تابدار عەنبەرکە

تابدار: (ف) ب پێچ و بادەک.

جنەسرى: ژڤنگى دبێژت: ناڤێ گولەكێيە تێ هەيە (گولنەسرين) بت، و ل ئێرە مەخسەد پێ بسك و گولينە. ل دەڤ هەژار (جونەسرى)يە، ب (ويشيێ جوونەكى دارخورمەيا ب بها و گەلەك باش) هاتييە ڕاڤەكرن.
سورمە: (ف) كل (الكحل).
كەلهە: كەلات (القلعة).
سەرو: (ف) دارا سەروێيە ل ئێرە مەخسەد پێ بەژنا كێلا ڕاست ڕابووييە.

## گەر چ بولبول

ناسوور: (ف) برينا ئاڤێ دكێشت و دوەرمت.
دولدول: (ع) هێسترەك بوو، ميرێ مسرێ (المقوقس) ب ديارى بۆ پێغەمبەرێ مە (سلاڤێن خودێ لێ بن) هنارتبوو، و پێغەمبەرى بۆ ئيمام عەلى كرە ديارى.
عەشقەر: هەسپێ شهزەر. هەژار ب (ڕێڤەچۆن هشك) مەعنە دكت.
قولە: هەسپێ دورهێ نەرەسەن.
ڕشتە: (ف) ڕستە.

## ئيرۆ ژ مورادا تە

روخ: (ف) دێم (وجە).

## مە لەو ڤنجان ل سەر دەستە

شەلال: هوور و كێمتا، نە تێرتا.
دەربەند: تەنگا چيايى و كەلهە و كەلاتا بچووك.

## من دى سەحەر

كەمخە (كيمخە، كەمخا): جلكەكە ژ ئارميشى گەلەكى ب بها و ب ڕوويە.
نيك بەخت: (ف) ئێغبالباش (سعيد الحظ).
زا: جار.
سووز: (ف) سۆتن، گەرم.

سورووش: (ف) وەحی. جبرائیل.
خورووش: (ف) قیژ و قەرەبالغ و هەوار (الصیاح والضجة).
گوو: (ف) گۆ، گۆک.

## وەێ سپێدە ژ بورجێ قەوس

گۆشەزەر: گۆشەزێرین (الذهبی الزوایا).
پارە: (ف) کەر؛ پرت (قطعة، قسم).
خەف: (ف) ڤەشارتی، ب دزیکیڤە، ب نهینی (سراً).

## هەێ د بەر (قالوا بلێ)یێ

گەردوون: (ف) ئەسمان، فەلەک.
سەرمەیان: سەرمایە، سەر و سامان (رأس المال).
بادەنووش: (ف) مەیڤەخوەر (شارب الخمر).

## کەس نەدییە سەحەرگەهـ / ١٠١

سەرمەست: (ف) سەرخوەش (سکران).
رەهبەر: (ف) رێبەر. شارەزا.
شوکووە: (ف) مەزناتی و سەنتەنەت (عظمة، شوکة).
هاموون: (ف) دەشت (صحراء).
هەمدەم: (ف) هەڤدەم (أنیس).
فەریادرەس: (ف) کەسێ د هەوارا ستەملێکرییەکێ بچت یان بێت، و پشتەڤانییا وی بکت.
کەج رەو: (ف) تەڤەرێ ، گومرا (الضال).
فەرزین: (ف) وەزیرە د یارییا شەترنجێدە.
کشت مات: (ف) زاراڤەکە د یارییا شەترنجێدە رامانا (هەرە بێ لڤین) ددت، یان ژی رامانا (هەرە بمرە) ددت.
ئیجا: ڤێجا، ڤێجارێ (هذه المرة).

## نێرگزا مەست و خەرامان

چار: وەکی شەملکەکێیە ژن د سەر ملێ خوەڕە دئینن و بەرسنگێ خوە پێ دگرن.
ئەرەش: ناڤێ جهەکێیە یان ژی ناڤێ کورێ کەیقوباد یێ دوییێیە ژ شاهێن فورسێ یێن کەڤنە، نەدوورە ڕامانا (ئوورس) ژی بدت.
قورەشی: بالڤەدانە بۆ (قورەیش).

## بـ حوسنا (أحسن التقويم)

پابووس: (ف) د بنیاتدە ڕامانا (پێ ماچکەر) ددت کو ئەوە یێ پێیان ماچی دکت یان ڕادمووست، ل ئێرە ڕامانا ڕسوابوون و سەرچەماندنێ و خوەبۆشکاندنێ ددت (الخضوع والتذلل).
سەمەن سا: (ف) یا وەکی سەمەنێ. سەمەن گولەکە د کرمانجییا ژۆریدە دبێژنێ: ئەسمین، و ب عەرەبی دبێژنێ: (یاسمین).
جەهانگیر: (ف) کەسێ دنیایێ هەمییێ دئێختە د بن دەستێ خوەڤە (مسخر العالم، فاتح الدنيا).

## لاتێ حوسنێ

طەبلخانە: (ع.ف) ئەو داهۆلەبوون ئەوێن ل پێشییا میر و خوندکاران دهاتنە قوتان، دەمێ قەستا بنگەهێ میراتی و خوندکارییێ دکرن.
ب تە شێتن: هەژی تەیە.
ئشکەستە: (ف) جوونەکی خەتێ نڤیسینێیە نامە پێ دهاتنە نڤیسین (الخط الديواني).

## ئەێ شەهەنشاهێ موعەظظەم

نگەهدار: (ف) نۆبەدار (حارس. حافظ. راع).
کەیوان: (ف) کەوکەبەکە ژ کۆمەلیشکا ڕۆژێیە، ب عەرەبی دبێژنێ: (زحل).
رکێبدار: (ع.ف) سەربازەکی پەیادەیە، د مەوکباندە ل پێشییا سولتانی دچت. خزمەتکارێ ڕکێبا هەسپی دگرت، دا سولتان یان پاشا لێ سوار ببت.
فەرخوندە: (ف) پیرۆز. بەختەوەر (مبارک. محظوظ).
سەرگەردان: (ف) شەپرزە؛ پەریشان (حيران. مضطرب).
عەلەمدار: ئالاهلگر (حامل العلم في الجيش).

سەلامکار: یێ ب بەر پاشا و خونکارانڤە دچت و سلاڤێ وان دکت.
مووکار: ئالاڤەکە ژ ئاسنی، دارتراش (نجار) ژ بۆ کۆلان و کونکرنا داران ب کار دئینن، هەژار ب (گەلەک تیژ کو موویان ڕاکت) مەعنە دکت. چەکەکی وەکی شیری و خەنجەرێ تیژە.
کووز: (ف) قۆس.
چووکار: (ف) خزمەتکاری (خدمة).
دەولەتخواه: (ع.ف) خێرخواز. (دەولەت) ل ئێرە ڕامانا (خێر) و(مال) ددت.
دوعاگۆ: (ع.ک) دوعاکەر (الداعی).
ثەناخوان: (ع.ف) مەدحەکار (مداح).
پێشدەست: بەرانبەر (أمام ومقابل).

## خانێ خانان

جەم: (ف) کورتکرنا ناڤێ (جەمشید)ە.
شادمانی: (ف) دلخوەشی؛ کەیف.
نەوشیروان: (ف) ناڤێ پاشایەکێیە پێغەمبەرێ مە (سلاڤێن خودێ لێ بن) ل سەر وەختێ وی ب سەر دنیایێ کەڤت. ئەڤ پاشایەیە ناڤێ وی ب عەدالەتێ چۆیی و هەر ئەوە یێ (ئەیوانا کسرا)ی ئاڤاکری.
ئەسکەندەر: ئەسکەندەرێ دبێژنێ: (ذو القرنین)ە، ل سەر وەختێ خوە، هندی ژ دنیایێ ئاڤا ئێخستە د بن لەپێ خوەڤە.
کامران: (ف) بەختەوەر، دلخوەش (سعید).
کام بەخش: (ف) مرادحاسل. کەسێ هیڤییێ ددتە مرۆڤی.
پسەر: (ف) کوڕ، ل دەڤ هەژار (ب سوڕ)ە و ئەڤە پتر د جهێ خوەدەیە.
شاپوور: (ف) پسمیر، ناڤێ پاشایەکی کەڤنی فورسێیە.
درەختا گوور: دارەک بوو ل سەر چیایێ (طور سیناء) ئاخڤتنا خودایێ مەزن ب ڕێکا وێ دگەهشتە مووسا پێغەمبەر (سلاڤێن خودێ لێ بن).

## ژ مابەینا دو ئەبروویان

تیرێژ: تیرۆژک (شعاع).
طەور: (ع) ڕەوش؛ سەروبەر؛ ئاوا.

## هێڤێ و تەوقە دکم

نگار: (ف) بوت. خوەشڤی. نەخش.
پادشەھ: (ف) پاشا، سولتان، خوندکار.
فەرەنگ: وەلاتێ فەرەنگان (بلاد الافرنج).
عەرەبستان: ئەرد و وەلاتێ عەرەبان (أرض العرب).
مەجەر: مەجەرستان. وەلاتەکە دکەڤتە ئەوروپا رۆژهلات.
گەدا: پارسەک، کەسێ پارسێ دکت (شحاذ).

## غەما عشقێ پەرهتم ئەز

پەرهتم: براشتم.
بەهیتم: حەلاندم.
پەروا: (ف) ترس. تاقەت. سەفەت (خوف، تحمل، طاقة) د کرمانجیدە (پەروا) هەڤرامانا پەیڤا (ترس)ە، گەلەجا وەک جێمکناڤ، پێکڤە دئێن (ترس و پەروا).
هێستر: رۆندک.
زاری: (ف) قێری. هەوار. نالین.
خوەی: خوەیی؛ خودان.
هەمتا: (ف) هەڤپا، بەرانبەر (مماثل، مساوی).
گووی: (ف) گۆک.
تازی: رووس، طازی (مسلول).
شوور: (ف) فتنە. کەلژین (فتنة، هیجان). و(شۆرش)ا ب رامانا (ثورة) ڤێ دووماهیێ هاتییە د کوردیدە هەر ژ (شوورش)ا فارسی هاتییە وەرگرتن، کو ئەو و (شوور) هەڤرامانێن هەڤن.
غەوغا: (ع) [ غوغاء ] فتنە.
شام: (ف) دانێ خوارنا شیڤێ (المساء). [د بنیاتدا ژ عەرەبی هاتییە وەرگرتن و رامانا رۆژئاڤا ددەت (عکس الشرق) ـ تەحسین].
عەنبەرئەفشان: (ع.ف) عەنبەررێژ، عەنبەرڕەشین (ناثر العنبر).
عصاب: (ع) دەرسۆکا ژن دئاڤێنە سەرێ خوە.
ڕەستە (ڕەست): (ف) بەردایی، قورتال، سەربەست (طلیق، حر).

## ئەی نەسیمێ سەحەرێ /۱۱۱

سیمین تەن: (ف) لەش سپی.
زەررین کولەهـ: (ف) کولاڤ زێرین.
قەلەهـ: کەلهە (القلعە).
صوبحگەهـ: (ع.ف) سپێدە.
مەدەهـ: (ع) [ مدح ] مەتح، پەسن.
نگەهدار: (ف) ئاگەهدار.
نگەهـ: (ف) کورتکرنا (نگاهـ)ە و ب رامانا (تەماشا، بەرێخوەدان) ل کارە.

## ئەی نەسیمێ صبەهێ

رەهکوذەر: (ف) رێبار، رێڤینگ (عابر، مسافر).
زەررین کەمەر: کەمەرا زێرین.
کافوور: (هندی) [ گاپوور ] مادەیەکا سپی یا سەدەفییە. تێربێن و بێنخوەشە ژ دارەکێ دئێتە وەرگرتن دبێژنێ (کافوور)، ل رۆژهلاتی ئاسیا و دەڤەرێن چیایی یێن رۆژهلاتی هندستانێ و ل چین و چاپۆنێ (یابان) شین دبت. رهـ و تاکێن ڤێ دارێ پرت پرت دکن و د ئاڤێدە دکەلینن، و ب رێکا دێراندنێ (تقطیر) پرتێن بەللووری ژێ پەیدا دبن دبێژنێ (کافوور).

## ئەی شاهدێ قودسێ

لەف: خەلەک.
گولنار: (ف) گولهنار (زهر الرمان).
نصاب: (ع) رادەیا زەکات لێ کەڤتنێ.
هندوو: (ف) هندۆک. ل ئێرە رامانا دلرەش و بێرەحم ددت.
رکاب: (ع) رکێب، زەنگۆ. ئاسنەکە ب زینێڤە گرێدایییە و پێدە شۆرە، سوار پێ خوە دکتە تێدە و پێ ب سەر پشتا هەسپی دکەڤت و ب سواری ژی هەردو پێیێن وی تێدەنە.
سەرپووش: (ف) دەرسۆکا سەری.
قباب: قوبە، گونبەد. کۆما (قبة)یە د عەرەبییدە.
سێگاهـ: (ف) مەقامەکا مۆسیقییە، ئاوازەکە.

شەباب: (ع) بلوور، بلوول (الشبابة نوع من المزمار).
گوشاد: (ف) بەردایی. ڤەکری (مطلق. مفتوح).

## مە ب دل نێرگزێن خاصصە دڤێن

تەروەندە: (ف) خێڤە؛ فێقییێ نووگەهشتی.
نازپەروەردە: (ف) کەسێ ب نازداری ڕابوویی و مەزن بوویی.
سایەپەروەردە: (ف) کەسێ ل بەر سیبەرێ مەزن بوویی؛ تاریکری.
مهردار: (ف) خودان ڤیان و ئەڤین.
پژموردە: (ف) چرمسی (ذابل؛ يابس).
گرە: (ف) گرێک (عقدة).
شەبچراغ: (ف) چرایێ ب شەڤ ڕۆناهییێ ددت، شەڤچرا.
مشک: (ف) مسک.
خەمزەدە: (ف) خەلەک (المزينة بالالتواء والثنى).
شیفتە: (ف) بەلاڤ و تەڕابەڕا (المشتت).
خارە: (ت) پاتە و پەڕۆکێ ڕاڤ ڕاڤ و گرێگۆسە. قوماشەکی ب ڕوو و پڕبهایە.
غەمدیدە: (ع.ف) خەمگین؛ پۆسیدە (حزين؛ مغموم).
سەودازەدە: (ف) دین و دێوانە و شەیدا (مجنون. عاشق).
نەرگس: نێرگز (زهرة النرجس).
گیو و پەشەنگ: (ف) دو سەرلەشکەرێن فارسی یێن کەڤنن، شەڕەکی گران د ناڤبەرا واندە قەومی بوو.
بەنگ: (ف) خەربەنگ (بنج، سكران).
نەیرەنگ: (ف) حیلەبازی، مەکر و گەند (مكر، حيله).
فەرسەنگ: (ف) پیڤانەکە بۆ دووراتییا ڕێکان، شەش کیلۆمێترن یان شەش هەزار گەز (فرسخ).
نوورئەفشان: (ع.ف) ڕۆناهی بەلاڤکەر (المنور، المشع).

## (صباح الخير) خانێ من

ڕەها: بەردایی. سەربەست (محرر. طليق).
پەیوەندی: (ف) گرفتاری، موبتەلایی.
دکالم: دنالم، ژێدەرێ وێ (کالین)ە.

بشکۆژ: سۆلین، گولا هێژ ڤەنەبوویی.
سیەه یەنگ: (ف) کڤانێ رەش، کنایەتە بۆ برویان.
مەسنەد: (ع) پایە و پەییسک (مقام ورتبة).
دکووشم: بزاڤێ دکم، ژێدەر(کوشان) یان (کوشیدن)ێ فارسییە کو ب رامانا (سعی، اجتهاد) ل کارن.

## هەنەما سور ژ هەمەد ۱

عەزازیل: پەیڤەکا عبرییە ب رامانا (خوەشڤییێ خودێ) ل کارە. ناڤێ شەیتانی بوو بەری بێتە هەیتکرن. ل ئێرە مەخسەد پێ شەیتانە.
قەجەر: ناڤێ ئووجاخەکا مەغوولی بوو، تەیموور لەنگ سالا (۸۰۳) ئینانە ئیرانێ. شەرکەرێن سەفەوییان ژی بوون. ژ سالا (۱۲۱۰) هەتا (۱۳٤٤) مشەختی پاشایەتییا ئیرانێ د دەست واندە بوو.
ئەیسی: تەیسی.
نەدیرم: من نینە.

## هەنەما سور ژ هەمەد ۲

بوتکەدە: (ف) بوتخانە، جهێ سەنەم لێ و تێڤە دئێنە پەراستن.
لاهووت: (ع) خودایی، هەر تشتەکێ هەڤبەندی ب خودایی و ناسینا ویڤە هەی.
کەفت: (ف) سەرمل (کتف).
چەن: (ف) ئەرزنک، زرچەن = بنئەرزنک (الذقن. الحنک).
رەفت و چون: (ف.ک) چۆن (الرواح).
ئاهەن: (ف) ئاسن.
شەکەر خەندە: (ف) کەنیشرین، کەنیشەکر، شەکرکەن (ذو البسمة الحلوة).
سورمەدار: (ف) چاڤکلدایی.
ژها: ئەژدەها، مارێ گەلەک مەزن. ل ئێرە مەخسەد پێ کەزینە.
سەهم: هەیبەت، ترس.
عشوەگەر: (ع.ف) دلکێش. نازدار. کچا یان ژنا مرۆڤی ب نازان ب نک خوەڤە دکێشت.

## ئیرۆ م دێ وەقتێ سەحەر

زازا: زڤنگی دبێژت: هەڤرامانا (سازا)یە، کو کۆما ئالاڤێن مۆسیقێیە. هەژار ب (هەی ساز) مەعنە دکت.

حالدار: (ع.ک) کەسێ د حال چۆییە، نەهشیار دبت و ژ زێدەئەڤینداری و شەیدایی وەکی تەبێ (طـەبێ) دئێتێ.

گوفتار: (ف) گۆتن، ئاخڤتن.

کولدار: دلکول. ب کول و خەمبار.

ئەختەرمە: ئێخسیر و دیل.

خوممار: (ع) سەرخوەش (سکران).

بەغچە: باغچە؛ باغێ بچووک.

ئانجا: (ف) وێرێ. ئەو.

سەربەند: (ف) شاشک؛ دەرسۆک (عمامة).

موردار: (ف) مری. مرار.

بەدکار: (ف) فعلپیس، شۆلتەرێف و بێتۆرە.

دژەن: (ف) تامسار. دژوار. تبعەتهشک. تێ هەیە ئەڤێ پەیڤێ و پەیڤا (دژوون)ا کرمانجی تێکلی و هەڤبەندییەکا موکوم د گەل ئێک هەبت.

## ئیرۆ ژ نوو پوڕ ئاتەشم

بەگلەر: (ت) مەزن، میر، ڕسپی.

کشوەر: (ف) مەملەکەت، وەلات.

غەنجە: (ف) نازداری.

پیشرەو: (ف) ڕێبەر، سەرکێش.

گولاب: (ف) گولاڤ؛ ئاڤا گولان (ماء الورد).

بوومەوەر: (ف.ع) بێنگولاڤ.

پەریهت: سۆت.

یەغماکەر: (ت.ک) تالانکەر.

تەحلیکەش: (ک.ف) کەسێ گەلەک ئیزا و نەخوەشییێ دکێشت.

## ڤێ فورقەتێ ئەبتەر کرین

سەوس: (ع) گێژ، هەواسەر.
خەیلەک: (ف.ک) گەلەک.
خوندکار: پاشا، حاکم.
خاک: ئاخ.

## دەرحەق مە

طلسم: (یەو)پارچەکاغەزەکە یان پارچەپلێتەکە، سێرەکەر جەدوەلەکی خانەدار یان چەند تیپ و ڕەمزەکان ل سەر دنڤیست ژ بۆ پارستنا کەسەکێ یان دانەپاشا بەلایەکێ ژێ.

## مزگین ژ مەڕا بێت

ماچین: کورتییا (مەهاچین)ە، کو ڕامانا (چینا مەزن) ددت. (مەها) نوکە ژێڤەبووییە و چین ب تەنێ مایییە.
ئەغیار: (ع) کۆما (غیر)ە کو ڕامانا بیانی ددت.
دارین: ناڤێ بەندەرەکێ بوو ل بەحرەین، مسک ژ هندستانێ دهاتێ، وەکی بنگەهەکێ بوو بۆ عەتاران. د کرمانجییا ژۆریدە (دارین) ئەو ئامانە ئەوێ ئاوارێ بۆ سەیان دکنێ. ل ئێرە تێ هەیە جزیری هەردو مەخسەد دابنێ.
بالین: (ف) بالگەھ (مخدة، وسادة).
پەرویز: خوسرەو پەرویزە، پاشایەک بوو ژ پاشایێن ئیرانێ، جێرییەک هەبوو ناڤێ وێ (شیرین) بوو، ئەڤینا (فەرهاد) لێ کەڤتبوو.

## چارینە

هەی: پەیڤەکا هشیارکرن و ئاگەهدارکرنێیە.
سەردەفتەر: (ف) سەرۆکێ دیوانێ. کەسێ ناڤێ وی ژ بۆ تشتەکێ ل سەرێ دەفتەرێ دئێتە نڤیسین ژێ دبێژنێ (سەردەفتەر).
دیباجە: (ف) دیبا پاتەیەکی ئارمیشییە. د زمانێ عەرەبیدە جهایی (شوونا) پێشگۆتن (مقدمة) ل کارە.
سەراچە: (ف) سەرایا بچووک. خانییێ بچووک.

ئەندیشە: (ف) ترس. شەپرزەیی.
تیشە: (ف) تەڤشی؛ تەڤشوو.
مشکین: (ف) ڕەنگ مسک. ڕەش.
سەرپەنجە: (ف) سەرتل (بنان).
جەرید: (ع) دەستەکا کێم زەلام. کۆما سوارێن بێ پەیادە.
هەمراه: (ف) هەڤال، هەڤرێ.
پەلید: (ف) فەلیتە. پیس.

## هەلبەستەکا هەڤپشك د ناڤبەرا مەلایێ جزیرێ و میـر عمادەددینێ دا

گەوهەرئەفشان: (ف) گەوهەرڕێژ (ناثر الجواهر).
زەرئەفشان: (ف) زێڕڕێژ، زێڕڕەشین (ناثر الذهب).
دورەخشان: (ف) تێرڕۆناهی. ب شەوق.
رەخشان: (ف) دورەخشان تێرڕۆناهی. ب شەوق.
بەلەخشان: (ف) زڤنگی دبێژت: ((ئەز بێژم عەقیقە یان مەعدەنەکی دی یێ سۆرە وەکی وی)). ب دیتنا من ئەڤ پەیڤە ژ (بەلەخ) ئانکو مەزنایی و (شان) ئانکو (شأن)ا عەرەبی گەهشتییە هەڤ و پێکڤە ڕامانا (ماقوول) ددن.
شەککەر ئامیز: (ف) ڤەخوارنا شەکر تێکەل کری (الشراب المخلوط بالسکر).
سەمەن بوو: (ف) بێنئەسمین.
ئەژدەر: (ف) ئەژدەها. مارەکە د ئەفسانەیاندە ئاگری ژ دەڤێ خوە دئاڤێت.
ناب: (ف) سافی و زەلال.
مانی: ناڤێ وێنەکێش و نەخشکەرەکێیە، پشتی عیساپێغەمبەر، ل زەمانێ ئەردەشیر یان یێ بەهرام پەیدابوو. بەهرام کوڕێ هۆرمز کوشت. ناڤێ کتێبا وی (ئەرژەنگ)ە. بیر و باوەرێن وی تێکلن ژ زەردەشتییاتی و جوهییاتی و نەسرانییەتێ. مانی سالا (٢١٦)ی ز ل بابل ب سەر دنیایێ کەڤت، خوە کرە پێغەمبەر و ناڤێ خوە کرە (فارقلیط) ئەوێ عیسا پێغەمبەر مزگینی ب هاتنا وی دایی.
ئوستاد: (ف) هۆستا.
کسرا: (ع) بەرانبەرێ عەرەبی یێ (خوسرەو)ە، کو ناڤێ پاشایێن ساسانییان بوو و ناڤێ نەوشیروانێ عادلە ژی.
هەمسەر: (ف) هەڤال. هەڤسەر؛ هەڤگیان. تێ هەیە (هەمسرِ) بت.

هەمراز: (ف) هەڤسر. کەسێ ئەو و یەکی دی هەڤپشک بن د ڤەشارتنا سرەکێدە.
سەرزەنگ: د کرمانجیدە رامانا (سەرپشک) ددت. ل دەڤ هەژار جهایی ڤێ پەیڤێ (سەهی رەنگ)ە، ل بنێ گوهییە د بنیاتدە هەر ئەڤەبت هاتبتە تەصحیف کرن.
گوهەرسەنج: (ف) تشتێ ل گرانی و بهایێ گەوهەران.
عەنبەری سارا: (ع.ف) وەکی عەنبەری.
جەمال ئارا: (ع.ف) جوانی نەخشین.
خارا: رەق، مەرمەر.
رووح پەروەرد: (ع.ف) روح پەروەردەکری و جەرباندی.
روخسار: (ف) روو (وجە).
شەب ئەفرووز: (ف) یا شەڤێ رۆن دکت و ب رۆناهی دئێخت.
موعجز ئاموز: (ع.ف) سەیدایا نەدیتی و نەبووییان (معلمة المعجزات).
جەهانسووز: (ف) جیهانسۆژ. زۆردار؛ ستەمکار.
سیم ئەندام: (ف) ئەندامزیڤ. لەش و ئەندام سیس.
سەرئەفراز: (ف) سەرفراز.
شکار: (ف) نێچیر.
گران بەند: قەید و زنجیر گران (ثقیل القید).
شەهلەوەند: مێرخاس (الشجاع).
گوهەرریز: (ف) گەوهەررێژ، دورداڕێژ (ناثر الجواهر).
غەزنەین: ناڤێ جهەکێیە.
گوهەرچین: (ف) کەسێ گەوهەران ڤێ ددت و رادکت (لاقط الجواهر).
چیر: مێرخاس. خوندکار. سەردەست.

## هەلبەستەکا هەڤپشك د ناڤبەرا مەلایێ جزیرێ و فەقییێ تەیران دا

خوم: (ف) دەن.
سەمادار: (ع.ف) سەماکەر (رقاص).
هەسار: کەلهە.
سیاهـ گووش: (ف) گۆشەرەش. کڤانێ گۆشەرەش.
بێ هووش: دەبەنگ. بێ ئاقل.

ئەسوەدپووش: (ع.ف) یا جلکێن رەش د بەر.
هەنگ: (ف) گرانی، قەوەت. تێ هەیە رامانا (حنگ) ژی بدت.
بەلچم: بەلگ.
زەرباڤ: باڤزەر. رەنگ ب سەر زەریڤە یان رەنگ زەر و پێتی.
حیر: (ع) شەپرزەیی (حیرة).

بسم الله الرحمن الرحیم

نوایا مطرب و چنگی فغان آفیته خرچنگی — وره ساقی حتا کنگی نشوین دل ژ شق زنگی

حیاتا دل میا باقی بنوشین دامنتنقی — الا یا ایها الساقی ادر کاسا و ناولها

کو کاتب دیم جهد و لکت شکسته خط مسلسل کت — ژ نیک اعراقان مفصل کت که ره فی مشکلی حل کت

دزانی ره ده و دو اول چو عاقیق سرو اول — که عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشکلها

ژ مهرا وی شفق سعدی شرین لعلی شکر وعدی — دناظم شبهت رعدی عجیبم لی ژ رقی جعدی

که دل را تاب هر جینش بفکری میبردینش — ز تاب جعد مشکینش چه خون افتاد در دلها

ژ لادی دی خانی مه ژ دل وانبه کانی — کسی دست ژ دورانی نه هاکر فی محسابتنی

دراغوشش چه می آرد که ازدل حاش سبا رد — جرس فریاد میدارد که بربندید محملها

به قرآنی نیاتی اگر پیر خرابا تی — به بیرن سجده لاتی هر بیری وی دبن قاتی

مریدا ربها بهر نبود ز فرفتشی بیر نبود — که سالک بیخبر نبود ز راه و رسم منزلها

ژ ظلمات دریا ئی ژ موجان قط خبرنائی — شکستی کشتیا بی عجایب وی شقی دابی

ژ حرف مایه ساقی ما نجات در شکل و فعال ما — کجا دانند حال ما سبکباران ساحلها

بەرپەڕێ ئێکێ ژ دەسنڤیسا محەمەد طەیار پاشایێ میرێ ئامێدییێ
ل سالا ١٢٣١ مشەختی ١٨١٥ زایینی هاتیە نڤیسین

تمت تمام شد کتاب دیوان حضرت محبوب حق و مجذوب مطلق مولینا و اولینا شیخ احمد
جزری قدس الله سره العزیز من برکات نفحاته الانسیه تاریخ روز
مبارک روز عید المؤمنین و حج المسکین جمعه ده هم ماه ذالحجه
در سنه هزار و صد و سی و یک از هجرة نبوی علیه
افضل الصلوات و اکمل التحیة و السلام
بر دست حقیر التقصیر محمد طیار ابن اسمعیل پاشا
العباسی اصلا و العمادی وطنا
لطف الله به و بهما و ادخلهما
فی الجنة انه کریم

بەرپەڕێ دویماهیییێ ژ دەسنڤیسا محەمەد طەیار پاشایێ میرێ ئامێدیییێ

شعرەکا جزیری وەکی د دەسنڤیسا سەیفییێ شۆشی دا هاتی
ئەوا ل سالا ١١٩٥ مشەختی ١٧٨٩ زایینی هاتیە نڤیسین



بسم الله الرحمن الرحیم

نوایا مطربی چنگی فغان آفیته خرچنگی — وره ساقی حتی کنگی نشو پین دژ فی زنگی

حیاتا دل میا باقی بنوشین دبشتاقی — الا یا ایها الساقی أدر كأسا وناولها

كو كاتب دبیم جدول كت شكسته خط مسلسل كت زیك حرفان مفصل كت گلیه فی مشكلی حلكت

دزانین رود و عود اول چ نافیته سرود دل — كه عشق آسان نمود اول ولی افتاد مشكلها

ژ مهرا وی شفق سعد شریعه لعل لشكر — دنالم شبهاتی رعدی عجیبم ژ فجعه لامی

كه دل را تاب هر چیشك بكفوی می نبود دیشی — ز تاب جعد مشكینش چه خون افتاد در دلها

دفی طاقی دفی خانی عیش و آین كالی — كسی دست دت ز دور الی نها لكذ وقف گلستانی

دراغوش

بەرپەڕێ ئێكێ ژ دەسنڤیسا ( عمر بن أسعد ) ی ئەوا
ل سالا ۱۳۵۷ مشەختی ۱۹۳۷ زاییینی هاتیە نڤیسین

تمت الديوان الجزري المجدد بمنكب الاسود

على يد احقر العباد المذنب

وافقرهم

اعني به مصطفى بن

ملا محمد رشيد بن حجي مصطفى بن ملا داية

بن شيخ يوسف الزاخولي وطنا والعباسي نسبا

والنقشبندي طريقا الملقبا غفر الله له ولوالديه ولنسـ

بەرپەڕێ دویماهیییێ ژ دەسنڤیسا مەلا مصطەفایێ یووسفی
ل سالا ١٣٥٧ مشەختی ١٩٣٧ زایینی هاتیە نڤیسین

اللهم يا معين اعني على الاتمام والصواب

بسم الله الرحمن الرحيم وبه نستعين الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على خير خلقه سيدنا محمد وعلى آله وصحبه اجمعين اما بعد فهذا

بەرپەڕێ ئێکێ ژ دەسنڤیسا مەلا عەبدسسەلامێ جزیری

ئەوا بەری سالا ١٣٧١ مشەختی ١٩٥٢ زایینی هاتیە نڤیسین



وقد وقع الفراغ من تسويد هذا الديوان المنسوب الى قدوة الفضلاء وزبدة الأد
وباء الجامع بين علم الظاهر والباطن العارف بالله الظاهر والباطن الفاني في محبته
الباقي في عين لطفه ومرحمة الملك الملا احمد الجزري قدس سره على ايادي
الحقير دز العيوب المعترف بالخطايا والذنوب

بەرپەڕێ دویماهیییێ ژ دەسنڤیسا مەلا طاهایێ کۆڤلی ئەوا
ل سالا ١٣٦٩ مشەختی ١٩٤٩ زایینی ل بەر دانەیا شێخ طاهرێ شۆشی نڤیسی

بەرپەڕێ دویماهییێ ژ دەسنڤیسا ئیسماعیل کوڕێ محمد طەیار پاشایێ ئامێدی
ئەوا ل سالا ١٢٦٠ مشەختی هاتیە نڤیسین

بەرپەڕێ دویماهییێ ژ دەسنڤیسا ئامەد
ئەوا ل سالا ٨٦ رۆمی هاتیە نڤیسین

# بەرهەمێ
# تەحسین دۆسکی

**أ ـ ب زمانێ عەرەبی :**

١- الحافظ العراقي وأثره في علم الحديث ، الرياض ١٩٩٢.

٢- المدخل لدراسة الأدب الكردي ، ( جزءان ) ، اسطنبول ١٩٩٣.

٣- اعتقاد أهل السنة والجماعة للشيخ عدي بن مسافر ( تحقيق ، بالاشتراک مع حمدي عبد المجيد السلفي ) المدينة المنورة ١٩٩٨.

٤- مختارات من أغنية الثلج والنار ( بالاشتراک مع محمد أمين الدوسكي ) دهوک ١٩٩٩.

٥- تاريخ ماردين للشيخ عبد السلام المارديني ( تحقيق ، بالاشتراک مع حمدي عبد المجيد السلفي ) دهوک ٢٠٠٢.

٦- مذكرات الجاسوس الإنكليزى همفر في الميزان ، ( مع مالک بن حسين ) دهوک ٢٠٠٢.

٧- شرح ديوان الشيخ الجزرى للملا عبد السلام الجزري ( ضبط وتعليق )٢٠٠٤.

٨- حول نسب الشيخ عدي بن مسافر ومعتقده (بالاشتراک مع حمدي عبد المجيد السلفي) دهوک ٢٠٠٤.

٩- جواهر المعاني فى شرح ديوان أحمد الخاني، دهوک ٢٠٠٥.

١٠- تاريخ الأنساب، للأمير صالح بگ الشيرواني، تحقيق، دهوک ٢٠٠٥، الطبعة الثانية بيروت ٢٠٠٧.

١١- الحياة السياسية في كردستان، تأليف علي تتر، ترجمة من الكردية إلى العربية، دهوک ٢٠٠٧.

١٢- معجم شعراء الكرد، (بالاشتراك مع حمدي عبد المجيد السلفي) دهوك، ٢٠٠٨.

١٣- عقد الجمان في تراجم العلماء والأدباء الكرد والمنسوبين إلى مدن وقرى كردستان، (بالاشتراك مع حمدي عبد المجيد السلفى) الشارقة الإمارات، ٢٠٠٨.

١٤- الرد على الرافضة واليزيدية المخالفين للملة الإسلامية المحمدية، لأبي عبد الله بن شبل، (تحقيق ، بالاشتراك مع حمدي عبد المجيد السلفى) تحت الطبع.

**ب ـ ب زمانێ كوردى :**

١٥- مـەلايـێ باتـەيى وبەرهەمێ وى ( د گەل محسن دۆسكى ) دهۆک ١٩٩٦، چاپا دووێ ٢٠٠٥ .

١٦- ئيخوان د تەرازيێ دا ، دهۆک ١٩٩٦، هەڤلێر ١٩٩٩ .

١٧- ئەلندا مە ( ديوانا شعرێيە ) دهۆک ١٩٩٨، چاپا دووێ ٢٠٠٤.

١٨- مەلا عەليێ بەرۆشكى وبەرهەمێ وى ، دهۆک ١٩٩٩ .

١٩- سەيفيێ شۆشى وبەرهەمێ وى ( د گەل محسن دۆسكى ) دهۆک ١٩٩٩ .

٢٠- ديوانا سەردائيێ وانى ، دهۆک ١٩٩٩ .

٢١- واقعێ ئيسلامى چاوا چارەسەر بكەين ؟ دهۆک ٢٠٠٠ .

٢٢- ديوانا مەلايێ جزيرى ( بەرهەڤكرن وڤەوژارتن ) دهۆک ٢٠٠٠، چاپا دووێ ٢٠٠٥.

٢٣- ژياننامەيا پێغەمبەرێ خودێ ، دهۆک ٢٠٠٢، چاپا دووێ تەهران ٢٠٠٨.

٢٤- د گەل مرۆڤێن خودێ ، دهۆک ٢٠٠٢ ، چاپا دووێ ٢٠١٠.

٢٥- چل حەديسێن ئيمامێ نەوەوى ، دهۆک ٢٠٠٢ .

٢٦- ئيمام موحەممەدێ كورێ عەبدلوەهابى وچەند نڤيسينەكێن وى ، دهۆک ٢٠٠٢ .

٢٧- سەرهاتيێن پێغەمبەران ومللەتێن بۆرين، ( سێ بەرگە ) دهۆک ٢٠٠٢ ، چاپا دووێ ٢٠٠٦، چاپا سييێ ٢٠١٠.

٢٨- تەفسيرا قورئانا پيرۆز ( وەرگێرِانە ) دهۆک ٢٠٠٤، چاپا دووێ تەهران ٢٠٠٨.

٢٩- کورێ من ئەڤەیە دینێ تە ، دهۆک ٢٠٠٤ .

٣٠- یووسف وزلەیخا یا سەلیمێ هیزانی، ( بەرهەڤکرن وڤەوژارتن ) دهۆک ٢٠٠٤ .

٣١- لەیلا ومەجنوون یا حارثێ بدلیسی، ( بەرهەڤکرن وڤەوژارتن ) دهۆک ٢٠٠٤ .

٣٢- ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ل سەدسالا نۆزدێ وبیستێ زایینی، هەولێر ٢٠٠٤ .

٣٣- دیوانا گازیا بەلەنگازا یا مەلا بەشیرێ بەدەوی ( بەرهەڤکرن )، دهۆک ٢٠٠٤ .

٣٤- دیوانا داهی یا مەلا نەذیرێ بەدەوی ( بەرهەڤکرن ) دهۆک ٢٠٠٤.

٣٥- مرۆڤێ بەری دیرۆکێ، وەرگێڕانە ژ عەرەبی بۆ کوردی، دهۆک ٢٠٠٤.

٣٦- مەم وزینا ئەحمەدێ خانی، ( بەرهەڤکرن ) دهۆک ٢٠٠٥.

٣٧- ڕۆژی وپەیاما رەمەزانێ، دهۆک ٢٠٠٥.

٣٨- باوەریا تەوحیدێ، یا دکتۆر صالح الفوزان، (وەرگێڕانە) دهۆک ٢٠٠٥، چاپا دووێ ٢٠٠٩.

٣٩- ژن ل بەر سیبەرا ئیسلامێ، دهۆک ٢٠٠٥.

٤٠- دیوانا هادی، (بەهەڤکرن) دهۆک ٢٠٠٧.

٤١- دیوانا بەرتۆ بەگێ هەکاری، (بەرهەڤکرن) دهۆک ٢٠٠٦.

٤٢- چاوا دێ بیە مرۆڤەکێ دلشاد، یا دکتۆر عائض القرنی، وەرگێڕانە، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٣- ژ سالۆخەتێن خوداپەرێسان، یا عومەر تەلمەسانی، وەرگێڕانە، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٤- جەهنەم وارێ پەشێمانان، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٥- فەرهەنگا گۆتن وکریارێن نەدورست، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٦- جیهانا خەونان، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٧- مرن وژینا بەرزەخێ، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٨- ل بەر سیبەرا خودێ، دهۆک ٢٠٠٦.

٤٩- د گەل پێغەمبەرێ خۆشتڤی، دهۆک ٢٠٠٦.

٥٠- قورئان وسوننەت وزانینا نوی، دهۆک ٢٠٠٤، چاپا دووێ ٢٠٠٦.

٥١- ژ پیشەنگێن پەخشانا کوردی خەلیفە یووسفێ بایەزیدی، دهۆک ٢٠٠٧.

٥٢- مەم وزینا ئەحمەدێ خانی، دانەیا عەزیزێ مامزێدی ( بەرهەڤکرن ) دهۆک ٢٠٠٨.

٥٣- مەلایێ جزیری شاعرێ کوردان یێ مەزن، بۆ زارۆکان، دهۆک ٢٠٠٨.

٥٤- رێبازا ژیانێ ل بەر سیبەرا قورئانێ، تەفسیرا قورئانێیە ٢٠٠٩.

٥٥- زڤرین بەر ب خودێ ڤە، دهۆک ٢٠٠٩.

٥٦- ڤەوژارتنا دلان، دهۆک ٢٠٠٩.

٥٧- گەشتەک بۆ نک خودێ، رۆمانا دکتۆر نەجیب گەیلانی، وەرگێرانە ٢٠٠٩.

٥٨- دیوانا سەید قەدری یێ جزیری ، ( بەرهەڤکرنە ) ، دهۆک ٢٠٠٩.

٥٩- باشترین سەرهاتی ، دهۆک ٢٠١٠.

٦٠- دو فەرهەنگێن ڤەهاندی نووبارا الأطفال یا کەربەلائی، (بەرهەڤکرنە)، دهۆک ٢٠١٠.

٦١- دو ڤەهینۆکێن کرمانجی د علمێ تەجویدێ دا ، یا مەلا خەلیلێ سێرتی ومەلا محەمەد هادی یێ لجی ، (بەرهەڤکرنە) ، دهۆک ٢٠١٠.

٦٢- دیوانا نەفعی، (ساخکرن وبەرهەڤکرن) د گەل مەسعوود گولی، دهۆک ٢٠١٠.

٦٣- بێ ئیفلەحیا گونەهێ، یا د. عبد الله السدحان، (وەرگێرانە) ، دهۆک ٢٠١١.

٦٤- بێدەرا خەمان ، کۆمەکا چیرۆکێن وەرگێراینە ژ عەرەبی، هەولێر ٢٠١١.

٦٥- گازی وگازیکەر د چل حەدیسێن پێغەمبەری دا سلاڤ لێ بن، یا علی الحلبی، وەرگێرانە، هەولێر ٢٠١١.

٦٦- پێخەمەت مالەکا بێ گرفتاری، هەولێر ٢٠١١.

٦٧- نڤێژ ستوینا ئیسلامێ، هەولێر ٢٠١١.

٦٨- چیرۆک ودیرۆک، هەولێر ٢٠١١.

٦٩- شیرەتێن پێغەمبەری سلاڤ لێ بن بۆ هەڤالێ وی ئەبوو ذەرری، هەولێر ٢٠١١.

٧٠- عەقیدەنامەیێن کرمانجی، هەولێر ٢٠١١.

٧١- د گەل صەحابییێن پێغەمبەری سلاڤ لێ بن، دهۆک ٢٠١١.

٧٢- کافرکرن د ناڤبەرا دوهی وئەڤرۆ دا، وچەند نڤیسینەکێن دی، دهۆک ٢٠١١.

٧٣- چل حەدیسێن نەوەوی، وەرگێڕان وشرۆڤەکرن، دهۆک ٢٠١١.

٧٤- پارچەیەک ژ دیوانا لاغەری، بەرهەڤکرن، د گەل حوسێن شەمرەخی، ٢٠١١.

٧٥- ڤەهینۆکا (روض النعیم) یا شێخ عەبدررەحمانێ ئاقتەپی، بەرهەڤکرن دهۆک ٢٠١١.

٧٦- مەلا عەبدللاهێ هیزانی وشاعرێن مالباتا وی، دهۆک ٢٠١١.

# ناڤەرۆک

**قافییا (هـ)**



**قافییا (و)**